





# ڕۆژی دوایی

# ٣

# بەهەشت و دۆزەخ

وەرگێڕانی

ژیوانی گەلالی

بڵاوکراوەکانی نوسینگەی تەفسیر - هەولێر

**مەبەست لە :**

# زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی

١. دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردی‌یە بە گرنگترین وکاریگەرترین دەقی ئەو کتێبانەی کە مەشخەڵی سەرڕێی هزری هاوچەرخی ئیسلامین.

٢. ئاشناکردنی خوێنەرو لاوی موسوڵمانی کوردە بە دەقی ئەو کتێبانەی کە سەرچاوەن بۆ رۆشنبیری ئیسلامیی‌و سازێنەری بێداری‌و رابونی ئیسلامیی پیرۆزن.

٣. شارەزاکردنی راستەوخۆی لاوی کورد بەم سەرچاوانە، ئازادکردنیانە لە گشت کۆت وبەندو بۆچونی تەسکی حزبایەتی‌و تاکڕەوی‌و رەوتگەرایی.

٤. بناغەیەك بێ بۆ بنیادنانی کەسایەتیەکی ئیسلامی بەهێز بۆ هەر تاکێکی موسوڵمانی کورد تا توانای ئەنجامدانی ئەو گۆڕانکاریانەی هەبێ کە خودای پەروەردگار پێی سپاردوە.

دەگەڵ رێزو تەقدیرمان بۆ بیروڕای نوسەرانی ئەم زنجیرەیە، مەرجیش نیە ئێمە پابەندی هەمو بیروبۆچونەکانیان بین.

با دەستوریشمان لەوەرگرتن فەرمایشتەکەی خودای پەروەردگار بێت.

﴿ الذّينَ يَستَمعونَ القَولَ فَيَتبَعونَ أَحسَنَهُ؛ أولئكَ الذّينَ هَداهُمْ الله وَأولئكَ هُمْ أولُوا الألباب ﴾ الزمر- ١٨

نوسینگەی تەفسیر



بیروباوەڕ لەبەر ڕۆشنایی
قورئان و سوننەتدا

## ڕۆژی دوایی

## ٣

# بەهەشت و دۆزەخ

نوسینی
دکتۆر عومەر سلیمان ئەشقەر

وەرگێڕانی
ژیوانی گەلالی

پێداچوونەوەی
نەوا محمد سعید

زنجیرەی: بیروباوەڕ لەبەر رۆشنایی قورئان و سوننەتدا

ناوی کتێب بە عارەبی: الجنه والنار

ناوی نوسەر: دکتۆر عومەر سلێمان ئەشقەر

نۆرەی چاپ: سێیەم

ساڵی چاپ: ١٤٠٥ك - ١٩٨٥ز

ناوی کتێب بەکوردی: بەهەشت و دۆزەخ

ناوی وەرگێڕ: ژیوانی گەلاڵی

پێداچونەوەی وەرگێڕان: نەوا محمد سعید

ئەرکی چاپ: پرۆژەی وەرگێڕان

پیتچنین: نوسینگەی تەفسیر بۆ کۆمپیوتەر

نۆرەی چاپ: یەکەم

ساڵی چاپ: ١٤٢٢ك ٢٠٠١ز

چاپکردن: ئۆفسێتی هەولێر

تیراژ: ١٥٠٠

ژمارەی سپاردن: ٥٤ ساڵی ٢٠٠٠

# پێشەکی وەرگێڕان

بیروباوەڕی ئیسلامی بناغەی ئاینی ئیسلامی پیرۆزە، تا بەهێزتر بێ موسڵمانێتی بەرهەمدارترو بەرهەمی بەپیزترو پێزی فرەوانتر دەبێ.

بیروباوەڕی ئیسلامی بو کە گەورەترین وەرچەرخانی بێوێنەی خستە مێژوی مرۆڤایەتی، مرۆڤایەتی لە نشێوی‌و داڕوخان و وێرانی رزگار کرد، رەوشی ستەمئامێزی تارومار کرد، دەستی رەشی زۆردارانی بڕی، کۆیلەو چەوساوانی رەهاکرد، باڵی بەزەیی‌و دادگەری بەسەر جیهاندا راهێڵاو سەرجەم گەل و توێژی خەڵکی لەبەر سێبەرە فێنك و ئارامەکەی هەسایەوە، ئاگری خراپەکاری‌و کوشت وبڕو تالاّن و بڕۆ و بەرهەڵدایی‌و بێئابڕویی کوژایەوە، روحی مرۆڤپەروەری‌و رێزی مرۆڤ ژیایەوە.

گەشانەوەی گوڵی چاکەکاری‌و خۆشی‌و دادو رێزو هێمنی‌و خۆشگوزەرانی‌و ئازادی‌و سەربەستی بەهۆی بیروباوەڕی ئیسلامییەوە دێتەدی، بەڵام تەقینەوەی بورکانی وێرانی‌و خراپەکاری‌و ناخۆشی‌و ستەم و بێهودەیی‌و نیگەرانی‌و تاڵگەردی‌و ژێر دەستەیی‌و کۆیلایەتیش بەهۆی بیروباوەڕی نائیسلامییەوە بەرپادەبێ، چونکە هەموویان لەسەرچاوەی هەواو هەوەس و ئاوەزی بەرژەوەندی‌ناسی و هزری کاریگەر بەدەوروبەرێکی دیاریکراو دێنەکایەوە.

بیروباوەڕ ئەگەر ئیسلامی نەبێ وێرانەو وێرانی دەنێتەوە ئەگەرچی بانگەشەی بنیات نان و چاکسازیش بکات. مێژو لەم وێرانکاریانە سیخناخ بوە کە هەرجارەی بیروباوەڕێکی قرپۆك پەیدابوەو مرۆڤایەتی کردۆتە قوربانی، ئەدی بیروباوەڕە سەفسەطیەکەی نەسرانیەکان نەبو کەبەر لەئیسلام و تاکو ئێستاش کێشەیانە ئاخۆ

(مەسیح) خوایە یان مرۆڤ! هەزاران هەزار مرۆڤی کردە قوربانیو سەدان شەڕو کوشتاری درێژخایەنی نایەوە؟!، ئەدی بیروباوەڕی ئەستێرەناسی گەندەڵی فیرعەونەکان نەبو کە هەزاران هەزار رەش و روت و هەژاری کردە کۆیلەو بەبێگاری گاشەبەردە زلەکانی ئەهراماتی پێ دەگواستنەوە؟!، ئەدی بیروباوەڕی شوفێنیزمی ئەوروپا نەبو کە دوجەنگی گەورەی جیهانی بەرپاکرد و بەملیۆنان مرۆڤیان کرد بە قوربانی؟!، ئەدی هەر بیروباوەڕە شەیتانیەکان نیە کە وای کردوە هەمو رۆژێ بۆمبای ئەتۆمیو هایدرۆجینیو نیوترۆنی بۆ وێرانکردنی مرۆڤایەتیو زەوی وەبەرهەم بێ؟!

چاك سازانەوەی رەوشی مرۆڤایەتی، رەوینەوەی ترسی وێرانی، گەڕانەوەی خۆشیو ئارامی، بەرپاکردنەوەی دادگەری لەسەرتاسەری جیهاندا؛ بەهۆی بزاڤێکەوە دەبێ کە لەسەر بیروباوەڕێکی پاك و بێگەرد دامەزرا بێو لەقورئان و سوننەت هەڵێنجرا بێ، ئەگەر نا هەر وێرانی لەناو وێرانی بەرپادەبێو مرۆڤایەتی وێرانتر دەبێ.

بیروباوەڕی ئیسلامی کاریگەرێکی قوڵ و گەورەی لەخۆ گرتوە، کاریگەرێکی ئەوتۆ کە ئەگەر مرۆڤ هەرچەندی تاوانکارو دڵڕەق و بێبەزەییو وێرانکاریش بێ، سەرلەبەری کیانی ئەم مرۆڤە دەگۆڕێت، گۆڕانێك هەمو لایەنەکانی بگرێتەوە، چونکە بیروباوەڕی ئیسلامی چارەسەرو ئامۆژەکانی بۆ رەگ و ریشاڵی مرۆڤە، هزرو ناوەزو دەرونی رێك دەخاتەوەو تەپ و تۆزی شەیتان و هەوەس و خۆپەرستی لەسەر دەرونی لادەدات و پاکی دەکاتەوە، ئەمجار رێوشوێنێکی راستاڵی بۆ رادەنوێنێو پێی دەڵێ فەرمو ئەمەش ژیانی خۆشبەخت و بێوێنەو نمونەیی.

هەر نوسەرێکی موسڵمان لەهەر دەرگایەکەوە چوبێتە نێو ئەم بیروباوەڕەوە یان لەهەر گۆشە نیگایەکەوە تێی روانیبێو خزمەتێکی پێشکەش کردبێ و متمانەی بەسەرچاوەی بێگەردو دور لە خورافات و شتی بێهودە کردبێ، هەڵبەت کارێکی

گەورەی ئەنجام داوەو خزمەتەکەی بەشێکە لەم رزگاربونە سەرتاسەریەی کە مرۆڤایەتی دەمێکە بۆی عەودالە. دیارە ئەم زنجیرەیەی کە دکتۆر عومەر سلێمان ئەشقەر نوسیویەتیو ناوی ناوە ((العقیدة في ضوء الکتاب والسنة)) بەشداربون و خزمەتێکی گەورەی ئەم مەیدانەیە، کە متمانەی کردۆتە سەرچاوەو ژێدەرە رەسەنەکانی بیروباوەڕو بیروباوەڕە پوکەڵ و لاڕێو ناتەواوەکانی لێ داوەشاندوەو پاك و پوختەکەی راگەیاندوە. کە هەڵبەت ئەمە خاڵی هەرە سەرەکیە لەرانواندنی بیروباوەڕی ئیسلامیدا، ئوسلوبێکی سادەو رێك و پێك و زانستیانەی بەکارهێناوە بەتایبەتی لەپەرتوکەکانی دواییدا، ناوەڕۆکی پەرتوکەکەش پڕ ئایەت و فەرمودەو دەقی زانا بەرزەکانی هێناوەتەوەو لەبەرتیشکی ئەم دەقانەوە بیروباوەڕەکەی رۆشن کردۆتەوە، ئەم زنجیرەیە کە بڵاوبۆوە موسڵمانان بەگەرمی پێشوازیان لێکردو گەلێ زاناو نوسەریش لە نوسراوەکانیاندا ئاماژەیان بۆ کردوە تا موسڵمانان بەهرەی لێوەرگرن. لەناو موسڵمانانی کوردیش سەیر دەکەین چەندین نۆرە چاپی لێ دەردەکرایەوە، کە ئەمەش بەڵگەیە بۆ چاکیو سودی ئەم زنجیرەیە، بەم پێودانگە پێمان وایە وەرگێرانی ئەم زنجیرەیە گەلێك پێویست بو بۆ رابونی ئیسلامی لەکوردستان، تا گەلی کوردیش لەبیروباوەڕە سازگارەکەی خۆی حاڵی بێت و لاڕێ نەبێ، لەبەر گرنگیو لەبەر چاکیو بەهرەی ئەم زنجیرەیە، پشت بەخوا بڕیارمان دا وەریگێڕینە سەر زمانی کوردی، لەوەرگێڕانەکەدا هەوڵمان داوە ئاستێکی زمانەوانی باشی پێبدەین و ئیشکالات بۆ خوێنەر بەجێنەهێڵین، وا بەرهەمەکان لەبەردیدی خوێنەرانەو ئەوان دەتوانن وەرگێڕانەکە هەڵسەنگێنن، لەخوا داواکارین لەکارەکەماندا سەرکەوتوبین و توانیبمان خزمەتێك بەم رابونە پیرۆزەی کوردستان بکەین، خوا پاداشتی بەرهەراوی خۆی بەئێمەو ئێوەش ببەخشێ.

ژیوانی گەلالی ئارامی گەلالی

# پێشەکی

ستایش بۆ ئەو خودایەی بەهەشت و دۆزەخی بەدیهێناون و بۆ هەر یەکە خەڵك و هاوەڵێکی بەدیهێناوە. بەهەشتی کردۆتە خانەی دۆستانی و، دۆزەخیش خانەی دوژمنانی. درودو سڵاویش پێشکەش بە دوایینی پێغەمبەرانی و شکۆدارترین بەدیهێنراوانی. کە وەك بانگخوازێکی بەهەشتێ هاتوەو، بۆ خۆشیو نازو نیعمەتی ئارەزوانی بزواندوەو، لە دۆزەخ و ئەشکەنجەکەی مرۆڤگەلی ترساندوە.

دیسان درودو سڵاوم بۆ خانەوادەی پێغەمبەرو هاوەڵان و شوێنکەوتە چاکەکانی دەنێرم. کە خۆیان بۆ وی سازداوەو، توێشویان لە هەگبە ناوە، شەوانە وەئاگابون و بە نوێژکردن خەریك بون، لێخۆشبونیان لێ‌خواستوەو موناجاتی خودای مەزنیان کردوە، وقورئانیشیان وەخوێندوەو بەدرێژایی رۆژگارانیش سورێنچکیان وشك کردوەو بەرۆژو بون. تا لە خوا نزیك کەونەوە، لەبەر ئەوەی زانیویانە مەسەلەکە راستیەو نە هی گەمانە، بەندەش لە ئاگر رزگاری نابێ وبەپایەی بەهەشت هەڵناچێ. هەتا قۆڵ و باسکی بەراستی هەڵنەکاو ماندوبونێ دانەپاچێ.

بەرێزانم:

ئەم کتێبە سێیەم بەشی رۆژی دوایە، کە لەم باسە کۆتاییەدا باسی بەهەشت و دۆزەخە.

ئەم بەشەشمان بۆ دو دەروازان دابەش کردوە:

دەروازەی یەکەم باسی دۆزەخە، ئەو دەروازەیە بە دە بەندان تەواو بوەو رێخۆشەکی پێشکەوتوە.

رێخۆشەکیش ناساندنی دۆزەخیە.

بەندی یەکەم/ بەڵگەی ئەوەی تێ هاتوە کە ئاقیدەی ئەهلی سونەت و جەماعەت

وایە، بەهەشتو دۆزەخ دو بەدیهێنراونو، لەوێ وەلامی ئەوان کۆمەلان دەدەمەوە کە پێچەوانەی ئەمەیان هەڵبەستاوە.

بەند ی دوەم/ باسی ئاگرەوانەکانە. کە ئەو فریشتە بەرزانەن بە کاروباری دۆزەخێ هەڵدەستن، لەگەڵ ژمارەو گەورەیی بەدیهێنانیان.

بەندی سێیەم/ باسی دۆزەخە، لەوێ باسی جێگەکەیو فراوانیو چینەکانیو دەروازەکانیو، سوتەمەنی، تینی گەرمیو، ئاخاوتنیو، سیفەتی بەدیهێنانیو، کاریگەری بەسەر دنیاو خەڵکی دنیادا کراوە.

بەندی چارەم/ ئەو بەڵگانەی تێدا هاتون کە دەسەلمێنن: دۆزەخ هەمیشەییەو تونا نابێ، لەوێش وەلامی ئەوانەمان داوەتەوە کە وایان هەڵبەستاوە تونا دەبێ و لە نێو دەچێ.

لە بەندی پێنجەمیشدا باسی دۆزەخییان کراوە، کە دو کۆمەڵن: کۆمەڵێك هەمیشەن تێیدا. کە بێبڕواو موشریکانن. کۆمەڵێکیش یەکجاری نین، کە یاخی یەکخواپەرستانن. باسی هەردو کۆمەلانیشمان کردوە، لەگەڵ هەندێك لەو تاوانانەیان کە شایستەی ئەوێی کردون.

لە بەندی شەشەمیش باسی زۆری خەڵکی دۆزەخ کراوە، ئەو بەڵگانەشمان هاوردون کە زۆری گیرۆدەبوانی ئاگری دۆزەخ دەردەخەن، لەگەڵ کەمی رزگار بوانو نهێنیو رازی ئەم بارە. هەر لەم بەندەش سۆراخێك هەیە باسی ئافرەتانی تێدا کراوە کە زۆرینەی دۆزەخیانن‌و رونکردنەوەی هۆی ئەو زۆریەیان.

بەندی حەفتەم/ باسی زەبەلاحی دۆزەخنشینانی تێدا کراوە.

بەندی هەشتەم/ تایبەتە بە باسی خواردنو خواردنەوەی دۆزەخیان.

بەندی نۆیەم/ زۆر بە درێژی باسی ئەشکەنجەی دۆزەخییانی تێدا کراوەو چەندین نمونەو وێنەی ئەو ئەشکەنجانەم هێناوەتەوە. هەروەك رونم کردۆتەوە کە خەڵکی

دۆزەخ لـە رادەی ئەشـکەنجەکانیان جـودان. پاشـان باسـی هـەندێك جـۆری ئـەو ئەشـکەنجانەم کـردوە کـە خـودا بـۆی ئامـادە کـردون، لەوانـەش: تاواندنـەوەو، داخکـردن و، راکێشان و، روڕەشـکردن و، پێسـت برژانـدن و، هـەڵڕژانی ڕیخۆڵـەکان و، سەرکردنی ئاگر بەسەر دڵانیاندا، هەروەك ئەو دەقانەشم هێناون کە باس لە کۆت و زنجیرو چەکوشەکان دەکەن کە پێی ئەشکەنجە دەدرێن.

دەیەم بەندیش کە دواهەمینە؛ باسی ئەو ڕێگایانەم تێدا کردوە کە بەندە خۆی پێ لە دۆزەخ دەپارێزێ.

دەروازەی دوەمیش بۆ باسی بەهەشت تایبەتـەو، هـەفت بـەندی لـە خـۆ گرتـوە. ڕێخۆشەکی وەپێش هەر هەفتان کەوتوەو کە بۆ ناساندنی بەهەشت هاتوە.

بەندی یەکەم/ باسی چونـە بـۆ بەهەشـتێ. لـەوێ دیمـەنی چونـی بـڕوادارانم بـۆ بەهەشـت خسـتۆتە بـەرچاو، لەگـەڵ تکاکـاریی پێغەمبـەرﷺ بـۆ بـڕواداران تـا بچنـە بەهەشت و. چۆن بڕواداران پاش مشتوماڵ و پاڵاوتنیان دەچنە بەهەشت. هەر لەوێ باسـی یەکەمینی بـڕوادارانم کـردوە کـە دەچنـە بەهەشـت، لەگـەڵ باسـی ئـەو هـەفتا هەزارەی ئەم ئوممەتە، کە بەبێ لێپرسینەوە دەچنە بەهەشت. هەروەها باسـی ئـەوەم کـردوە کـە هـەژارانی کۆچـەران پێش دەوڵەمـەندانیان دەکـەون لە چونـە بەهەشـت. لـە سۆراخێکی درێژیشدا ئەوەم رونکردۆتەوە کە ئەو یەکخواپەرستە یاخییانەی دەچنە دۆزەخ بە میهری میهرەبانترینی میهرەبانان و تکای تکاکاران لێی دێنە دەر. هـەروەها بۆچون و رای ئەهلی سونەتیشم لـە بابـەت ئـەم تکاکاریـەوە رونکردۆتـەوەو، وەڵامـی ئەوانم داوەتەوە کە رەتی دەکەنەوەو نکۆڵیان لێ کردوە. ئەم بەندەشم بە دو سۆراخ بـا کۆتا هێناوە؛ یەکەم لـە بـارەی دوامین کەسێ دەچێتە بەهەشت؛ دوەمیش دەربارەی ئەوی پێش قیامەت چۆتە بەهەشت.

لـە بـەندی دوەمیـش بەڵگـەی ئـەوەم هێناوەتـەوە کـە بەهەشـت هەمیشـەیەو

بەهەشتنشینان نەمرن، وەڵامی ئەوانەشی تێدا دراوەتەوە کە پێچەوانەی ئەمەیان هەڵبەستاوە.

بەندی سێیەمیش باسی بەهەشتە، لەوێ باسی گەورەیی نازونیعمەتو بەرفرەیی بەهەشتم کردوە، لەگەڵ باسی دەروازەکانیو، پلەو پایەکانیو، خۆڵەکەیو، روبارەکانیو، کانیاوەکانیو، کۆشکەکانیو، روناهیەکەیو، بایەکەیو، درەختەکانیو، بەروبومیو، بۆنو بەرامیو، جوڵندەکانی.

بەندی چوارەم/ باسی خەڵکی بەهەشتییە لەگەڵ ئەو کردەوانەی شایستەی بەهەشتی کردون، وە چۆن خەڵکی بەهەشت پشکی دۆزەخییان لە بەهەشتێ بە میرات دەگرن، لەگەڵ باسی ئەوەی کە هەژارو بێدەسەلاتان لە بەهەشتدا لە دەوڵەمەندان پترنو، پیاوان لە ژنان زیاترن، باسی ئەوەشم تۆژیوەتەوە کە زارۆڵە و منداڵی بڕواداران و هاوبەشپەرستان لە بەهەشتن، لەو سۆراخانەی ئەم بەندەش لە خۆی گرتون باسی سەروەرانی ئەهلی بەهەشتن لە پیرەمێردو جحێلو ئافرەتان. لەگەڵ باسی ئەو دەیانەی موژدەی بەهەشتیان دراوەتێ، وباسی هەندێك لەوانەی لە دەقەکاندا راگەیەندراوە کە بەهەشتین، ئەو بەندەشم بەو باسە کۆتایی پێ هێناوە کە بەهەشت بەهای کردەوان نیە، بەڵکو کردەوە هۆکاری چونە بەهەشتەو، وەدەست هێنانی بەهەشتیش هەر بە مێهرو گەورەیی خوداوە دەبێ.

بەندی پێنجەمیش باسی سیفەتی خەڵکی بەهەشتو نازونیعمەتیانە تێیدا.

درێژترین بەندی ئەم دەروازەیەش شەشەم بەندە کە بۆ باسی نیعمەتی بەهەشتنشینانم تەرخان کردوە، لەوێ گەورەییو بەسەردا هەبونی بەرفرەیی بەهەشتم لە ئاست کاڵای دنیایێ رونکردۆتەوە.

باسی ئەوەشم کردوە کە خەڵکی بەهەشتێ چێژ لە خواردنو خواردنەوەی جۆراوجۆر دەکەن، هەروەك باسی رایەخ و خزمەتکاران و باژێرو دەفری خواردنو

خواردنــەوەیان کــراوە. لەگــەڵ باســی پۆشــاك و جـل و بــەرگیان و ئــەو ئاواتانــەی دەیخوازن و بە شێوازێکی سەراسیمەو ناوازە بۆیان دێنە دی کە هاوشێوەی لە دنیادا نیە.

سۆراخێکیشم لەو بەندەدا گرێ داوە بۆ باسی هاوسەرانی بڕوادار لە بەهەشتیدا. جا لە پەریە چاوبەڵەکەکان بن، یا لە ژنانی دنیایان.

هەروەها لەم بەندەدا ئەوەم رونکردۆتەوە کە مەزنترین شتێك لە بەهەشتی بە بڕوادار ببەخشرێ، رەزامەندیو خۆشنودی خودای مەزنە، لەگەڵ روانین بۆ روی بەرێز و شکۆداری، لەو نیعمەتەی لە بەهەشتدا دەیاندرێتێ پاکیکردن و پیرۆزگرتن و گەورەکردنی خودایە.

بەندی هەفتەمیش کە دوا بەندە باسی بەربەرەکانێی نێوان ئاگرو دۆزەخ و حوکمی خودا لە نێوانیان دەکات.

لە خوا دەپاڕێمەوە کەبۆ کردەوەو تاعەتی خۆی سەرمان بخاو، بە منەت و بەخشندەیی لە ئاگر دەربازمان بکاو، بە میهرو گەورەیی خۆی بمانباتە بەهەشتی. هەر خودا بیسەرو وەڵامدەرەو نێزیکە. درودو سڵاویش بۆ موحەممەدی بەندەو پەیامبەری.

عومەر سلیمان ئەشقەر

کویت

١٩ی رەمەزانی ١٤٠٦ك

١٩٨٦/٥/٢٧ز

# دەروازەی یەکەم

# دۆزەخ

ڕێخۆشەکی: پێناسەو ڕونکردنەوە

دۆزەخ بریتیە لەو خانەیەی، خودا بۆ ئەوانەی ئامادە کردوە کە باوەڕیان پێی نیەو، لە شەرعی وی یاخین و، پەیامبەرەکانی بە درۆ دەخەنەوە، هەروەها ئەو ئازارەیە کە دوژمنانی پێ ئەشکەنجە دەداو، ئەو زیندانەیە کە تاوانبارانی تێدا دەئاخنێ و بەند دەکات.

دۆزەخ گەورەترین ڕوزەردیو شەرمەزاریەو، دۆڕانی هەرەمەزنە، ڕوزەردی لەو هەورازترو، زیانمەندی لەو خراپتر هەر نیە.

﴿رَبَّنَا إِنَّكَ مَنْ تُدْخِلِ النَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنْصَارٍ: پەروەردگارا! بەڕاستی هەرکەسێك تۆ بیخەیتە نێو ئاگر، شکاندوتەوەو ڕوزەردت کردوەو، ستەمکارانیش هیچ پاڵپشت و یارمەتیدەرێکیان نیە﴾ آل عمران: ١٩٢.

﴿ أَلَمْ يَعْلَمُوا أَنَّهُ مَنْ يُحَادِدِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَأَنَّ لَهُ نَارَ جَهَنَّمَ خَالِدًا فِيهَا ذَلِكَ الْخِزْيُ الْعَظِيمُ: ئەی نەیانزانی هەرکەسێك لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەی دوژمنایەتی بکا، دوچاری ئاگری دۆزەخ دەبێت و لەوێدا بە نەمری دەمێنێتەوە، ئەمەش نەنگیو ڕیسواییەکی مەزنە﴾ التوبة:٦٣.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿..إِنَّ الْخَاسِرِينَ الَّذِينَ خَسِرُوا أَنْفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَلَا ذَلِكَ هُوَ الْخُسْرَانُ الْمُبِينُ: بەڕاستی زیانباران کەسانێکن، لە ڕۆژی دواییدا خۆیان و خانەوادانیان دەدۆڕێنن. جا دیارە ئەمە زیانێکی دیار و ئاشکرایە﴾ الزمر:١٥.

چۆن دۆزەخ وانابێ لە کاتێکدا هێندەی ئەشکەنجەو ئێش و ژان و، خەمو دڵتەنگیو تاسانی تێدایە، کە خامە لە نوسینی دەستەوسانەو، زمان لە ئاستی

**پەككەوتەیە. لەگەڵ ئەوەش هەمیشەییەو، ئەوانی تێدا نیشتەجێن، بەشیان نەمری و هەرمانە. بۆیەش خودای كاربەجێ، تانەو تەشەر لە پایەو شوێنی دانیشتوانی دۆزەخ دەگرێ** ﴿ إِنَّهَا سَاءَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا: **بەڕاستی دۆزەخ شوێن و نشینگەیەكی خراپە**﴾ الفرقان:٦٦.

﴿ هَذَا وَإِنَّ لِلطَّاغِينَ لَشَرَّ مَآبٍ، جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ الْمِهَادُ: **ئەمەو، یاخیانیش بۆ بەدفەڕترین جێ دەگەڕێنەوە، دۆزەخێكە بۆ سوتان و هەڵقرچان دەچنە نێوی جا چ جێگەو شوێنێكی بەدە**﴾ ص: ٥٥-٥٦.

## بەهەشتو دۆزەخ دو بەدیهێنراون

طەحاوی لە عەقیدە سەلەفیانەکەیدا، کە بەعەقیدەی طەحاوی ناسراوە، دەڵێ: (بەهەشتو دۆزەخ دو بەدیهێنراون، نەتونا دەبنو نە لە نێو دەچن، خودا بەهەشتو دۆزەخی پێش بەدیهێنراوەکان بەدیهێناونو، خەڵکیکیشی بۆ هەردوکان بەدیهێناوە، جا لەوانە: بەویستی خۆی کامەی بوێ، بەمیهری خۆی دەیباتە بەهەشت، ویستی لەسەر کامەشیان بێ، لە دادوەری خۆی دەیباتە دۆزەخ، هەریەکێکیش ئەو کارە ئەنجام دەدات کە بۆی تەرخان کراوە، بەرەو ئەو شوێنە دەچێ کە بۆی بەدیهێنراوە، خێروشەڕیش بۆ بەندان خەملێنراون).

موحەممەدی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەبولعیززی حەنەفی، کە ڕاڤەکاری طەحاویە، لەراڤەی ئەم دەقەدا گوتوویەتی:

(کە دەڵێ: "بەهەشتو دۆزەخ دو بەدیهێنراون"، ئەهلی سونەت کۆکو یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە بەهەشتو دۆزەخ بەدیهێنراونو ئێستاکە هەن. ئەهلی سونەت هەر لەسەر ئەم رایە بون، تا کۆمەڵێك لە موعتەزیلەو قەدەرییان هەڵکەوتنو، ئەمەیان ڕەتکردەوەو، گوتیان: بەڵکو خودا لە رۆژی قیامەت دایاندەمەزرێنێ، ئەو بۆچونەشیان بەهۆی ئەو بنەڕەتە گەندەڵە لەلا دروست بو، کە ڕێکار(شريعة)ێکیان بۆ کردەوەی خودا داناو، گوایە دەبێ وا بکاو، بۆی ناشێ وا بکاو، کردەوەو بەدیهێنانی خودایان بە کردەوەی خۆیان پێوا، چونکە ئەوان لە کردەوان وێچوێنەر بون. پاشان جوهمیەتیشیان تێکەڵ بو، ئەمجارە بونە لەکارخەر، گوتیان: بەدیهێنانی بەهەشت بەر لە پاداشتو سزا، بێهودەییە، چونکە بۆ کاتێکی درێژ پەککەوتەو بێکار دەبێ. بۆیە ئەو دەقانەشیان ڕەتکردەوە کە دەگەڵ ئەو ڕێکارە بەتاڵو ناهەموارەی بۆ پەروەردگاری بەرزیان دانابو نەدەگونجا. هەروەك دەقگەلێکیشیان لە شوێن خۆ ترازاندو، ئەو کەسانەیان بە گومڕاو بیدعەچی دانا کە پێچەوانەو ناکۆك بون لەگەڵ

شەریعەتەکەیان.

ئەوجا ئەو دەقانەی قورئان و سونەتی هێناوەتەوە کە بەڵگەی بەدیهێنراویی بەهەشت و دۆزەخن، (جا لەو دەقانەی قورئانی پیرۆز: خوای مەزن لە بابەت بەهەشت دەفەرموێ:

﴿.. أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ: بۆ پارێزکاران ئامادە کراوە﴾آل عمران:١٣٣.

﴿.. أُعِدَّتْ لِلَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ..: بۆ ئەوانە سازو ئامادە کراوە کە بڕوایان بە خواو پێغەمبەرەکانی هێناوە﴾ الحديد:٢١.

لەبارەی دۆزەخیش دەفەرموێ:

﴿.. أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ: بۆ بێبڕوایان ئامادە کراوە﴾ آل عمران:١٣١.

﴿ إِنَّ جَهَنَّمَ كَانَتْ مِرْصَادًا لِلطَّاغِينَ مَآبًا: بەڕاستی دۆزەخ کەمینگایەو چاوەڕێیەو، جێو نشینگەی یاخیانە﴾ النبأ: ٢١-٢٢.

﴿وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَى عِنْدَ سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى عِنْدَهَا جَنَّةُ الْمَأْوَى: بێگومان جارێکی دیکە جبریلی دیتبو، لەلای سیدرەتولمونتەها، کە بەهەشتی ئارامگا لەوێیە﴾ النجم: ١٣-١٥.

پێغەمبەریش ﷺ سیدرەتولمونتەهای دیت و. لەلای ئەویش بەهەشتی ئارامگای چاوپێکەوت. هەروەك لە کۆتایی چیرۆکی ئیسراءدا هاتوە:

((ثم انطلق بي جبرائيل، حتى أتى سدرة المنتهى، فغشيها ألوان لا أدري ما هي، قال: ثم دخلت الجنة، فإذا هي جنابذ اللؤلؤ، وإذا ترابها المسك: پاشان جبریل بەگەڵم کەوت و بۆ لای سیدرەتولمونتەهای بردم، جا ڕەنگی وەها دایپۆشی نەمزانی چی بون، دەفەرمێ: ئینجا چومە بەهەشت و، دیتم گردۆڵکەی مرواریەو، خاکەکەشی میسکە))[1].

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((إن أحدكم إذا مات عرض عليه مقعده بالغداة والعشي، إن كان من أهل الجنة فمن أهل الجنة، وإن كان من أهل النار فمن أهل النار، يقال: هذا مقعدك حتى يبعثك الله يوم القيامة: ئەگەر یەکێك لە ئێوە مرد، سبەینان و ئێواران نشینگەی خۆی پێ نیشان دەدرێ، ئەگەر بەهەشتی بو ئەوە بەهەشتیەو ئەگەر دۆزەخیش بو ئەوە

---

[1] في الصحيحين من حديث أنس ﷺ.

دۆزەخیـە، پێـی دەگوتـرێ ئەمـە نشـینگەتە تـا لـە ڕۆژی دواییـدا خـوا زینـدوت دەکاتەوە))[1].

لە پێشودا فەرمودەکەی بەرائی کوڕی عازەبیشمان[2] هاورد، کە ئەمەی تێدا هاتبو: ((ینادي مناد من السماء، أن صدق عبدي، فأفرشوه من الجنة، وافتحوا له باباً الى الجنـــة، قـــال: فيأتيه من روحها وطيبها: دەنگێك لە ئاسمانەوە دێ دەڵێ: بەندەی من ڕاستی کرد، جا لە بەهەشتی بۆ ڕاخەن‌و، دەرگەیەکی بەهەشتی لێ بکەنەوە، فەرموی: جا بۆن‌و بەرامی بەهەشتی بۆ دێ)). فەرمودەیـەکی ئەنەسـیش بـە هـەمان واتـای فەرمودەکـەی بـەراء هاتوە.

لـە صـەحیحی موسلیمیشـدا لـە عائیشـە –ڕەزای خـوای لێبـێ– هـاتوە؛ دەڵـێ: لەسەردەمی پێغەمبەردا ڕۆژ گیرا، جا فەرمودەکەی باسکردوە کـە ئەمـەی تێدا هاتوە، پێغەمبەری خواﷺ فەرموی:

((رأيت في مقامي هذا كل شيء وعدتم به، حتى لقد رأيتني آخذ قطفاً من الجنة حين رأيتمـــوني تقدمت. ولقد رأيت النار يحطم بعضها بعضاً حين رأيتموني تـأخرت: لـەو پایـەی خۆمـدا هـەمو ئەو شتانەم دیت کە بەڵێنم بە ئێوە دابو، تا خۆم دیت هێشویەکی بەهەشتم چنی، ئەو کاتی کە دیتتان بەرەو پێش چوم، ئاگریشم دیت هێندێك هێندێکی دا دەڕوخاند، کە دیتتان وەپاش کەوتم)).

عەبدوڵڵای کوڕی عەباس گوتوویەتی[3]: لەسەردەمی پێغەمبەری خودا ﷺ ڕۆژگیرا؛ جا فەرمودەکـەی باسـکرد، کـە ئەمـەی تێـدا هـاتوە: گوتیـان: ئـەی پێغەمبـەری خـوا، دیتمان لە شوێنی خۆتدا شتێکت دەست داییێ، پاشان دەستت بە ڕوی خۆتـەوە نـا؟ فەرموی:

((إني رأيت الجنة، وتناولت عنقوداً، ولو أصبته لأكلتم منه ما بقيت الدنيا، ورأيت النار، فلـــم أر منظراً كاليوم قط أفظع، ورأيت أكثر أهلها النســـــاء: مـن بەهەشـتم دیـت‌و هێشویەکم لێ چنـی. ئەگەر بمهێنابا تـا دنیـا مـاوە ئێوەش لێتـان دەخـوارد، ئاگریشـم دیـت‌و، هیـچ

---

[1] في الصحيحين من حديث إبن عمر ﷺ.

[2] پێشتر لە کتێبی: قیامەتی گەورە هاتۆتەوە.

[3] في الصحيحين، واللفظ للبخاري.

رۆژێك دیمەنێکی هێندی ئەمڕۆ ترسناکم نەدیبو، دیتم زۆربەی دۆزەخی ئافرەتن)).

گوتیان: بەچی، ئەی پێغەمبەری خوا؟

فەرمووی: ((بکفرهن: بە کوفر کردنیان))، گوتیان: بۆ کوفر بە خوا دەکەن؟

فەرمووی: ((یکفرن العشیر، ویکفرن الإحسان، لو أحسنت إلی إحداهن الدهر کلــه، ثم رأت منك شیئاً، قالت: ما رأیت خیراً قط: گوێ نادەنە پێکەوە ژیانی هاوسەریی و، چاکەیان لە چاودا نیە، ئەگەر بە درێژایی رۆژگار چاکەت لەگەڵ یەکێکیان کرد، پاشان شتێکی لێ دیتی، دەڵێ هەرگیز خێرم نەدیوە)).

هەروەها لە صەحیحی موسلیمدا، لە فەرمودەی ئەنەس هاتوە:

((وأیم الذي نفسي بیده، لو رأیتم ما رأیت، لضحکتم قلیلاً وبکیتم کثــیراً: سوێند بەوەی گیانی منی وەدەستە، ئەگەر ئەوەی من دیتم ئێوەش بتاندیتبا؛ کەم پێدەکەنین و زۆر دەگریان))، گوتیان: چیت دیت، ئەی پێغەمبەری خوا؟

فەرمووی: ((رأیت الجنة والنار: بەهەشت و دۆزەخم دیت)).

دیسان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((إنما نسمة المؤمن طیرٌ تعلق في شجر الجنة، حتــی یرجعها الله الی جســده یــوم القیامــة: گیانی بڕوادار باڵندەیەکە بە درەختی بەهەشت هەڵواسراوە، تاکو لە رۆژی قیامەت خودا بۆ جەستەکەی دەگێڕێتەوە))[1]. ئەمەش بەڕاشکاوی ئەوە دەگەیەنێ کە گیان بەر لە رۆژی قیامەت دەچێتە بەهەشت.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: ((لما خلق الله الجنة والنار، أرسل جــبرائیل الی الجنــة، فقال: إذهب فانظر إلیها وإلی ما أعددت لأهلها فیها، فذهب فنظر إلیها وإلی ما أعد الله لأهلــها فیها، فرجع فقال: وعزتك، لا یسمع بها أحد إلا دخلها، فأمر بالجنة، فحفّت بالمکـــاره، فقــال: إرجع فانظر إلیها وإلی ما أعددت لأهلها فیها. قال: فنظر إلیها، ثم رجع فقــال: وعزتــك، لقــد خشیت أن لا یدخلها أحد.

قال ثم أرسله إلی النار، قال: اذهب فانظر إلیها وإلی ما أعددت لأهلها فیها، قال: فنظــر إلیها، فإذا هي یرکب بعضها بعضاً، ثم رجع فقال: وعزتك، لا یدخلها أحد سمع بها، فأمر بهــا فحفّت بالشهوات، ثم قال: إذهب فانظر الی ما أعددت لأهلها فیها، فذهب فنظــر إلیــها،

---

[1] في الموطأ والسنن، من حدیث کعب بن مالك؛ تۆژەری طەحاوی دەڵێ: صەحیحە.

فرجع فقال: وعزتك، لقد خشيت أن لا ينجو منها أحد إلا دخلـــها: كه خودا بهههشت و دۆزهخی وهدیهێنان، جوبرائیلی نارده بهههشتیٚو، فهرموی: بڕۆ سهیری بهههشت و ئهو شتانه بکه که بۆ بهههشتیان تێیدا سازم داوه، ئهویش چو سهیری بهههشتی کردو، لهو شتانهی روانی که خودا له بهههشتیٚ بۆ بهههشتیانی ئاماده کردوه. جا گهڕاوهو گوتی: سوێند به عیززهتی تۆ خودایه، ههر یهکێکی لهبارهی بهههشتیٚ ببیسیٚ دهچێته ناوی. جا خودا فهرمانی به بهههشت دا دهوری به ناخۆشیان تهنرا و، فهرموی: بڕۆ تهماشای بکهو بزانه چیم تێدا بۆ بهههشتیان ئاماده کردوه. دهفهرمویٚ: جا چوو سهیری کرد، پاشان هاتهوهو گوتی: به عیززهتی تۆ، لهوه ترسام کهس نهچێته ناوی.

دهفهرمویٚ: پاشان بۆ دۆزهخی ههنارد، فهرموی: بڕۆ سهیری کهو بزانه بۆ دۆزهخیان چیم تێدا ئاماده کردوه. دهفهرمویٚ: جا تهماشای کرد، دیتی هێندێکی سواری هێندێکی بوه، ئهوجا گهڕاوهو گوتی: به عیززهتی تۆ، ئهوی شتێکی له باره ببیسیٚ ناچێته ناوی. جا خودا فهرمانی به ئاگردا چوار دهوری به ئارهزوان تهنرا، ئینجا فهرموی بڕۆ بزانه چیم بۆ دۆزهخنشینان تێدا سازداوه؟ جا چو سهیری کردو، هاتهوه، گوتی: سوێند به عیززهتت! لهوهی ترسام کهسی لیٚ دهرباز نهبیٚ))[1].

هاوشێوهی ئهو فهرمودانهش له سونهتدا زۆرن[2].

بوخاریش له صهحیحهکهیدا دهروازهیهکی تایبهت کردوهو ناوی ناوه: (دهروازهی ئهو فهرمودانهی له بارهی باسی بهههشت و بهدیهێنراویی هاتون)[3]، جا لهم دهروازهیهدا گهلێك فهرمودهی هاوردون که باس لهوهی دهکهن؛ بهههشت بهدیهێنراوه، لهوانیش ئهو فهرمودهی باس لهوه دهکا پاش ئهوهی مردو له گۆڕ دهنریٚ، خودا نشینگهی خۆی له بهههشت و دۆزهخێدا نیشان دهدا، لهگهڵ فهرمودهی بهسهرکردنهوهی بهههشت و دۆزهخ له لایهن پێغهمبهر ﷺ و دیتنی تهلارهکهی عومهری کوڕی خهطاب لهبهههشتدا و، فهرموده گهلێکی تریش.

---

[1] في صحيح مسلم والسنن والمسند من حديث ابي هريرة.

[2] شرح الطحاوية: ٤٧٦-٤٧٨.

[3] في كتاب بدء الخلق، أنظر فتح الباري: (٦/٣١٧).

ئیبنو حەجەریش چاکی پێکاوە کە گوتویەتی: (راشکاوتریش لەوان فەرمودانی بوخاری باسی کردون، ئەوەیە کە ئەحمەدو ئەبوداود بە سەنەدێکی بەهێز تەخریجیان کردوە، لە ئەبو هورەیرە، لە پێغەمبەر ﷺ کە فەرموی:

((لما خلق الله الجنة، قال لجبريل: "إذهب فانظر إليـها": کاتێك خودا بەهەشتی بەدیهێنا، بە جبریلی فەرمو: بڕۆ تەماشای کە))[1].

## گومانی ئەوانەی دەڵێن هێشتا دۆزەخ بەدی نەهێنراوە

راڤەکاری طەحاوی وتوێـژی لـەبارەی گومـانی ئەوانـە کـردوە کـە دەڵێـن: دۆزەخ هێشتا بەدی نەهێنراوەو، وەڵامیشی داونەتەوەو، گوتویوتی:

(هەرچی گومانی ئەوانەیە کە دەڵێن هێشتا دۆزەخ بەدیـنەهێنراوە، ئەوەیە: ئەگەر ئێستا بەدیهێنرابو، بەناچاری پێویست دەبو لە رۆژی دواییشدا تونا بـێو لـە نێوبچێو، هەمو ئەوانەی تێشیدان بمرن، چونکە خودای بەرز دەفەرموێ:

﴿.. كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلاَّ وَجْهَهُ..: هەمو شتێك تێدەچێ، مەگەر زاتی پاکی خودا نەبێ﴾ القصص:٨٨.

﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ..: هەمو گیانێك تامی مردن دەچێژێ﴾آل عمران: ١٨٥.

پێغەمبەرﷺیش دەفەرمێ: ((لقيت إبراهيم ليلة أسري بي، فقال: يا محمد، أقريء أمتك مني السلام، وأخبرهم أن الجنة طيبة التربة، عذبة الماء، وأنها قيعان، وأن غراسها سبحان الله، والحمد لله، ولا إله إلا الله والله أكبر: لەو شەوی شەوڕۆییم پێ کرا ئیبراهیمم دیتو، گوتی: هۆ موحەممەد، سڵاوی من بە ئوممەتەکەت بگەیەنەو، پێیان بڵێ: بەهەشت خاکەکەی چاکەو ئاوەکەی سازگارە، عەردەکەی دەشتێکی پیتدارەو، رواندن تێیدا بریتیە لە: "سبحان الله، والحمد لله، ولا إله إلا الله والله اكبر"))[2].

هەروەها لە فەرمودەی ئەبو زوبەیردا لە جابیرەوە هاتوە، لە پێغەمبەر ﷺ، کە

---

[1] فتح الباري: (٦/٣٢٠).

[2] رواه الترمذي في جامعه، من حديث إبن مسعود ﷺ؛ قال هذا حديث حسن غريب؛ قال الشيخ ناصر في تعليقه على شرح الطحاوية ص/١٠٦ وهو مخرج في الصحيحين.

دەفەرموێ:

((من قال سبحان الله وبحمده، غرست له نخلة في الجنة: هەروەها دەفەرموێ: کەسێك بڵێ ((سبحان الله وبحمده: پاکی و ستایش تەنها بۆ خودایە))، دارخورمایەکی لە بەهەشتێ بۆ دەچێنرێ))[1].

هەروەها گوتویانە: خۆ ئەگەر بەدیهێنراباو تەواو بوبا، دەشت نەدەبو، ئەم چاندنەش چ مانای نەدەبو، گوتویانە: ئەو فەرمودەیەی خوداش لە بارەی خێزانی فیرعەون هەروایە کە گوتویەتی:

﴿رَبِّ ابْنِ لِي عِنْدَكَ بَيْتًا فِي الْجَنَّةِ..: خودایە، لەلای خۆت، لە بەهەشتێ خانویەکم بۆ بنیات بنێ﴾التحريم:١١.

ئەمەش وەڵام: ئەگەر ئێوە مەبەستتان وایە، کە ئێستا لە جیهانی عەدەمدایە هەروەك فو کردن بە کەڕەناو، هەستانەوەی خەڵك لە گۆڕەکانیان! ئەمە بەتاڵە، ئەو بەڵگانەی پێشو و هی دیکەش کە باسمان نەکردون ئەوە ڕەت دەکەنەوە، خۆ ئەگەر مەبەستیشتان وایە کە هێشتا خودا بەدیهێنانی هەمو ئەو شتانەی تەواو نەکردوە، کە تێیدا بۆ بەهەشتنشینانی سازداوەو، تا ئێستاکێش یەك لە دویەك شتی بۆ زێدە دەکا، کاتێك بڕوادارانیشی دەچنە ناو، شتی دیکەی تێدا وەدی دێنێ. ئەمە ڕەوایەو ناکرێ ڕەت کرێتەوە، ئەم بەڵگانەی ئێوەش تەنها بۆ ئەم بڕە و ئەندازەیە.

ئەگەر بەو ئایەتەش بیانو دێننەوە کە دەفەرمێ:

﴿.. كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلاَّ وَجْهَهُ..: لە زاتی پاکی خودا بترازێ، هەمو شتێك لە ناو دەچێ﴾ القصص:٨٨.

ئەوەتان لە خراپ تێگەیشتنی ئایەتە پیرۆزەکەیە، کە دەیکەنە بیانوش بۆ ئێستا نەبونی بەهەشتو دۆزەخ، وەکو بیانوی ئەو برایانەتانە کە دەڵێن بەهەشتو دۆزەخ توناو خاپور دەبنو خەڵکەکانیشی دەمرن!! بەڵام نە ئێوەو نە براکانتان تێگەیشتنی واتای ئایەتەکەتان ڕاست نەپێکاوە.

---

[1] قال هذا حديث حسن صحيح وقال الشيخ ناصر أيضاً في هذا الحديث: صحيح، وهو مخـرج في المصدر السابق:٦٤.

**بەڵام پێشەواکانی ئیسلام پێکاویانەو چاکی تێگەیشتون، ئەمان دەڵێن: مەبەست لە ﴿كُلُّ شَيْءٍ﴾ هەمو ئەو شتانەیە کە فەوتان و تونابونیان لەسەر نوسراوەو ئەوان ﴿هَالِكٌ﴾: دەفەوتێن و لە نێو دەچن.﴾، بەهەشت و دۆزەخیش بۆ مانەوە بەدیهێنراون، هەروەها عەرشیش کە سایپتەی بەهەشتە.**

**هەروەها گوتراوە: مەبەست لە ﴿إِلاَّ وَجْهَهُ﴾ واتە بێجگە لە موڵکی خودا، یا گوتراوە: بێجگە لەو شتانەی لە پێناو خودا دەکرێن. هەروەك گوتراوە: کە خودای بەرز ئەو ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرموێ:**

﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ: **هەمو ئەو شتانەی لەسەر زەوین لە نێو دەچن.**﴾ الرحمن:٢٦.

**فریشتە گوتیان: زەوینشین فەوتان، چاویشیان لەمانەوە بڕی. جا خودای کاربەجێ پێی ڕاگەیاندن کە ئەهلی ئاسمان و زەوی دەمرن و، فەرموی:**

﴿كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلاَّ وَجْهَهُ﴾القصص:٨٨.

**چونکە خودا زیندوەو نامرێ، جا لەو کاتەدا فریشتان دڵنیابون بە مردن، بەڵام ئەوانە بۆیە ئەو قسانەیان کرد، تا دەقە موحکەمەکان پێکەوە کۆك کەن، کە بەڵگەی مانەوەی بەهەشت و مانەوەی دۆزەخیشن، بەو شێوەی لە نێزیکدا بە ویستی خودای بەرز دێنە بەرباس)**[1].

---

[1] شرح الطحاوية: ص/٤٧٩، بۆ ئەم بابەتە بگەڕێوە بۆ "يقظة أولي الإعتبار لصديق حسن خـــــان ص/٣٧، وعقيدة السفاريني: (٢/٢٣٠)".

## بەندی دووەم

### ئاگرەوانەکان

فریشتەگەلێك چاودێری دۆزەخ دەکەن، گەلێك مەزن بەدیهێنراونو زۆریش توندوتیژن. لە خودای بەدیهێنەریان یاخی نابن، چ فەرمانێکیان پێ بکرێ ئەنجامی دەدەن، هەروەك خودای بەرز دەفەرموێ:

﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلاَئِكَةٌ غِلاَظٌ شِدَادٌ لاَ يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ: هۆ ئەوان کەسانی بڕواتان هێناوە! خۆتانو خاوو خێزانتان لە ئاگرێك بپارێزن کە سوتەمەنیەکەی مرۆڤو بەردنو، بە فریشتەگەلێ ئەسپێردراوە زۆر توڕەو توندوتیژن، هەرچی خوا پێیان بسپێرێ نافەرمانی ناکەنو هەر ئەوەی دەکەن کە پێیان راسپێردراوە﴾ التحريم:٦.

ژمارەشیان نۆزدە فریشتەن، هەروەك خودا دەفەرموێ:

﴿سَأُصْلِيهِ سَقَرَ، وَمَا أَدْرَاكَ مَا سَقَرُ، لاَ تُبْقِي وَلاَ تَذَرُ، لَوَّاحَةٌ لِلْبَشَرِ، عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ: ئەوجا رایدەکێشمە دۆزەخی تاوێنەرو، تۆ چوزانی دۆزەخ چیە! ئاگرێکە نە شتێك دێڵێتەوەو نە شتێك بەرەڵلا دەکا، سوتێنەرو هەڵقرچێنەری پێستانە، نۆزدە فریشتەی لەسەرن.﴾ المدثر: ٢٦-٣٠.

جا بێبڕوایان بەم ژمارەیە تاقیکرانەوە؛ وایان گومان برد، دەکرێ بەسەر ئەو ژمارە کەمەیدا زاڵ بن، بێئاگا لەوەی هەریەك لەوان فریشتان هێند توانـاو هێزی هەیە بەرەنگاری هەمو مرۆڤان بێتەوە. بۆیەش خودا بەرز لە پاشان دەفەرموێ: ﴿وَمَا جَعَلْنَا أَصْحَابَ النَّارِ إِلاَّ مَلاَئِكَةً وَمَا جَعَلْنَا عِدَّتَهُمْ إِلاَّ فِتْنَةً لِلَّذِينَ كَفَرُوا: لە فریشتان بترازێ کەسمان نەکردۆتە ئاگرەوانو بۆ تاقیکردنەوەی کافرانیش نەبێ ژمارەی ئەوانمان نەگرتۆتە بەرچاو﴾ المدثر:٣١.

ئیبنی رەجەب دەڵێ: (ئەوی بەناوبانگە لە نێوان پێشینو پاشین ئەوەیە،

تاقیکردنەوەکە لەوە راهاتوە کە باسی ژمارەی فریشتەکان کراوەو، بێبڕواکان وا فریویان خواردبو گوایە دەتوانن بیانکوژنو، وا گومانیان دەبرد کە دەتوانن بەرانگژیان ببنەوەو رێیان لێ بگرن. ئەوەیان نەزانیبو کە بە هەمو خەڵکی ناتوانن بەرگەی یەك فریشتە بگرن)[1]. جا ئەوانەن خودای بەرزو کاربەجێ بە (ئاگرەوان) ناوی ناون، کە دەفەرموێ:

﴿وَقَالَ الَّذِينَ فِي النَّارِ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ ادْعُوا رَبَّكُمْ يُخَفِّفْ عَنَّا يَوْمًا مِنْ الْعَذَابِ: ئەوانی لە نێو ئاگردان بە فریشتە ئاگرەوانەکان دەڵێن: لە پەروەردگارتان بخوازن رۆژێك ئەشکەنجەمان لەسەر سوك بکا﴾ غافر:٤٩.

[1] التخويف من النار: ص/١٧٤.

## بەندی سێیەم

## سیفەتی دۆزەخ

### جێباسی یەکەم

### جێگەی دۆزەخ

زانایان جیاوازن لەوەی ئێستا دۆزەخ لە کوێیە[1]، هێندێک دەڵێن: وا لە عەردی ژێرییە، هەندێکی کە دەڵێن: لە ئاسمانە، ئی دیکەش هەن لەم بابەتە چ ناڵێن، رای ئەمانەش دروستە. چونکە هیچ دەقێکی راست نیە بەڕاشکاوی جێگەکەی دیاری بکا.
سیوطی حافیزیش یەك لەوانەیە لەم بارەوە چ رای نەداوەو دەڵێ: (لەبابەت دیار کردنی شوێنی دۆزەخ چ ناڵێین و رادەوەستین، چونکە لە خوا بترازێ کەس لێی ئاگا نیە، چ فەرمودەش لە لای من نەچەسپاوە بتوانم لەم بارەیە پشتی پێ ببەستم)[1].
شێخ وەلیوڵلای دەهلەوی لەعەقیدەکەیدا دەڵێ: (چ دەقێك بەڕاشکاوی جێگەی بەهەشت و دۆزەخی دیار نەکردوە، بەڵکو لەوێن کە خوای بەرز ویستی لێیە، چونکە ئێمە ناتوانین پەی بە هەمو بەدیهێنراوو جیهانەکانی خودا ببەین)[2].
صیدیق حەسەن خان پاش هێنانەوەی گۆتەکەی دەهلەوی، دەڵێ: (دەڵێم: ئەم گۆتەیە پەسەندترینی هەمو قسانەو، بەویستی خودا لە هەموشیان بێ پەڵەترە)[3]

---

[1] يقظة أولي الإعتبار، لصديق حسن خان: ص/٤٧.

[2] هەمان سەرچاوە.

[3] هەمان سەرچاوە.

## جێباسی دووەم

## فراوانیو قوڵی دۆزەخ

دۆزەخ گەلێك بەرینو فراوانو قوڵەو، پەلوپۆی دور هاویشتوە، ئەم بەڵگانەش ئاماژە بە هەندێ دەكەن:

**یەكەم/** ئەوانەی دەچنە دۆزەخ، هێند زۆرن لە ژمارە نایەن، جا لەگەڵ زۆریی ئەژماریشیان، هەریەكەیان هێندە گەورەو زەبەلاح دەبێ تا كەڵبەی لە نێو ئاگردا هێندی كێوی ئوحودی لێدێو، لەوشان تا ئەو شانی سێ رۆژەرێ پان دەبێ. لەگەڵ هەندێشدا دۆزەخ هەمو ئەو ژمارە زۆرەی بێبڕواو تاوانكارەكان لەخۆ دەگرێ كە بە درێژایی ژیانی دنیا هاتونەتە بون، سەرەڕای زلو زەبەلاحی لاشەیانو، هێشتاكە بەشی هی دیكەش جێی تێدا دەمێنێ، خودای كاربەجێش لە سورەتی قاف دا ئەو راستەقانیەی پێ راگەیاندوین كە دەفەرموێ:

﴿يَوْمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلْ امْتَلأْتِ وَتَقُولُ هَلْ مِنْ مَزِيدٍ: ئەو رۆژەی بە دۆزەخ دەڵێین: ئایا پڕ بوی؟ دەڵێ: ئەرێ هێشتا زێتر ماوە؟﴾ق:٣٠.

دۆزەخ بەو ئاشەی دەچێ كە هەزاران هەزار تۆنە دانەوێڵە لە دۆڵەدانەی دەكرێو بێ بێزاریو ماندوبون هەموی تێك دەسوڕێنێو دەیانهاڕێ. دانەوێڵەش كۆتایی دێ، ئاشەكە هێشتا چاوەنۆڕی پترە.

لە فەرمودەی بیانو لێكدی گری بەهەشتو دۆزەخدا هاتوە، كە خودای مەزن بە ئاگر دەفەرموێ: ((إنما أنت عذابي أعذب بك من أشاء، ولكل واحدة منهما ملؤها، فأما النـــار فلا تمتلىء -حتى يضع الله تبارك وتعالى رجله- فتقول: قط قط، فهنالك تمتلىء، ويزوى بعضـــها الى بعض، ولا يظلم الله من خلقه أحـــداً: ئەتۆ ئەشكەنجەی منیو كێی بمەوێ بە تۆی ئەشكەنجە دەدەم، بۆ هەریەكەشتان مشتی هەیە، هەرچی دۆزەخە، پڕنابێ هەتا خودای بەرز پێی خۆی دادەنێ ئەوجا دۆزەخ دەڵێ: بەسەو ئەوكاتە پڕ دەبێو

**دەچێتە باریەك خوداش ستەم لە هیچ بەندەیەكی خۆی ناكا))**[1].

**هەروەها لە ئەنەسەوە هاتوە، كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:** ((لا تزال جهنم يلقى فيها وتقول: هل من مزيد، حتى يضع رب العزة فيها قدمه، فيزوي بعضها الى بعض، فتقول: قط، قط، بعزتك وكرمك: **هێشتا دۆزەخ تێی دەهاویشترێ‌و دەشڵێ: ئەرێ زیاتر هەیە، تاكو خودای خاوەن دەسەڵات پێی خۆی تێ دادەنێ، ئەوجا دەچێتە باریەك‌و، دەڵێ: بەسمە، بەسمە، بە دەسەڵات‌و بەخشندەیی خۆت))**[2].

**دووەم/ بەڵگەیەكی دیكەی قوڵی دۆزەخ ئەو بەردەیە كە لەسەرەوەی ڕا هەڵدرایە نێوی‌و، كاتێكی زۆر دەخایانێت تا بە بنیەوە دەگات. لە صەحیحی موسلیمدا لە ئەبو هورەیرە ﷺ هاتوە: دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بوین، دەنگی بەربونەوەیەك بیسترا. جا پێغەمبەر ﷺ فەرموی:** ((تدرون ما هذا؟: **دەزانن ئەمە چیە؟)) گوتمان: خوداو پێغەمبەرەكەی زاناترن. فەرموی:**

((هذا حجر رمي به في النار منذ سبعين خريفاً، فهو يهوي في النار الى الآن: **ئەمە بەردێك بو هەفتا پایزە هەڵدراوەتە نێو ئاگری، تا ئێستا تێیدا گلۆر دەبۆوە))**[3].

**هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:** ((لو أن حجراً مثل سبع خلفات، ألقي من شفير جهنم هوى فيها سبعين خريفاً لا يبلغ قعرها: **ئەگەر بەردێكی هێندی هەفت دۆڵان، لە لێواری دۆزەخێوە هەڵدرا، هەفتا پایزان تێیدا گلۆر دەبێتەوەو ناگاتە بنی))**[4].

**سێیەم/ زۆری ژمارەی ئەو فریشتانەی لە ڕۆژی قیامەتدا دۆزەخ دەهێنن. پێغەمبەر ﷺ باسی هاتنی دۆزەخی بۆ كردوین لە ڕۆژی قیامەتدا، ئەو ڕۆژەی خودا لەبارەی دەفەرموێ:**

﴿وَجِيءَ يَوْمَئِذٍ بِجَهَنَّمَ..: **لەو ڕۆژەیدا دۆزەخ دەهێنرێ**﴾ الفجر:٢٣.

**پێغەمبەریش ﷺ فەرموی:** ((يؤتى بجهنم يومئذٍ لها سبعون ألف زمام، مع كل زمامٍ سبعون

---

[1] رواه البخاري ومسلم عن ابي هريرة؛ جامع الأصول: (١٠/٥٤٤).

[2] متفق عليه؛ مشكاة المصابيح: (٣/١٠٩).

[3] رواه مسلم، كتاب الجنة، باب في شدة حر النار، (٤/٢١٨٤)، ورقمه (٢٨٤٤).

[4] روى الحاكم عن أبي هريرة، والطبراني عن معاذ وأبي أمامة، عن النبي ﷺ. صحيح الجامع الصغير: (٥/٥٨)، ورقمه (٥١٢٤)، وإسناده صحيح.

آلــف ملــك. واتە: ئەو ڕۆژی جەهەننەم دەهێنرێ هــەفتا هــەزار لغــاوی هەیــە، هــەر لغاوێکیش هەفتا هەزار فریشتەی لەگەڵە))[1]. تۆش دەتوانی گەورەیی ئەو بەدیهێنراوە بێنیە بــەر ئەندێشــەت، کــە ئــەو هــەمو فریشــتە بەهێزانــەی گەرەکــە وە تەنها خــوای مەزنیش بە هێزو توانای وان زانایە.

**چوارەم/** بەڵگەیەکی دیکەش بۆ ناڕەحەتی بەرژەنگ‌و گەورەیی دۆزەخ ئەوەیە کە دو بەدیهێنراوی مەزنی وەکو خۆرو مانگ دەبنە دو گای کوژاوە لە دۆزەخدا، لە (مشكل الآثار)ی طەحاویدا لە سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمان هاتوە، کە دەڵێ: ئەبو هورەیرە بۆی گێڕاینەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((الشمس والقمر ثوران مكوران في النار يوم القيامــة: ڕۆژو مانگ دو گای گرمۆڵەن لە نێو دۆزەخدا لە ڕۆژی قیامەت)).

هەروەها بەیهەقی لە کتێبی (البعث والنشور)و بەزارو ئیسماعیلی خەطابی، بە سەنەدێکی صەحیح بە پێی مەرجی بوخاری دەیگێڕنەوە، بە کورتکراوەییش لە صەحیحەکەیدا بەم بێژەیە دەیگێڕێتەوە: ((الشمس والقمر مكوران في النــار: ڕۆژو مانگ لە دۆزەخدا دەپێچرێنەوەو گرمۆڵە دەبن))[2].

---

[1] رواه مسلم عن عبدالله بن مسعود؛ كتاب الجنة وصفة نعيم أهلها، باب في شدة حر جــهنم، (٢١٨٤/٤)، ورقمه (٢٨٤٢).

[2] شێخ ناصر فەرمودەکەی لە (سلسلة الأحاديث الصحيحة، (٣٢/١)، ورقم الحديــث (١٢٤)) هێناوەتــەوە. ئێمەش لێرەدا پوختەی تۆژینەوەی فەرمودەکەمان گواستۆتەوە.

## جێباسی سێیەم

## چینەکانی دۆزەخ

دۆزەخ گەرمی جیاجیای هەن و، ئەو ئەشکەنجیانەی خودا بۆ دۆزەخیانی ئامادەکردون جۆراوجۆرن و، هەمو یەك پلە نین، خودای بەرزیش دەفەرموێ:

﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ..: دوڕوەکان لە خوارترین نهۆمی ئاگری دۆزەخێ دان.﴾ النساء:١٤٥.

عارەبیش (الدرك) بۆ هەمو شتێك بەکاردێنن کە ژێرداکشێ هەروەك (الدرج) بۆ هەمو شتێك بەکار دێنن کە ژور هەڵکشێ. بۆیە یەکەمیان بۆ دۆزەخ و ئەوی دیکە بۆ بەهەشتێ بەکار دێنن. جا هەرچەند دۆزەخ بەرەو خوار رۆبچێ گەرمتر دەبێ و بلێسەی بەتینتر دەبێ[1]. دوڕوەکانیش پشکی هەرەگەورەی ئازارو ئەشکەنجەیان بەردەکەوێ. بۆیە لە نهۆمی هەرەژێری دۆزەخێ دان.

وا دەبێ دۆزەخ بە پلەوپایەش نێودەبرێ. هەروەك لە سوڕەتی ئەنعامدا کە خودا یادی بەهەشت و دۆزەخییان دەکا، دەفەرموێ:

﴿ وَلِكُلٍّ دَرَجَاتٌ مِمَّا عَمِلُوا..: هەریەکە لە کاروکردەوەیان پلەوپایەیەکیان هەیە﴾ الأنعام:١٣٢.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿ أَفَمَنْ اتَّبَعَ رِضْوَانَ اللَّهِ كَمَنْ بَاءَ بِسَخَطٍ مِنْ اللَّهِ وَمَأْوَاهُ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ، هُمْ دَرَجَاتٌ عِنْدَ اللَّهِ..: ئایا کەسێکی لە دوای رەزامەندی خوادایە، وەکو کەسێکە لە نێو رق و تورەیی خوادا قەتیس ماوە، جێگای دۆزەخەو توشی سەرەنجامێکی خراپ هاتوە. هەریەك لەوانە پلەو پایەیەکیان لە لای خودا هەیە..﴾ آل عمران:١٦٢-١٦٣.

عەبدوڕەحمانی کوڕی زیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێ: (پایەکانی بەهەشت زۆر

---

[1] راجع تذكرة القرطبي: ص٣٨٢، والتخويف من النار، لإبن رجب: ص٥٠.

**هەڵدەکشێن و، پایەکانی دۆزەخ ژێر دادەکشێن)**[1] **. لە هەندێك لە پێشینانیشەوە وا هاتوە کە ئەو یەکخواپەرستە یاخییانەی دەچنە دۆزەخ؛ لە چینی هەرە سەرودا دەبن و، جولەکە لە چینی دوەم و، دیان لە سێیەم چین و، صابیئە لە چارەم چین و، ئاگر پەرست لە پێنجەم چین و، هاوبەشدانەرانی عەرەب لە چینی شەشەم و،**[2] **دوڕوانیش لە هەفتەم نهۆمدا دەبن. لە بازەکتێبێکیشدا ئەو نهۆمانە وا ناونراون: کە یەکەم (جەهەننەم) دۆزەخەو، دوەم (لەظا) بڵێسەی پاك و، سێیەم (حوطەمە) هەڕەشێنەر و، چارەم (سەعیر) داگیرساو، پێنجەم (سەقەر) داخکەر و، شەشەم (جەحیم) هەڵایساو، هەفتەمیش (هاویە) هەڵدێر.**

**بەڵام پۆلین کردنی دۆزەخییان بەم شێوەیەو، ناونانی چینەکان بەم جۆرە راست نین، بەڵکو دروست ئەوە کە هەریەکە لەم ناوانە هێنراون وەك جەهەننەم و لەظاو حوطەمە..... هەمو ناوی وان ئاگریان پێ ناسدەکرێ، نەك تەنیا نێوی بەشێکی بن. راستیش وایە کە خەڵکی بە پێی بڕی کوفرو گوناهبار لێك جودان.**

## جێباسی چارەم

### دەروازەکانی دۆزەخ

**خودای بەرز پێی راگەیاندوین کە دۆزەخ هەفت دەروازەی هەن، هەروەك دەفەرموێ:** ﴿وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوْعِدُهُمْ أَجْمَعِينَ، لَهَا سَبْعَةُ أَبْوَابٍ لِكُلِّ بَابٍ مِنْهُمْ جُزْءٌ مَقْسُومٌ: **بەڕاستی دۆزەخ جێگەی هەموویانە، هەفت دەرگەی هەیەو، هەروەها دەفەرموێ: دەرگەیەك بۆ تاقمێك لەوانە دابەشکراون.**﴾ الحجر:٤٣-٤٤.

---

[1] التحويف من النار، لإبن رجب: ص٥٠.

[2] گەر ئەم دابەشکردنە کۆششی تێداکراوە بەپێی شارەزاییمان لەو دەقانەی بەڵگەن لەسەر گەورەیی تاوانی کۆمەڵە جیاجیان، ئەوا ئەم ریزکردنەی باسیان کردوە پێویستی بە چاوپیاخشاندنەوە هەیە، چونکە (مجوس) ئاگرپەرستان تاوانیان لە تاوانی عەرەبە هاوبەشپەرستەکان کەمتر نیە، کەواتە باشتر وایە بێدەنگ بین لەو شتانەی کە دەقەکان لێی بێدەنگ بون.

**ئیبن کەثیریش لە راڤەی ئەم ئایەتەدا دەڵێ: (واتە، هەر دەروازەیەك کۆمەڵێکی لە شوێنکەوتانی ئیبلیس پێی تایبەت کراوە کە ناتوانن لێی لا بدەن. خودا پەنامان بدا. هەر یەکە بە گوێرەی کردەوەو کاری لە دەرگایەکیەوە دەچێتە دۆزەخ و، لە نهۆمێکی ئارام دەگرێ). لە عەلی کوڕی ئەبوطالیبەوە هاتوە لە وتارێکیدا گوتی: (دەرگەکانی دۆزەخ ئاوان، -ئەبو هارون گوتی-چین چین لەسەر یەکن). هەر لە عەلییەوە هاتوە: (دەروازەکانی دۆزەخ هەفتن و یەك لەسەر یەکن، یەکەمیان پڕ دەبێ پاشان دوەم، پاشان سێیەم، تاکو هەمویان پڕ دەبن)[1].**

**ئەو کاتەی کافرەکانیش دەگەنە سەر ئاگر، دەروازەکانی ئاوەڵا دەبێ و، ئەوجا بە ئەمری دەچنە نێوی:**

﴿ وَسِيقَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِلَى جَهَنَّمَ زُمَرًا حَتَّى إِذَا جَاءُوهَا فُتِحَتْ أَبْوَابُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِنْكُمْ يَتْلُونَ عَلَيْكُمْ آيَاتِ رَبِّكُمْ وَيُنْذِرُونَكُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَذَا قَالُوا بَلَى وَلَكِنْ حَقَّتْ كَلِمَةُ الْعَذَابِ عَلَى الْكَافِرِينَ: **ئەو کەسانەی بێبڕوان دەستە دەستە بەرەو دۆزەخ راپێچ دەکرێن تا کاتی دەگەنە دۆزەخ دەرگاکانی دەکرێتەوەو، فریشتەی سەرپەرشتیارانی دۆزەخ پێیان دەڵێن؛ ئەدی هەر لە خۆتان پێغەمبەرانێکتان نەهاتنە لا کە ئایەت و نیشانەکانی پەروەردگارتان بەسەردا بخوێننەوەو، لە دیداری ئەم رۆژە بتان پرینگێننەوە؟ دەڵێن: بەڵێ. بەڵام بڕیاری ئەشکەنجە بۆ بێبڕوایان جێی خۆیەتی**﴾الزمر: ٧١.

**پاش ئەو دان پێدانانەش پێیان دەگوترێ:**

﴿ قِيلَ ادْخُلُوا أَبْوَابَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا فَبِئْسَ مَثْوَى الْمُتَكَبِّرِينَ: **پێیان دەڵێن لە دەروازەکانی دۆزەخ هەڕونە ژور، تا هەتایی لەوێندەرێدا قەتیس بن، وەی چەند خراپە جێی زلفیزان.**﴾ الزمر: ٧٢.

**جا ئەو دەروازانە لەسەر تاوانکاران دادەخرێن و، دوای ئەمە چ تەمایەکی دەرچونیان نامێنێ.**

**هەروەك خودای بەرزیش دەفەرمویّ:**

---

[1] تفسير ابن كثير: (٤/١٦٢).

﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِنَا هُمْ أَصْحَابُ الْمَشْأَمَةِ، عَلَيْهِمْ نَارٌ مُّوصَدَةٌ: **ئەوانی بێبڕوا بون بە نیشانەکانی ئێمە، ئەوانە بەدبەختەکانن، ئەوانە دەرگاکانی دۆزەخیان لەسەر داخراوەو چارەنوسیان ئاگری بێدەرەتانە**﴾البلد:١٩-٢٠.

**هەروەها خودا لە سورەتی (الهمزة)دا دەفەرموێ:**

﴿وَيْلٌ لِّكُلِّ هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ، الَّذِي جَمَعَ مَالًا وَعَدَّدَهُ، يَحْسَبُ أَنَّ مَالَهُ أَخْلَدَهُ، كَلَّا لَيُنبَذَنَّ فِي الْحُطَمَةِ، وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْحُطَمَةُ، نَارُ اللَّهِ الْمُوقَدَةُ، الَّتِي تَطَّلِعُ عَلَى الْأَفْئِدَةِ، إِنَّهَا عَلَيْهِم مُّؤْصَدَةٌ، فِي عَمَدٍ مُّمَدَّدَةٍ: **هاوار و ئاهو ناڵە بۆهەر کەسێك کە شوێن کەم و کوڕیدا دەگەڕێت و لە عەیب و عاری دەدوێت، ئەو کەسەی کە ماڵ و سامانی زۆری کۆکردۆتەوەو هەر خەریکی ژماردنێتی، وا دەزانێ ماڵ و سامانەکەی دەبێتە هۆی تەمەن درێژی و نەمری بۆی، نەخێر نا وانیە، بەڕاستی تورِ هەڵدەدرێتە نێو ئاگری تێکشکێنەر. تۆ چوزانی (حوطەمە) هەرشێنەر چیە؟! ئاگری هەڵکراوی خوایە. ئەو ئاگرەی کە دڵو دەرونان دادەگرێ. ئەو ئاگرەو داخراوەی هەمو لایەکی داگرتون. لە کۆڵەگەی ڕاکێشراو و پڕ بلێسە**﴾الهمزة:١-٩.

**خودا هەواڵی پێداوین کە دەرگەکانیان بەسەر پێوەدەدرێ، ئیبنی عەبباسیش ﷺ دەڵێ: ﴿فِي عَمَدٍ مُّمَدَّدَةٍ﴾ واتە: دەروازەکان ڕاکشاو و درێژن. قەتادەش لە خوێندنەوەی ئیبنی مەسعود، دەڵێ: (إِنَّهَا عَلَيْهِم مُّؤْصَدَةٌ، فِي عَمَدٍ مُّمَدَّدَةٍ).[1] واتە: ئەو دەروازانەیان لەسەر گاڵە دراوە بە هۆی کۆڵەگەی بەرزو درێژەوە، عەطیە دەڵێ: بریتین لە کۆڵەگەی ئاسنین. موقاتیل دەڵێ: دەرگەکانیان بەسەردا داخراوەو ئەوجا بە سنگی ئاسنینەوە توند کراوە، تاکو هەمو خەمو گەرمیەکیان بەسەردا بگەڕێتەوە. بەمجۆرە کە دەفەرموێ (ممددة) وەسفێکی توند کراون. واتە ئەو کۆڵەگانەی دەروازەکانیان پێ توند کراون ڕاکشاو و درێژن، دیارە درێژو کشاویش پتەوترو جێگیرترە لە هی کورتیلە[2].**

**بەڵام بەر لە ڕۆژی قیامەتێ وا دەبێ دەروازەکان دەکرێنەوەو دادەخرێن،**

---

[1] تفسير ابن كثير(٣٦٨/١).

[2] التخويف من النار، لإبن رجب: ص٦١.

پێغەمبەریش ﷺ پێی ڕاگەیاندوین، دەرگەکانی دۆزەخ لە مانگی ڕەمەزان دادەخرێن، هەروەك لە ئەبو هورەیرە، لە پێغەمبەر ﷺ هاتوە دەفەرموێ:

((إذا جاء رمضان فتحت أبواب الجنة، وغلقت أبواب النار، وصفدت الشياطين ومردة الجن: کە ڕەمەزان دێ دەروازەکانی بەهەشت دەکرێنەوەو، دەرگەکانی دۆزەخ دادەخرێن، شەیتانەکان و دێو و درنجی جنۆکانیش کۆت دەکرێن))[1].

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:

((إذا كان أول ليلة من رمضان صفدت الشياطين ومردة الجن وأغلقت أبواب النار، فلم يفتح منها باب، وفتحت أبواب الجنة، فلم يغلق منها باب: کە یەکەم شەوی ڕەمەزان دادێ شەیتانەکان و دێو و درنجی جنۆکان کۆت دەکرێن و دەروازەکانی دۆزەخ دادەخرێن، هیچ یەکێکیان ناکرێنەوە، دەروازەکانی بەهەشتیش دەکرێنەوەو، هیچ یەکێکیان داناخرێن))[2].

## جێباسی پێنجەم

### سوتەمەنی دۆزەخ

گابەرد و لە دین دەرچو و بێبڕوایان سوتەنی دۆزەخن، هەروەك خودای بەرز دەفەرموێ:

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ..: هۆ ئەوانەی بڕواتان هێناوە، خۆتان و خاو خێزانتان لە ئاگرێك بپارێزن کە سوتەمەنیەکەی مرۆڤ و گابەردەکانن.﴾ التحريم:٦.

دەفەرموێ: ﴿.. فَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ: خۆبپارێزن لەو ئاگرەی کە سوتەمەنیەکەی خەڵك و گابەردەو، بۆ بێبڕوایان سازدراوە﴾

[1] التخويف من النار، لإبن رجب: ص٦٦.

[2] أخرجه الترمذي حديث أبي هريرة عن النبي ﷺ؛ التخويف من النار، لإبن رجب: ص٦٦.

البقرة: ٢٤.

**لێرەدا مەبەست لەو خەڵکانەی ئاگریان پێ خۆش دەکرێ، بێبڕواو هاوبەش دانەرانن، هەرچی ئەو بەردانەشن کە بۆ دۆزەخ دەبنە سوتەنی، خودا بە ڕاستیەکانی وان زاناترە، هێندێك لە پێشینان وای بۆ چون کە بریتی بن لە گابەردی گۆگرد، عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود دەڵێ: (بریتین لە گابەردی گۆگرد، خودا لەو ڕۆژەی ئاسمانەکان و زەوی بەدیهێناون، ئەو بەردانەی لە ئاسمانی دنیا بەدیهێناوەو بۆ بێبڕوایانی سازداوە[1].**

**جا ئەگەر ئەو گۆتەیە لە پێغەمبەر ﷺ وەرگیرابێ، وەری دەگرین و، مشت ومڕی لەسەر ناکەین، خۆ ئەگەر مەسەلەیەکی ئیجتیهادی بێ و بەپێی شارەزایی لە سروشتی بەردەکان و تایبەتمەندێتیەکانیان ئەو ڕایە دروست بوبێ، ئەوا ئەمە قسەیەکی ساغ و دروست نیە، چونکە بەردی وا هەیە لە بەردە گۆگردەکان بەهێزترو گڕدارترە. ئەوانی سەرەتاش دیدیان وایە کە بەردی گۆگرد هەندێك تایبەتمەندێتی هەیە، کە بەردی دیکە نیانە، بۆیە گوتیان هەر گۆگردیش کەرەستەی سوتەمەنی دۆزەخە، ئیبنو ڕەجەب دەڵێ: (زۆربەی ڕاڤەکاران وای بۆ دەچن، مەبەست لە بەرد بەردی گۆگردە کە ئاگری پێ هەڵدەگیرسێ، دەشڵێن: پێنج جۆرە ئەشکەنجە لەو جۆرە بەردانەدا هەن لە هی دیکە نین ئەوانیش: خێرایی هەڵبون و، گەنیوی بۆن و، دوکەڵی زۆر و، توندی بەلاشەوە نوسان و، گەرمی زۆری ئەگەر سوربێتەوە)[2]. ڕەنگە خودای مەزن بەردی واش بێنێتە بون تایبەتمەندێتیەکەیان لە سەروی گۆگردەوە بێ، ئێمەش بە دڵنیاییەوە دەڵێین؛ ئەو شتانەی لە دواییندا هەن جودان لەوانی لە دنیا هەن.**

**ئەو داروبەردانەی کرابونە خواوەندو بێجگە لە خودا دەپەرستران، ئەوانیش دەبنە سوتەنی ئاگری دۆزەخ.**

﴿إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنْتُمْ لَهَا وَارِدُونَ، لَوْ كَانَ هَـؤُلَاءِ آلِهَةً مَا وَرَدُوهَا وَكُلٌّ فِيهَا خَالِدُونَ: **بەڕاستی ئێوەو ئەوانەی بێجگە لە خوا**

---

[1] رواه إبن جرير، وابن أبي حاتم، والحاكم في المستدرك، وقال بهذا القول ابن عباس ومجاهد وابن جريج؛ تفسير إبن كثير: (١/١٠٧).

[2] التخويف من النار، لإبن رجب: ص١٠٧.

**دەیپەرستن دەبنە سوتەمەنی دۆزەخ و هەموتان دەچنە نێوی. ئەگەر ئەوان خوا بونایە هـەرگیز نەدەچونـە نێـو دۆزەخـەوە ئـەوانیش هـەمو بەهەمیشـەیی لـە دۆزەخیـدا دەمێننەوە﴾** الأنبیاء:٩٨-٩٩.

## جێباسی شەشەم

### توندی گەرمای ئاگرو مەزنی دوکەڵ و بڵێسەکانی

خودێ دەفەرموێ: ﴿وَأَصْحَابُ الشِّمَالِ مَا أَصْحَابُ الشِّمَالِ، فِي سَمُومٍ وَحَمِيمٍ، وَظِلٍّ مِنْ يَحْمُومٍ، لَا بَارِدٍ وَلَا كَرِيمٍ: ئەوانەی کردەنامان بەدەستی چەپە وەردگرن، چ بەدبەختن. لە نێو بڵێسەی ئاگرو ئاوی کوڵاو دان، لەژێر سێبەری رەشی دوکەڵی داغ دان، سێبەرێکە نەفێنکەو نە بەکەڵکە﴾ الواقعة: ٤١-٤٤.

ئەم ئایەتە پیرۆزانە ئەو هەرسێ شتانەی گرتۆتە خۆ کە لە دنیایێدا خەڵك لە گەرما خۆیان پێ فێنك دەکەنەوە بریتین لە: ئاو و باو سێبەر، باسی ئەوەشی فەرموە کە ئەوانە چ سودێکیان بۆ دۆزەخیان نیە. چونکە بای دۆزەخ سەمومە کە بایەکی هەرەگەرمە، ئاوەکەشی حەمیمە کە ئاوێکی یەکجار گەرمەو، سێبەرەکەشی یەحمومە کە لەپارچە تەنیو دوکەڵی دۆزەخ پێکهاتوە[1].

جا هەروەك لەم ئایەتەدا ناڕەحەتی و پەرژەنگی کۆمەڵی چەپی دەرخستوە کە دۆزەخین، لە ئایەتێکی تردا ناڕەحەتی و پەرژەنگی خودی دۆزەخی باسکردوەو دەفەرموێ:

﴿وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ، فَأُمُّهُ هَاوِيَةٌ، وَمَا أَدْرَاكَ مَا هِيَهْ، نَارٌ حَامِيَةٌ: هەرکەسێ تای تەرازوی کردەوانیشی سوك بێ، جێگەی دۆزەخی هەڵدێرە. تۆ چوزانی دۆزەخ چیە؟ ئاگرێکی زۆر سوتێنەرە﴾القارعة: ٨-١١.

ئەو سێبەر و سایەش کە ئایەتە پیرۆزەکە ئاماژەی بۆ دەکات: ﴿وَظِلٍّ مِنْ يَحْمُومٍ﴾الواقعة: ٤١، بریتیە لە سێبەری دوکەڵی ئاگری دۆزەخ. دیارە سێبەر هەردەم هەستی شێداریو فێنکی دەبەخشێو، نەفس حەزی لێدەکاو تێیدا دەحەسێتەوە، بەڵام ئەو سێبەرە نە فێنکەو نە دڵگیرو خۆشە بەڵکو لە چڕەدوکەڵی ئاگری دۆزەخ

---

[1] التخويف من النار، لإبن رجب: ص٨٥.

پێکهاتوه.

قورئانی پیرۆزیش باسی ئەو سێبەرەی بۆ کردوین کە دوکەڵی دۆزەخەو لە ژور ئاگرەکەیەتی، فەرمویەتی:

﴿انطَلِقُوا إِلَى ظِلٍّ ذِي ثَلَاثِ شُعَبٍ، لَا ظَلِيلٍ وَلَا يُغْنِي مِنَ اللَّهَبِ، إِنَّهَا تَرْمِي بِشَرَرٍ كَالْقَصْرِ، كَأَنَّهُ جِمَالَةٌ صُفْرٌ: بۆ لای سێبەری دوکەڵی سێ شاخە برۆن، نە سێبەرێکی فێنکەو نە لە گڕو بڵێسەی ئاگر دەتانپارێزێت، ئاگرێکی وایە کە پریشکی هێندەی کۆشکان فڕێ دەدا، هەر دەڵێی حوشتری زەردن.﴾المرسلات: ٣٠-٣٣.

ئایەتەکە ئەوەی راگەیاندوە: ئەو دوکەڵەی لە ئاگری دۆزەخ هەڵدەستێ لەبەر زۆری‌و زەبەلاحی بۆ سێ بەشان دابەش دەبێ‌و، تارماییان دروست دەکا بەڵام سێبەر نین‌و. کەس لە بڵێسە داگیرساوەکان ناپارێزن، هەرچی ئەو بڵێسەو تۆپەڵە ئاگرانەشن کە لە ئاگری دۆزەخەوە پەل داوێن‌و بەملاولادا دەفڕن، هێند گەورەن، دەڵێی قوللەو قەڵاتی گەورەن‌و، دەشوبهێنە حوشتری رەشیش.

هەروەها خودای گەورە لەبارەی هێزی ئەو ئاگرەو ئاستی کاریگەری لە ئەشکەنجە دراوان دەفەرموێ:

﴿سَأُصْلِيهِ سَقَرَ، وَمَا أَدْرَاكَ مَا سَقَرُ، لَا تُبْقِي وَلَا تَذَرُ، لَوَّاحَةٌ لِلْبَشَرِ: لە دواییدا رایدەکێشمە نێو دۆزەخی داخکەرو تاوێنەر، تۆ چوزانی دۆزەخ چییە. ئاگرێکە نە شتێك دەهێڵێتەوە نە شتێك بەرەڵڵا دەکا. داخکەرو هەڵقرچێنەری پێستەکانە﴾ المدثر: ٢٦-٢٩.

جا ئەو ئاگرە هەمو شتێك هەڵدەلوشێ‌و، هەمو شتێك خاپور دەکاو، هیچی جێ ناهێڵێ، پێستان دەسوتێنێ‌و دەگاتە هێسکان، ئەوی لە هەناواندایە هەموی داخ دەکاو سەر بەدڵانیشدا دەگرێ.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێداوین کە ((نارنا جزء من سبعين جزءاً من نار جهنّم: ئاگری ئێمە بەشێکە لە هەفتا بەشی ئاگری دۆزەخ))، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا هێندەش با بەس بو، فەرموی:

((فضلت عليها بتسعة وستين جزءاً كلهن مثل حرها: شێست‌و نۆ بەشی بەسەردا

**زێدەکراوە هەریەکەیان گەرماییان هێندی وی هەیە))**.[1]

**ئەو ئاگرە بە تێپەڕبونی کاتان و بەسەر چونی ڕۆژان لە کڵپە ناکەوێ و دانامرکێ:**

﴿فَذُوقُوا فَلَنْ نَزِيدَكُمْ إِلاَّ عَذَابًا: **جا بچێژن کە هەرگیز بێجگە لە ئازار شتێکتان بۆ زێدە ناکەین.**﴾ النبأ: ٣٠.

﴿.. كُلَّمَا خَبَتْ زِدْنَاهُمْ سَعِيرًا: **هەردەمێ ئاگرەکە کز بێ گڕی ئاگرەکە زیاد دەکەین.**﴾ الإسراء: ٩٧.

**بۆیە بێبڕوایان حەسانەوە تام ناکەن و، هەرچەندی ئازاردانیان درێژ بێتەوە ئەشکەنجەیان سوك نابێ:**

﴿.. فَلاَ يُخَفَّفُ عَنْهُمْ الْعَذَابُ وَلاَ هُمْ يُنصَرُونَ: **ئەشکەنجەیان سوك ناکرێ و کۆمەك و یارمەتیش نادرێن.**﴾ البقرة: ٨٦.

**ئاگری دۆزەخیش هەمو ڕۆژێ خۆش دەکرێ، هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:**

((صل صلاة الصبح، ثم أقصر عن الصلاة، حتى تطلع الشمس، وترتفع فإنها تطلع بين قرني شيطان، وحينئذ يسجد لها الكفار، ثم صل فإن الصلاة مشهودة حتى يستقل الظل بالرمح، ثم أقصر عن الصلاة فإنه حينئذ تسجر جهنم، فإذا أقبل الفيء فصلّ: **نوێژی سپێدە بکەو، پاشان لە نوێژان گەڕێ تا ڕۆژهەڵدێ و بەرزدەبێتەوە، چونکە خۆر لەنێوان شاخەکانی شەیتانەوە هەڵدێ، لەو کاتی بێبڕوایان سوژدەی بۆ دەبەن، ئەوجا نوێژ بکە نوێژ قبوڵە هەتا سێبەری ڕم ڕاست دەبێتەوە، پاشان واز لەنوێژ بێنە چونکە ئەو کات دۆزەخ سوردەکرێتەوە جا کە سێبەر گەڕاوە نوێژ بکە))**.[2]

**هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:**

((إذا اشتد الحرّ فأبردوا بالصلاة، فإن شدة الحر من فيح جهنم: **ئەگەر زۆرگەرما داهات، بە نوێژ خۆتان فێنك بکەنەوە، چونکە گەرمای توند لە هەڵمە دوکەڵی دۆزەخێیە))**.[3]

---

[1] (رواه البخاري ومسلم، واللفظ للبخاري)، **لە بێژەکەی موسلیمیشدا بەم شێوەیە:** ((ناركم التي يوقد ابن آدم...: **ئاگرەکەتان، ئەوەی ئادەمیزاد هەڵی دەکا..** )) رواه البخاري في صحيحه، كتاب بدء الخلق، باب صفة النار، فتح الباري: (٦/٣٣٠)، ورواه مسلم في كتاب الجنة، باب شدة حر النار: (٤/٢١٨٤)..

[2] رواه مسلم عن عمر بن عبسة عن النبي ﷺ.

[3] في الصحيحين عن أبي هريرة.

دۆزەخیش لە ڕۆژی قیامەتدا کاتێ پێشوازی دۆزەخییان دەکا، گڕدەگرێو ئاگری خۆش دەبێ:

﴿وَإِذَا الْجَحِيمُ سُعِّرَتْ، وَإِذَا الْجَنَّةُ أُزْلِفَتْ: ئەوکاتەی دۆزەخ گڕ دەگرێو دادەگیرسێ سووردەکرێتەوە. ئەوکاتەی بەهەشت نزیک خرایەوە لەخواناسان.﴾التكوير:١٢-١٣.

# جیباسی هەفتەم

## دۆزەخ دەدوێ‌و دەبینێ

هەرکەسێکی ئەو دەقانەی قورئان‌و سوننەت وەخوێنێ کە باسی دۆزەخ دەکەن، دەبینێ بەدیهێنراوێکە دەبینێ‌و، قسەدەکات و، گازاندان دەکا. لە قورئانی پیرۆزدا هاتوە کە دۆزەخ هەر لە دوڕا دۆزەخنشینان بەدی دەکا کە بۆ لای دێن، ئا لەو کاتەدا هاوارو دەنگی ترسناك دەر دەکا کە بەڵگەی تورەیی‌و قینیەتی لەو تاوانبارانە. خودای بەرز دەفەرموێ:

﴿إِذَا رَأَتْهُم مِنْ مَكَانٍ بَعِيدٍ سَمِعُوا لَهَا تَغَيُّظًا وَزَفِيرًا: کاتێ (ئەم ئاگرە) لە دورەوە ئەوان دەبینێ، دەنگی مەترسیدارو خەشم و قین و هەناسەی داخ لەدڵی دەبیستن.﴾ الفرقان: ١٢.

ئینی جەریر لە ئیبنی عەبباس دەگێڕێتەوە، دەڵێ: (پیاو هەیە بۆ دۆزەخ رادەکێشرێ، دۆزەخ دەچێتە باریەك‌و بەسەر یەكدا تەسك دەبێتەوە، خودای میهرەبان دەفەرموێ: ئەوە چیتە؟ دەڵێ: ئەوە خۆ لەمن پەنا دەدا. خودا دەفەرموێ: بەندەکەم بەرەڵلاکەن، پیاویش هەیە بۆ دۆزەخ رادەکێشرێ، دەڵێ: پەروەردگارم، ئەمن وا گومانم بە تۆ نەدەبرد، جا خودا دەفەرموێ: ئەدی گومانت چۆن بو؟ دەڵێ: کە بەزەییت دامبگرێ، دەفەرموێ: بەندەکەی من بەرەڵلاکەن. پیاویش هەیە بۆ دۆزەخ رادەکێشرێ، جا دۆزەخ وای لێ دەقیژێنێ وەکو هی هێستر بۆ حوشتر. هاوار و نێڵەیەکی دیکەشی لێ هەڵدەستێ هەمو کەسێك دەترسێنێ[1].

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((يخرج يوم القيامة عنق من النار، لها عينان تبصـــران، وأذنان تسمعان، ولسان ينطق، تقول: إني وكلت بثلاثة: بكل جبارٍ عنيد، وبكل من دعا مـــع الله إلها آخـــر، وبـــالمصورين: لە رۆژی قیامەتێ ملێك لە دۆزەخ دێتەدەر، دو چاوی هەیە دەبینێ‌و، دو گوێی هەیە دەبیستێ‌و، زمانێکیشی هەیە قسان دەکا. دەڵێ: من بەسێ

[1] ساق إبن كثير هذا الحديث في (النهاية) (٢/٢١) وقال: (وإسناده صحيح).

کەسان ئەسپاردە کراوم. بە هەمو زۆرداریکی لاملو، بەهەر کەسێکی هاوبەشێکی بۆ خودا دانابێو، بە وێنەکێشان))[1].

## جێباسی هەشتەم

## خەون دیتنی ئیبنی عومەر بە دۆزەخ

لە هەردو صەحیحاندا هاتوەو بێژەی ئێرەش هی بوخاریە کە ئیبنی عومەر گوتی: لە خەونێدا دو فریشتە هاتنە لام، هەریەکە خوترەیەکی ئاسنینی لە دەست بو، پاشان فریشتەیەکم گەیشتێ خوترەیەکی ئاسنینی بەدەستەوە بو، گوتیان: مەپەشۆکێ، باشترین پیاو تۆی، ئەگەر شەونوێژیشت زۆر بکردبا. جا بردمیان هەتا سەر رۆخی دۆزەخ رایانگرتم، دۆزەخ وەکو بیر پێچرابۆوەو، شاخی وەکو بیری هەبون، لە نێوان هەردو شاخدا فریشتەیەك راوەستابو خوترەیەکی ئاسنی پێبو. پیاوانی وای تێدا بو سەربەرەو ژێر بەزنجیران هەڵواسرابون، پیاوانێکی قورەیشیشم ناسینەوە، ئەوجا بەلای راستەوانان وەلایان نام. من ئەمەم بۆ حەفصە گێرایەوەو، ئەویش بۆ پێغەمبەر ﷺی گێراوە. فەرموی: ((إن عبدالله رجل صالح: بەڕاستی عەبدوڵڵا پیاوێکی چاکە))[2].

[1] خرج الإمام أحمد والترمذي من حديث الأعمش عن أبي صالح عن أبي هريرة ﷺ وصححه الترمذي؛ التخويف من النار، ص١٧٩، وأنظر جامع الأصول: (١٠/٥١٨)، وقال المحقق: إسناده حسن، وقال الترمذي: هذا حديث حسن صحيح غريب.

[2] التخويف من النار، لابن رجب: ص٥١.

## جێباسی نۆیەم

### ئایا هیچ کەسێك پێش قیامەت دۆزەخ بەچاوان دەبینێ؟

ئەوەی ئێمە دەیزانین، پێغەمبەر ﷺ لە ژیانیدا دۆزەخی دیتیە هەروەکو بەهەشتیشی دیتیە. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:

((إني رأيت الجنة، فتناولت منها عنقوداً، ولو أخذته لأكلتم منه ما بقيت الدنيا، ورأيت النار فلم أر كاليوم منظراً قط أفظع، ورأيت أكثر أهلها النساء: ئەمن بەهەشتم دیت، هێشویەکیشم لێ دەست دایێ، ئەگەر بمهێنابا هەتا دنیا مابا لێتان دەخوارد، دۆزەخیشم دیت، هەرگیز دیمەنێکی هێندی ئەو رۆژە ترسناکم نەدی، زۆرترینی دۆزەخیانیشم دیت ئافرەت بون))[1].

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((قد دنت مني الجنة، حتى لو اجترأت عليها لجئتك بقطاف من قطافها، ودنت مني النار حتى قلت: أي رب وأنا معهم؟ فإذا إمرأة تخدشها هرة. قلت: ما شأن هذه؟ قالوا: حبستها حتى ماتت جوعاً، لا هي أطعمتها ولا أرسلتها تأكل من خشاش الأرض: بەهەشتم هێندە لێ وەنێزیك کەوت، ئەگەر بیوێرابام هێشویەکم لە هێشوەکانی بۆ ئێوە دەهێنا، دۆزەخیشم هێندە لێ وەنێزیك کەوت تا گوتم: ئەی پەروەردگارم منیش لەگەڵیان دام؟ ئافرەتێکم تێدا دیت پشیلەیەك دابویە بەرچڕنوکان. گوتم: مەسەلەی وەی چیە؟ گوتیان، پشیلەکەی بەند کردبو تا لە برسان مرد، نەبەخۆی خۆراکی دەدایێو نەبەرەڵاشی دەکرد تا لە جڕوجانەوەری زەوی بخوا))[2].

لە شوێنێکی تریشدا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((إن النار أدنت مني حتى نفخت حرّها عن وجهي، فرأيت فيها صاحب المحجن، والذي بحر البحيرة وصاحب حمير، وصاحبة الهرة: دۆزەخم هێند لێ نێزیك کراوە تا هەراوەی گەرمیەکەی گەیشتە روم، گەورەی میحجەنم تێدا دیت لەگەڵ ئەوەی دەریاچەکەی لێدا لەگەڵ گەورەی حیمیەرو، پیرێژنی خاوەن

---

[1] في الصحيحين عن عبدالله بن عباس في صلاة الخسوف؛ مشكاة المصابيح: (٤٧٠/١).

[2] في صحيح البخاري عن أسماء؛ صحيح الجامع: (١٣٣/٤)، ورقم الحديث: (٤٢٤٧).

پشیلەکە))[1].

هەروەها لە جابیرەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((إنه عرضت علـــيّ الجنـــة والنار، فقربت مني الجنة، حتى لقد تناولت منها قطفاً، قصرت يدي عنه، وعرضت علـــي النـــار فجعلت أتأخر رهبة أن تغشاني، ورأيت إمرأة حميرية سوداء طويلة، تعذب في هرة لها ربطتها؛ فلـــم تطعمها، ولم تسقها، ولم تدعها تأكل من خشاش الأرض، ورأيت فيها أبا ثمامة عمر بن مالك يجـــر قصبة من النار: من بەهەشتو دۆزەخم پێ نیشان درا، جا بەهەشتم لێ نێزیك کراوە، تا دەستم بۆ هێشویەکی برد بەڵام دەستم نەیگەیشتێ، دۆزەخیشم پێ نیشان درا ومن بۆ پاش کشامەوە نەوەك وەخۆیم بگرێ، ئافرەتێکی حیمیەری رەشی درێژیشم دیت، لەبەر پشیلەیەك ئەشکەنجە دەدرا کەبەستابویەوەو، نەخۆراکی پێدابو نە خواردنەوە، لێنەگەڕابو لە جروجانەوەری زەویش بخوا، هەروەها ئەبو ثومامە عومەری کوڕی مالیکم تێدا دیت قەمیشێکی ئاگری رادەکێشا))[2].

پاش ئەوەی بەندەکانیش دەمرن، ئەگەر بڕواداربن لەبەرزەخێدا نشینگەی خۆیان لە بەهەشتێ نیشان دەدرێ. ئەگەر بێبڕواش بن نشینگەکانیان لە دۆزەخ نیشان دەدرێ، لەباسی بەرزەخدا ئەوەشمان رون کردەوە.

---

[1] في مسند أحمد عن المغيرة بن شعبة؛ صحيح الجامع: (٢/١٧١)، ورقم الحديث: (١٩٦٨).

[2] صحيح الجامع؛ (٢/٢٩٨)، ورقم الحديث: (٢٣٩٤).

## جێباسی دەیەم

### کاریگەری دۆزەخ لەسەر دنیاو دنیانشینان

بوخاری لە صەحیحەکەیدا لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ فەرموی: ((إشتكت النار الى ربها، فقالت ربّ أكل بعضي بعضاً، فأذن لها بنفسين، نفس في الشتاء ونفس في الصيف، فأشدّ ما تجدون من الحر، وأشدّ ما تجدون من الزمهرير: دۆزەخ گازاندەی لە لای پەروەردگاری کردو گوتی: هێندێکم هێندێکی خواردم (خۆم خواردەوە)، جا خودا مۆڵەتی دو پشییانیدا، پشییەك لە زستانێ داو پشییەك لە هاوینێدا. ئەوپەڕی گەرمی لە هاویندا دەیبینین لە گەرمی دۆزەخەو، ئەوپەڕی ساردی زستانێ لە ساردی زەمهەریرە)).

هەروەها بوخاری لە ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((ابردوا بالصلاة، فإن شدة الحر من فيح جهنم: خۆتان بە نوێژێ فێنك کەنەوە، چونکە توندی گەرما لە هەراوەی گەرمی دۆزەخەوەیە))[1].

[1] بۆ ئەم دو فەرمودەیە بڕوانە: صحيح البخاري، كتاب بدء الخلق، باب صفة النار وأنها مخلوقة، فتح الباري: (٦/٣٣٠)، وعزاهما في جامع الأصول: (١٠/٥١٧) الى البخاري ومسلم والترمذي.

## بەندی چارەم

## دۆزەخ نەمرەو لە نێو ناچێ

دۆزەخ تا سەرەو نەمرە، نەتونا دەبێو نە لە نێو دەچێ، طەحاویش هەروەك لەئاقیدەكەیدا دەڵێ: (بەهەشتو دۆزەخ دو بەدیهێنراون، نە تونا دەبنو نە لە نێو دەچن)[1]، ئینی حەزمیش یەكدەنگی زانایانی لەم بارەوە راگواستوە، هەروەك لە كتێبی (الملل والنحل)دا دەڵێ: (بێجگە لە جوهمی كوڕی صەفوان تێكڕای كۆمەڵانی ئوممەت كۆكو هاودەنگن كە بەهەشتو بەهرەكانیو، دۆزەخو ئەشكەنجەكانی لە نێو ناچنو تونانابن)[2]. هەروەها لە كتێبی (مراتب الإجماع)یشدا دەڵێ: (... دۆزەخ هەقەو، خانەی ئازار و ئەشكەنجەیەو توناش نابێو، خەڵكەكەشی تونانابنو بێكۆتایە)[3].

ئەو دەقانەی بەڵگەی هەمیشەیی ئاگریشن گەلێك زۆرن. لەبواری توژینەوەكەشدا زۆرانیان لێ باس دەكەین، هێندەش كۆتایە كە خودا بە (خانەی نەمری) ناوی بردوە.

رێڕەوی ئەهلی سونەتو جەماعەت وایە كە دۆزەخ تاسەرەو هەمیشەییەو لە نێو ناچێو، خەڵكەكەشی بە نەمری تێدا دەمێننەوە، لە یەكخواپەرستە یاخییەكانیش بترازێ كەسی لێوە دەرناچێ، هەرچی بێبڕواو هاوبەشدانەرەكانیشن تاهەتایی تێدا زیندون و نامرن.

---

[1] شرح الطحاوية: ص٤٧٦.
[2] الملل والنحل، لإبن حزم: (٤/٨٣).
[3] مراتب الإجماع: ص١٧٣.

## ئەوانی دەڵێن دۆزەخ لەناو دەچێ

هەفت کۆمەڵ هەن لەم مەسەلەیەدا دەگەڵ ئەهلی هەق ناکۆك‌و جیاڕان:

١- **جوهمیەکان/** کە دەڵێن دۆزەخ لەناو دەچێ‌و بەهەشتیش هەر لەناو دەچێ، ئەحمەدی پێشەوا لە دواینی کتێبی (الرد على الزنادقة)دا دەگێڕتەوە کە بۆچونی جوهمییان وایە دۆزەخ‌و بەهەشت لەناو دەچن، هەرلەوێشدا وەڵامیان دەداتەوەو ئەو دەقانە دەهێنێتەوە کە بەڵگەن بۆ لەناوچونیان.

٢- **خەواریج‌و موعتەزیلەکان/** دەڵێن: هەرکەسێکی بچێتە دۆزەخ، تاهەتایێ بە نەمری تێدا دەمێنێتەوە، هەرچەند ئەو کەسانە لە یەکخواپەرستانیش بن، نهێنی ئەم گۆتنەش لەوەدایە کە خەواریج موسڵمانان بەگوناهان کافر دەکەن‌و، هەرکەسێکی گوناهێکی ئەنجام دابێ، کافرەو بەزیندویی‌و نەمری بەهەمیشەیی لەئاگری دۆزەخدا دەبێ. موعتەزیلەش وا دەبینن هەرکەسێکی لە دنیادا گوناهێکی کرد پایەیەکی لە نێوان هەردولایان دا دەبێ‌و، نەئیماندارەو نەکافر، جا لە دنیادا حوکمەکانی ئیسلامی لەسەر بەرپا دەکەن، بەڵام لە دواییندا تاهەتایێ لە ئاگری دۆزەخدا دەبێ، ئێمەش گەلێك دەقمان هاوردون کە بەڵگەی لە دۆزەخ دەرچونی ئەهلی تەوحیدن.

٣- **جولەکەکان/** کەوا هەڵدەبەستن گوایە ئەمان بۆ کاتێکی دیاریکراو لە دۆزەخدا ئەشکەنجە دەدرێن، پاشان خەڵکی دی جێیان دەگرنەوە، بەڵام خودای گەورە هەڵبەستەکەی ئەوانی وەدرۆخستۆتەوەو قسەکەی بەسەردا داونەتەوە هەروەك دەفەرموێ:

﴿وَقَالُوا لَنْ تَمَسَّنَا النَّارُ إِلاَ أَيَّامًا مَعْدُودَةً قُلْ أَتَّخَذْتُمْ عِنْدَ اللَّهِ عَهْدًا فَلَنْ يُخْلِفَ اللَّهُ عَهْدَهُ أَمْ تَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ، بَلَى مَنْ كَسَبَ سَيِّئَةً وَأَحَاطَتْ بِهِ خَطِيئَتُهُ فَأُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ: وگوتیان: لە چەند ڕۆژێك بترازێ هەرگیز ئاگری دۆزەخمان ناگاتێ، بڵێ: ئایا بۆ ئەم قسەیەتان پەیمانێکتان لای خودا وەرگرتوە؟ ئەگەر وابوایە دڵنیا دەبون کە خودا هەرگیز لە بەڵێنی خۆی لانادا، یا شتێك دەدەنە پاڵ خودا کە زانستتان لێی نیە. دیارە هەرکەس خۆی خراپە بکا و

**خراپەکـەی دەوری دابـێ، ئەوانـە ئـەهلی دۆزەخـن، بـۆ هەمیشـە لـە نێـو ئـاگر دەمێننەوە﴾**البقرة: ٨٠-٨١.

﴿أَلَمْ تَرَى إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيبًا مِنَ الْكِتَابِ يُدْعَوْنَ إِلَى كِتَابِ اللَّهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ يَتَوَلَّى فَرِيقٌ مِنْهُمْ وَهُمْ مُعْرِضُونَ، ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا لَنْ تَمَسَّنَا النَّارُ إِلاَّ أَيَّامًا مَعْدُودَاتٍ وَغَرَّهُمْ فِي دِينِهِمْ مَا كَانُوا يَفْتَرُونَ: **خۆ تۆ دیتت، ئەو کەسانەی کە لە کتێبی ئێمەدا بەشێکیان پێگەیشتبو. خۆیان گوتیان: بەهەر حوکمێ خودا بیدا ئێمە رازین، کەچی هیندێک لەوانـە پێـی رازی نـەبون، ئـەوان بۆیـە وایـان دەکـرد چونکـە دەیانگۆت: ئێمە ئەگەر بشمانخەنە دۆزەخەوە چەند رۆژێك پتر پێناچێ، رزگاردەبین؛ بەو درۆیە بۆ دینی خۆیان لەخۆبایی کردبون.﴾** آل عمران: ٢٣-٢٤.

**ئیبنی جەریر لە تەفسیرەکەیدا لـە ئیبنی عەبباسـی[1] راگواسـتوە کـە لـە راڤـەی ئایەتەکەی سورەتی (بەقەرە)دا دەڵێ: (جولەکەی دوژمنانی خودا گوتیان: خودا هەر بۆ حەلاڵکردنی سوێند دەمانخاتە دۆزەخ، لەباتی ئەو رۆژانی گۆلکمان تێدا پەرستبو: چل رۆژان، جا کە ئەو رۆژانەش رەت دەبن، ئەشکەنجەمان لەسەر هەڵدەگرێ).**

**هەروەها ئیبنی جەریر لە (السدی) هێناویە، دەڵێ: ( جولەکە گوتیان: خودا چل شەوان دەمانخاتە دۆزەخ، جا کە ئاگر گوناهەکانمان هەڵدەلوشێ، بانگدەرێك بانگ دەکا: هەمو خەتەنەکراوێك لەنەوەی بەنی ئیسرائیل دەربێنن، بۆیەش فەرمانمان دراوەتێ خۆ خەتەنە کەین، دەڵێن: جا کەسمان لە نێوئاگردا جێ ناهێڵن و هەمومان دەردێنن).**

**هەروا: لە ئیبنی عەبباسەوە هێناویە، دەڵێ: (وا باسکراوە کە جولەکە لە تەوراتیان دیتوە وا نوسراوە: نێوان هەردو بەری دۆزەخ چل ساڵە رێیە تا دەگاتە داری ژەقنەبوت کە لە بنکی دۆزەخدا جێگیرە.**

**ئیبنی عەبباس دەیگوت: دۆزەخ داخکەرو هەڵقرچێنەرەو، داری ژەقنەبوتی تێدایە، جا دوژمنانی خودا وایان هەڵبەستاوە کە بێجگە لەو ژمارەی لە کتێبی خۆیاندا دیوە چەند رۆژێکی دیاریکراو هەیە.**

---

[1] تفسیر إبن جریر: (١/٣٨١).

ئیبنی جەریر دەڵێ: (لێرەدا مەبەست ئەو رێ رۆیشتنەیە کە لە بنکی دۆزەخ بەکۆتا دێ. جا گوتیان: ئەگەر ئەو ژمارە رۆژانەیە بەسەر چون ئاکام(اجل) دوایی دێ، ئەشکەنجەو ئازار نامێنێ و دۆزەخیش دەڕواو تونادەبێ. ئەو ئایەتە دەگرێتەوە کە دەفەرموێ:

﴿ وَقَالُوا لَنْ تَمَسَّنَا النَّارُ إِلاَّ أَيَّامًا مَعْـدُودَةً..: لەچەند رۆژێکی دیاریکراو بترازێ ئاگر نامانگرێ.﴾ البقرة: ٨٠.

جا لێرەدا مەبەستیان ئاکامە. ئیبنی عەبباسیش دەڵێ: (کە لە دەروازەی دۆزەخێوە وەژور دەکەون بەنێوئازارو ئەشکەنجاندا دەڕۆن، تاکو لە دوایین رۆژ لە رۆژە ژمێردراوەکان دەگەنە داری ژەقنەبوت، ئەوجا ئاگرەوانی سەقەر پێیان دەڵێ: ئێوە واتان هەڵبەستابو لەچەند رۆژانێکی دیاریکراو بترازێ ئاگرتان بەرناکەوێ. ئەوە ئەو رۆژە ژمێردراوانە بەسەرچون ئێوەش تا سەر دەمێننەوە، جا بەهەڵکشان بەجەهەننەمێ هیلاك دەبن)[1].

٤- **گۆتەی ئیبنی عەرەبی طائی کە پێشەوای حلولیەکانە**، وای هەڵبەستاوە گوایە دۆزەخییەکان ماوەیەك تێیدا ئەشکەنجە دەدرێن، دواتر بە سروشت دەبنە ئاگراویو چێژ لە دۆزەخ وەردەگرن چونکە لەگەڵ سروشتییان کۆك دەبێ و رادێ، ئیبنی حەجەر لە (الفتح)دا دەڵێ: (ئەمە گۆتەی هەندێك لە سۆفیە زەندیقەکانە)[2].

٥- گۆتەی ئەوانی دەڵێن دۆزەخی لە دۆزەخ دێنە دەرێو ئەویش وەك خۆی دەمێنێتەوەو تاهەتایێ تونا نابێ.

٦- **گۆتەی ئەبو هوذەیلی عەللاف** کە یەکێکە لە پێشەوای موعتەزیلانو وای بۆ دەچێ کە ژیانی دۆزەخییان تونادەبێو، هەمو دەبنە بێ گیانو ناجوڵێنو، هەست بە ئێشو ژانان ناکەن، بۆیەش وا دەڵێ چونکە رای وایە کە روداوی بێ کۆتا نیە، کە بە هێندێك پێوەری عەقڵی پوچ، پێچەوانەی بەڵگە راشکاو و برەرو سەلماوەکان بۆتەوە.

٧- ئەوانی دەڵێن: هەروەك لە فەرمودانذا هاتوە هەرکەسێکی خودا بیەوێ لە دۆزەخێی دەردێنێ، ئەوجا ماوەیەك دەیهێڵێتەوەو، پاشان لەنێوی دەبا، چونکە خودا

---

[1] تفسير إبن جرير: (١/٣٨١).

[2] فتح الباري: (١١/٤٢١).

ئاكامێكی بۆ كۆتاهاتنی دۆزەخ داناوە[1].

ئیبنی تەیمیەی زانای ناودارو شێخی ئیسلام، میهرو بەزەیی خودای بەسەردا برژێ‌و بیبورێ، بەلای دوایین گۆتەدا شكاوەتەوە، هەروەك ئیبنولقەییمی قوتابیشی هەمان بۆچونی هەبوە بەرمیهری خوا كەوێ.

زاناكانیش یەك بە دوای یەك كتێبیان نوسیون بۆ رونكردنەوەی هەڵەی ئەم بۆچون‌و راڕەوە. ئیبنو حەجەری عەسقەلانی پاش گێڕانەوەی ئەم گۆتەیە، دەڵێ: (هەندێك لە پاشینەكانیش بەلای ئەم گۆتەیەدا چون‌و، بە گەلێك شێوازو بۆچونانیش سەریان خستوە، بەلام ئەمە رێڕەوێكی گەندەو بەسەر خاوەنەكەیدا دەدرێتەوە، سوبەكی گەورەش بەدرێژی بەلێزانی داهێنراوی ئەم بۆچونەی رونكردۆتەوە)[2].

ئەو كتێبەی ئاماژەشی بۆ دەكا بریتیە لە (الإعتبار ببقاء الجنة والنار) كە تەقیەددین عەلی كوڕی عبدالباقی سوبەكی شافیعی نوسیویەتی‌و لەساڵی (٧٥٦)یشدا دوا كۆچی كردوە.

صیددیق حەسەن خانیش دەڵێ: (شێخی زانا: مەرعی كەرمی حەمبەلی كتێبێكی نوسیوە بەنێوی (توفيق الفريقين على خلود أهل الدارين)، جا لە دەروازەیدا نامەیەك بۆ پێشەوا موحەممەدی كوڕی ئیسماعیلی ئەمیرو، نامەیەك بۆ زانای كۆشیار(مجتهد) موحەممەدی كوڕی عەلی شەوكانی، وای گوتوە كە پوختەكەی ئەوەیە بەهەشت‌و دۆزەخ هەر دەمێنن‌و خەڵكانیشیان تێدا نەمرن)[3].

---

[1] بۆ ئەم جێباسە ئەم سەرچاوانە بەسەر بكەوە: شرح الطحاوية: ص٤٨٣، شرح عقيدة السفاريني: (٢/٢٣٤)، يقظة أولي الإعتبار لصديق حسن خان: ص٤١، فتح الباري: (١١/٤٢١).

[2] فتح الباري: (١١/٤٢٢).

[3] يقظة أولي الإعتبار، لصديق حسن خان: ص٤٢، ورسالة الصنعاني طبعها المكتب الإسلامي ببيروت، وقد حققها وكتب لها مقدمة ضافية الشيخ ناصر الدين الألباني فأجاد.

لێرەشدا هەندێك مەسەلە هەن پێمان خۆشە رونیان کەینەوە:

**یەکەم/** ئەمە گۆتەیەکی بەتاڵە ئەگەرچی دو زانای بەرزی ئیسلامیش وای بۆ چوبن. چونکە ئیبنی تەیمیەی شێخی ئیسلام و ئیبنولقەییمی قوتابی وایان فێرکردوین: دەبێ خۆشویستنی هەق وەپێش خۆشویستنی پیاوان بخەین. هەمو ئەو دەقە زۆرانەی بەڵگەی هەرمانی دۆزەخن، بەڵگەن بۆ گەندیو پوکی ئەم بۆچونە. ئەو دەقانەش لە روی چەسپاویو بەڵگاتیەوە گردەبڕن، قسەی ئەوانەشمان هێنایەوە کە کۆرایی هەمیشەیی نێو دۆزەخییان راگواستوە.

**دوەم/** بەهۆی ئەم گۆتەیانەوە بەهیچ شێوەو بارێك هەڵشاخان بە ئیبنی تەیمیەو ئیبنولقەییمی قوتابی دروست نیە. هەروەك بەم هۆیەوە کۆمەڵێك بە بێبڕواو هێندێك بە فاسیقیان داناون، ئەمەش هەموی ناڕاستو نادروستە. چونکە ئەو دو زانایە دوکۆشیاری خاوەن پاداشتن، ئەگەر جیا لە گۆتەی خۆیان هەقیان زانیبا شوێنی دەکەوتن، بانگەشەی ئەمەش کە هەر یەکێکی لەم جۆرە بابەتە رای جودا بێ بەکافر دادەنرێ، ئەمە سەردەکێشێ بۆ کافرکردنی ئەو پێشەوایانەی ئوممەت، کە هیچ مشتومڕێك لەئاست پێشەوایەتیەکەیان نیە. هەروەك عومەری کوڕی خەطاب‌ﷺ کە وایٚ بۆ دەچو ئەگەر گەشتیار ئاوی دەست نەکەوت نەتەیەممومم دەکاو نە نوێژ، دیارە هەمو ئوممەتیش بە پێچەوانەی ئەمە یەك دەنگن، مالیکی پێشەواش رای وایە کە ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ .﴾ ئایەتێك نیە لە قوڕئانی پیرۆز، کەچی ئوممەت لەسەر ئەوەیە هەرچی لە دوتویی قوڕئانێ دابێ قوڕئانە. کۆمەڵانێکیش دەڵێن بڕوا زیادو کەم نابێ. هەرچەندە ئەمە لە قوڕئانو سوننەت بەڕاشکاوی رۆنو چەسپاوەو کۆرابونیشی لەسەر جەمبوە.

**سێیەم/** پێویستە ئاگادار بین کە ئیبنی تەیمیەو ئیبنولقەییم گۆتەیان هەن کە دۆزەخ تونا نابێ. لە (مجموع فتاوي شيخ الإسلام)دا لەوەرامی پرسیارێك وا هاتوە: (پێشینەو پێشەواکانی ئوممەتو تێکڕای پەیڕەوانی سوننەتو جەماعەت یەك دەنگنو کۆکن کە بەدیهێنراوی وا هەیە بە هەموەکی لە نێو ناچێو تونانابێ، وەکو بەهەشتو دۆزەخو عەرشو هی دیکەش. لە کۆمەڵێکی بیدعەسازی ئەهلی کەلامیش

بترازێ کەسێك نەیگوتوە تێکڕای بەدیهێنراوەکان تونا دەبن، وەکو جوهمی کوڕی صەفوان و هاوڕایانی لە موعتەزیلەکان و هاوشێوەکانیان. ئەمەش گۆتەیەکی بەتاڵ و پوچەو پێچەوانەی کتێبی خوداو فەرمودەی پێغەمبەرەکەی و کۆڕابونی پێشینەو پێشەواکانی ئوممەتە)[1].

جا ئەگەر بارەکە وابێ و دو گۆتەیان هەبێ. دروست نیە وادانێین رایان لەگەڵ تونابون و نەمانی دۆزەخ بوە، ئەگەر نەشزانین کە ئەوە رای کۆتاییان بوە. ئەگەر دوا قسەوڕاش نەزانرا چاتر وایە هەڵوەستە بکەین و هیچ کام لە راڕەوەکانیان وەپاڵ نەدەین.

چوارەم/ ئەو بەڵگانەی شێخی ئیسلام و ئیبنولقەییم لە بارەی تونابونی دۆزەخ بەبیانویان گرتون، هێندێکیان راست نین، ئەوانەی راستیشن راشکاو نین، بەڵکو دەکرێ بە بارێکی جیا لە تونابونی دۆزەخدا بخرێ و، وا لێکدرێتەوە کە مەبەست تونابونی ئەو ئاگرەیە کە یەکخواپەرستە یاخییەکانی تێدا دەبن. صەنعانی لەو کتێبەیدا وەڵامی ئیبنی تەییمەو، ئیبنولقەییمی تێدا دەداتەوە، وتوێژی لە بابەت ئەو بەڵگانە سازداوەو، رونی کردۆتەوە ئەو بەڵگانە لەسەر بۆچونەکانی وی راناوەستن. ئەو کتێبەشی ناوناوە بە: (رفع الأستار لإبطال أدلة القائلين بفناء النار)[2].

قورطوبیش لەوانەیە کە لە کتێبی (التذكرة)دا لەم مەسەلەیە دواوە، ئەو دەقانەشی هاوردون کە بەڵگەی هەرمانی بەهەشت و دۆزەخن و، باس لەوە دەکەن کە مردن لەنێوان بەهەشت و دۆزەخدا سەردەبڕدرێ، پاشان دەگوترێ: (هۆ بەهەشتیەکان ئیتر هەرمانەو مردن نەما، هۆ دۆزەخیەکان ئیتر هەرمانەو مردن نەما). پاشان دەڵێ: (لەگەڵ ئەوەی ئەو فەرمودانە صەحیحن لەبارەی نەمری و هەرمانی ئەهلی بەهەشت و دۆزەخ تیایاندا. نە بۆ مەبەستێکەو نە تا ئاکامێکە، لەسەر بەردەوامی و سەرمەددا دەمێنن، دور لە مردن و لە ژین و لە هەسانەوەو لە رزگاربون)[3]. پاشان وەڵامی ئەوانەی دایتەوە کە دەڵێن دۆزەخ تونادەبێ، ئەوەشی رونکردۆتەوە کە ئەو ئاگرەی تونا دەبێ

---

[1] مجموع فتاوي شيخ الإسلام: (١٨/٣٠٧).

[2] نوسینگەی ئیسلامی لە بەیروت وەچاپی گەیاندوە.

[3] التذكرة للقرطبي: ص٤٣٦.

**ئەوەیانە کە یەکخواپەرستە یاخییەکانی تێکەوتون، دەڵێ: (هەر کەسێك بڵێ: ئەوان لە دۆزەخ دەردەچن‌و، سەرجەم دۆزەخیش بە خرین‌و خاوی دەمێنێتەوەو، تونادەبێ‌و لەنێو دەچێ، ئەو کەسە سنوری مەعقوڵی بەزاندوەو، پێچەوانەی ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی‌و، ئەهلی سوننەت‌و پێشەوا دادگەرەکان لەسەری کۆڕان.. بەڵکو چینی سەروی دۆزەخ خاڵی دەکرێ کە یاخیەکانی ئەهلی تەوحیدی تێدایە، ئەوچینەی تەڕەتورەی لەسەر رۆخدا دەڕوێ[1]، فەضلی کوڕی صاڵحی مەعافیری دەڵێ: رۆژێك لەلای مالیکی کوڕی ئەنەس بوین، پێی گوتین بەجێم بێڵن بڕۆن، کاتی شێوان هاتینەوە لای، گوتی: بۆیە بە ئێوەم گۆت جێم بێڵن چونکە پیاوێك بۆ پرسیار مۆڵەتی لێ خواستبوم. گوایە لە شامەوە هاتوەو گوتی: ئەی ئەبو عەبدوڵلا، لەباری تەڕەتورە خواردن چ دەڵێی؛ چونکە وای باس دەکەن کە لەسەر لێواری دۆزەخ دەڕوێ؟ منیش گوتم: چی تێدا نیە[2]. گوتی: بەخوات دەسپێرم‌و سلاوت پێشکەش دەکەم. هەروەها لە عەبدوڵلای عەمری کوڕی عاصەوە هاتوە، دەڵێ: کاتێك بەسەر دۆزەخ دادێ با دەروازەکانی لێك دەدەن، کەسیشی تێدا نەماوە، مەبەستی یەکخواپەرستەکانە[3]. بەم شێوەیە بە مەوقوفی لە قسەی عەبدوڵلای کوڕی عەمرەوە دەیگێڕێتەوەو، چ باسی پێغەمبەرﷺی تێدا نیە، هاوشێوەی ئەویش وەك راوبۆچون نابێژرێ، کەواتە مەرفوعە)[4].**

---

[1] ئەم گۆتەیە بەراست دانانرێ‌و نەچەسپاوە. وەك بڵێی بێژەری وای مەبەست بێ کە ئەو ئاگری یوکخواپەرستە یاخییەکانی تێدەهاوێژرێ هێند کزە روەکی لە لێواری دەڕوێ.

[2] ئەگەر ئەم چیرۆکە راست بێ؛ کابرای خاوەن پرسیار خۆی زۆر ئەرکبار کردوە بۆ رونکردنەوەی مەسەلەیەك کە خۆی یەکجار ئاشکرایە.

[3] ذكر الخطيب أبوبكر أحمد رحمه الله، وذكر أبوبكر البزار عن عمرو بن ميمون عن عبدالله بن عمرو بن العاص.

[4] التذكرة للقرطبي: ص٤٣٧.

## بەندی پێنجەم

## دۆزەخنشینان و تاوانەکانیان

### جیباسی یەکەم

### ئەوانی تاهەتایێ لە دۆزەخدا دەمێننەوە

#### خوازگەی یەکەم

#### ناساندنیان

ئەو دۆزەخنشینانەی تاسەر تێیدا دەمینێنەوەو، نەلێی دەرباز دەبن و نە لەنێو دەچن؛ بریتین لە بێبڕواو موشریکەکان. خودای بەرز دەفەرموێ:

﴿وَالَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَاسْتَكْبَرُوا عَنْهَا أُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ: کەسانێکی نیشانەکانی ئێمە وەدرۆبخەنەوەو لەئاستیان خۆبەزل بزانن، ئەوانە دۆزەخین و بە هەمیشەیی لەوێ دەمێننەوە﴾ الأعراف:٣٦.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿لَوْ كَانَ هَؤُلَاءِ آلِهَةً مَا وَرَدُوهَا وَكُلٌّ فِيهَا خَالِدُونَ. واتە: ئەگەر ئەوانە خوا بوایەن نەدەچونە نێو ئاگری دۆزەخ و ئێستا هەمو -تا هەتایە- هەر لەوێدان.﴾ الأنبياء:٩٩.

و دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ الْمُجْرِمِينَ فِي عَذَابِ جَهَنَّمَ خَالِدُونَ: بەڕاستی تاوانباران تاهەتایی لە ئەشکەنجەی دۆزەخێدا دەمێننەوە﴾ الزخرف:٧٤.

هەمدیس دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا لَهُمْ نَارُ جَهَنَّمَ لَا يُقْضَى عَلَيْهِمْ فَيَمُوتُوا وَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُمْ مِنْ عَذَابِهَا..: بۆ ئەوانەش کە لەخودا حاشایان کرد، ئاگری دۆزەخ هەیە، نە ڕێی مردنیان پێ دەدەن، نە جەزرەبەی دۆزەخیان لەسەر سوك دەکرێ﴾ فاطر:٣٦.

و دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا أُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ: ئەو کەسانی بێ باوەڕ بون و نیشانەکانی ئێمەیان وەدرۆخستەوە، ئەوانە

دۆزەخین و تاهەتایی لەوێ دەمێننەوە﴾ البقرة:٣٩.

ودەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا وَمَاتُوا وَهُمْ كُفَّارٌ أُولَئِكَ عَلَيْهِمْ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ، خَالِدِينَ فِيهَا لاَ يُخَفَّفُ عَنْهُمُ الْعَذَابُ وَلاَ هُمْ يُنظَرُونَ: بەڕاستی ئەو کەسانەی کافر بون و لەم حاڵەشدا مردن ئەوانە نەفرەتی خواو فریشتان و تێکڕای خەڵکیان لەسەرە تاهەتا تێیدا دەمێننەوە، نە ئەشکەنجەو دەردیان سوك دەبێ و نە وچانیشیان پێ دەدرێ.﴾ البقرة:١٦١-١٦٢.

هەروەها خودای بەرز دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ يَعْلَمُوا أَنَّهُ مَنْ يُحَادِدِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَأَنَّ لَهُ نَارَ جَهَنَّمَ خَالِدًا فِيهَا ذَلِكَ الْخِزْيُ الْعَظِيمُ: بۆ دەبێ نەیانزانیبێ هەرکەسێکی دژی خودا و پێغەمبەری خودا بوەستێ، تاهەتایە لە ئاگری دۆزەخ دایە کە ریسوابونی مەزنە﴾ التوبة:٦٣.

ودەفەرموێ: ﴿مَا كَانَ لِلْمُشْرِكِينَ أَنْ يَعْمُرُوا مَسَاجِدَ اللَّهِ شَاهِدِينَ عَلَى أَنفُسِهِمْ بِالْكُفْرِ أُولَئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ وَفِي النَّارِ هُمْ خَالِدُونَ: نوێژگەی خودا ئاواکردن بۆ بتپەرستان نەشیا. خۆیان ئێژن خوا ناناسین؛ هەرچی دەیکەن فیڕۆ دەچێ و هەتاسەر لە دۆزەخ دەبن.﴾التوبة:١٧.

جا لەبەر ئەوەی تا سەر تێیدا نەمرن خودا وا وەسفی ئازاری دۆزەخی فەرموە کە ئەشکەنجەیەکی بەرپایە: واتە نابڕێتەوە، هەروەك ئەو ئەشکەنجەیەی داوەتە پاڵ نەمری. کە دەفەرموێ:

﴿يُرِيدُونَ أَنْ يَخْرُجُوا مِنْ النَّارِ وَمَا هُمْ بِخَارِجِينَ مِنْهَا وَلَهُمْ عَذَابٌ مُقِيمٌ: کۆشش دەکەن لەناو ئاگر دەربچن، بەڵام هەرچی هەوڵ بدەن بێبەهرەیە و هەرگیز ناتوانن دەرکەون. ئازارێکی بێبڕانەوەیان دەبێ.﴾ المائدة:٣٧.

و دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ قِيلَ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا ذُوقُوا عَذَابَ الْخُلْدِ هَلْ تُجْزَوْنَ إِلاَّ بِمَا كُنْتُمْ تَكْسِبُونَ: پاشان بە ستەمکاران دەگوترێ: ئەشکەنجەیەکی هەمیشەیی بچێژن، سزاکانتان هەر لە پای کردەوانتانە﴾یونس:٥٢.

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: ((يدخل أهل الجنة الجنة، وأهل النار النار، ثم يقوم مؤذن بينهم: يا أهل النار لا موت، ويا أهل الجنة لا موت، خلود: بەهەشتی دەچنە بەهەشتی و

ـۆزەخیش دەچنە دۆزەخ، پاشان بانگوێژێك لە نێوانیاندا دەڵێ: هۆ دۆزەخنشینان مردن نیە، هۆ بەهەشتنشینان مردن نیە، بەڵكو هەرمانو نەمریە))[1].

لە ئەبوهورەیرەش دەگێڕنەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((یقال لأهل الجنة: یا أهـــل حنة لا موت، ولأهل النار: یا أهل النار خلـــود لا مـــوت: بە بەهەشتییان دەگوترێ: ئەی ـەهەشتیەكان چیدی مردن نیە، بە دۆزەخییانیش دەگوترێ: ئەی دۆزەخییەكان ئیدی ـەرمانەو چیدی مردن نیە))[2].

ئەمەش دوای سەربڕینی مردن دەگوترێ، هەروەك لە فەرمودەی ئیبنی عومەر ـەلای بوخاریدا هاتوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((إذا صار أهل الجنة الى الجنة، وأهل النار الى النار، جيء بالموت حتى يجعل بين الجنة والنار، ثم ـذبح، ثم ينادي منادي: يا أهل الجنة لا موت، يا أهل النار لا موت، فيزداد أهل الجنة فرحـــاً الى فرحهم، ويزداد أهل النار حزناً الى حزنهم: كە بەهەشتی چونە بەهەشتو، دۆزەخی چونە دۆزەخ، مردن دێنن لە نێوان بەهەشتو دۆزەخ رایدەگرن، پاشان سەردەبڕدرێو، بانگوێژێك بانگ دەكا: ئەی ئەهلی بەهەشت مردن نیە، ئەی ئەهلی دۆزەخ مردن نیە، جا بەهەشتی چەند شادن زێتر شاد دەبن. دۆزەخیش چەند خەمبارن پتر خەمبار دەبن))[3].

لە ئەبوسەعیدەوە هاتوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((یجاء بالموت یوم القیامة كأنـــه كبش أملح، فیوقف بین الجنة والنار، فیقال: یا أهل الجنة، هل تعرفون هذا؟ فیشرئبون وینظـــرون، ویقولون: نعم هذا الموت، قال: ویقال: یا أهل النار، هل تعرفون هـــذا؟ فیشـــرئبون وینظـــرون، ویقولون: نعم هذا الموت، قال فیؤمر به فیذبح. قال: ثم قال: یا أهل الجنة خلود فلا موت، ویـــا أهل النار خلود فلا موت: لە رۆژی قیامەت مردن بە شێوەی بەرانێكی بەڵەك دەهێننو لەنێوان بەهەشتو دۆزەخ رایدەگرن، جا دەگوترێ: ئەی بەهەشتیەكان، ئەمە دەناسن؟ ئەوانیش مل هەڵدەكێشنو تێی دەڕوانن و دەڵێن: بەڵێ ئەمە مردنە. فەرموی دەشگوترێ: ئەی دۆزەخیەكان، ئەمە دەناسن؟ فەرموی: جا مل هەڵدەكێشنو تێی

---

[1] في صحيح البخاري عن إبن عمر ﷺ، كتاب الرقاق، باب يدخل الجنة سبعون ألفاً بغير حساب، فتح الباري: (١١/٤٠٦).
[2] هەمان سەرچاوە.
[3] صحيح البخاري، كتاب الرقاق، باب صفة الجنة والنار، فتح الباري: (١١/٤١٥).

دەڕوانن و دەڵێن: بەڵێ: ئەمە مردنە، فەرمووی: جا فەرمان دەدرێ سەربڕێ. فەرمووی: جا دەگوترێ: هۆ ئەهلی بەهەشت ئیدی نەمرییەو چیدی مردن نیە، هۆ ئەهلی دۆزەخ ئیدی نەمرییەو چیدی مردن نیە)). دەڵێ: جا پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

﴿وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الْحَسْرَةِ إِذْ قُضِيَ الأَمْرُ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ وَهُمْ لاَ يُؤْمِنُــونَ: لەو ڕۆژی داخ و کەسەریان بترسێنە، کاتێ کار لەکار دەترازێ؛ کەچی ئەوان هەر بەخۆیان نەزانیوەو خۆیان لەباوەڕ بواردوە﴾ مريم:٣٩[1].

تیرمیذی بە مەرفوعی لە ئەبوسەعیدی خودری دەگێڕێتەوە: ((إذا كان يوم القيامة أتي بالموت كالكبش الأملح، فيوقف بين الجنة والنار، فيذبح وهم ينظرون، فلو أن أحداً مات فرحــــاً لمات أهل الجنة، ولو أن أحداً مات حزناً لمات أهل النار: کە ڕۆژی قیامەت دادێ، مردن وەکو بەرانێکی بەڵەك دەهێنرێ و، لە نێوان بەهەشت و دۆزەخ ڕادەگیرێ. سەری دەبڕدرێ، ئەوانیش تەماشا دەکەن، جا ئەگەر لەودەمی کەسێك لە شادیان بمردبا، بەهەشتی دەمردن، ئەگەر کەسێکیش لە دڵتەنگیدا بمردبا، دۆزەخی دەمردن))[2].

## خوازگەی دووەم

### دۆزەخ: نشینگەی بێبڕواو هاوبەشدانەرانە

لەبەر ئەوەی بێبڕواو هاوبەشدانەران تاسەر بە نەمری لە دۆزەخدان، دۆزەخ بە نشینگەو ئارامگەیان دادەنرێ، هەروەك بەهەشتیش نشینگەی بڕوادارانە:

﴿وَمَأْوَاهُمُ النَّارُ وَبِئْسَ مَثْــوَى الظَّــالِمِينَ: وجێگایان ئاگرەو چەند جێگەیەکی بەدفەرە؟ جێگەی ستەمکاران!.﴾ آل عمران:١٥١.

﴿أُولَئِكَ مَأْوَاهُمُ النَّارُ بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ: ئۆقرەگەی وان ئاگری دۆزەخە لەپای ئەو کردەوانەی ئەنجامیان داوە﴾يونس:٨.

---

[1] صحيح مسلم، كتاب الجنة وصفة نعيمها: (٤/٢١٨٨).

[2] قال الترمذي حديث حسن صحيح؛ التذكرة للقرطبي: ص٤٣٦.

﴿.. أَلَيْسَ فِي جَهَنَّمَ مَثْوًى لِلْكَافِرِينَ: ئەدی جێگەی بێباوەڕان دۆزەخ نیە؟﴾العنكبوت:٦٨.

**هەروەها دۆزەخ ئارامگەیانەو کاروباریان لەخۆ دەگرێ:**

﴿.. مَأْوَاكُمُ النَّارُ هِيَ مَوْلَاكُمْ..: **جێتان ئاگرەو ئاگر شیاوتانە**﴾ الحديد:١٥.

**بەڕاستی ناخۆشترین و خراپترین نشینگەو ئارامگەشە:**

﴿.. فَحَسْبُهُ جَهَنَّمُ وَلَبِئْسَ الْمِهَادُ: **جا ئەو کەسە دۆزەخی بەسە، دۆزەخیش ناخۆشترین جێیە**﴾البقرة:٢٠٦.

﴿هَذَا وَإِنَّ لِلطَّاغِينَ لَشَرَّ مَآبٍ، جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ الْمِهَادُ: **بەڕاستی یاخیبوان بەدفەڕترین جێ گەڕانەوەیان هەیە، دۆزەخێکە بۆ سوتان دەچنە نێوی، ئای چ شوێنێکی بەدو خراپە**﴾ ص:٥٥-٥٦.

## خوازگەی سێیەم

## بانگەوازکاران بۆ دۆزەخ

**خاوەنی ڕێبیرە گومڕاکان و، ڕاڕەو و مەزەبە پوچ و بەتاڵەکانی پێچەوانەی شەرعی خودان و، ئەو بانگەوازکارانەی بەناڕەواکەی خۆیان بڕوادارن، ئەوانەن بانگەوازکارانی دۆزەخ:**

﴿أُولَئِكَ يَدْعُونَ إِلَى النَّارِ: **ئەوانە بۆ دۆزەخ بانگەواز دەکەن.**﴾ البقرة:٢٢١.

﴿وَجَعَلْنَاهُمْ أَئِمَّةً يَدْعُونَ إِلَى النَّارِ: **ئەوانمان کردە پێشەواگەلێك کە بۆ ئاگر بانگەواز دەکەن.**﴾ القصص:٤١.

**شەیتانیش یەکێکە لەوانە** ﴿أَوَلَوْ كَانَ الشَّيْطَانُ يَدْعُوهُمْ إِلَى عَذَابِ السَّعِيرِ: **ئەگەرچی شەیتان بۆ ئەشکەنجەی ئاگراوی بانگ کردبێت.**﴾ لقمان:٢١.

﴿إِنَّمَا يَدْعُو حِزْبَهُ لِيَكُونُوا مِنْ أَصْحَابِ السَّعِيرِ: **بەڕاستی شەیتان کۆمەڵی خۆی**

**هەر بۆ ئەوە بانگ دەکا تا لە یارانی ئاگری دۆزەخ بن.﴾** فاطر:٦.

**جا ئەوانەی لە دنیادا بانگەواز بۆ دۆزەخ دەکەن، لە قیامەتدا دەبنە سەرکردە وپێشڕەوی هۆز وشوێنەکەوتەکانیان بۆ دۆزەخ، بۆ نمونە فیرعەون:**

﴿يَقْدُمُ قَوْمَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَأَوْرَدَهُمُ النَّارَ: **لەڕۆژی دوایی لەپێش هۆزەکەیدا دەبێ جا ئەوان دەباتە سەر ئاگر﴾** هود:٩٨.

**هەمو سەرکردەکانی شەڕ و خراپەش کە بانگەواز بۆ بیروباوەڕ و ڕێبیرە پێچەوانەکانی ئیسلام دەکەن بۆ دۆزەخ بانگەوازکارن، چونکە تەنیا ڕێگەی ئیمان تاکە ڕێگەی رزگار بونە لە ئاگری دۆزەخ:**

﴿وَيَاقَوْمِ مَا لِي أَدْعُوكُمْ إِلَى النَّجَاةِ وَتَدْعُونَنِي إِلَى النَّارِ: **هۆ هۆزی خۆم، هۆی چیە کە من بۆ رزگاربون بانگتان دەکەم و ئێوە من بۆ ئاگر بانگ دەکەن؟﴾**غافر:٤١.

**ئەوان بۆ فیرعەون و بێبڕوایی وهاوبەش دانانەکەی بانگەوازیان دەکرد، ئەویش بو خودا و یەکخواپەرستی وبڕوا بە خودا بانگەوازی دەکردن. جا لەبەر ئەوەی بێبڕواکان بۆ ئاگر بانگەوازکارن، خودا هاوسەرداری(زواج)ی بڕوادارانی دەگەڵ هاوبەشکاران حەرام کردوە، لە پیاوی بڕواداریشی حەرام کردوە ژن لە هاوبەشکاران بخوازێ، لەئافرەتی بڕواداریشی حەرام کردوە مێرد بە موشریکان بکا:**

﴿وَلاَ تَنكِحُوا الْمُشْرِكَاتِ حَتَّى يُؤْمِنَّ وَلأَمَةٌ مُؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِنْ مُشْرِكَةٍ وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ وَلاَ تُنكِحُوا الْمُشْرِكِينَ حَتَّى يُؤْمِنُوا وَلَعَبْدٌ مُؤْمِنٌ خَيْرٌ مِنْ مُشْرِكٍ وَلَوْ أَعْجَبَكُمْ أُوْلَئِكَ يَدْعُونَ إِلَى النَّارِ وَاللَّهُ يَدْعُو إِلَى الْجَنَّةِ وَالْمَغْفِرَةِ بِإِذْنِهِ وَيُبَيِّنُ آيَاتِهِ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ: **ژنانی موشریك مارە مەکەن مەگەر بڕوا بێنن، بەڕاستی کەنیزێکی بڕوادار لە ژنێکی موشریك باشترە، هەرچەند شەیدای جوانی و دەوڵەمەندیشی بن. ژنان و کچانی بڕواداری خۆشتان لە موشریکان مارە مەکەن، تاکو بڕوا دێنن و، پیاوێکی کۆیلەی بڕوادار لە موشریکێك چاکترە، هەرچەندە حەزیشیان پێبکەن، ئەوانە بڕوادارەکان بۆ ئاگر بانگەواز دەکەن، بەڵام خوا بە ئیزنی خۆی بڕواداران بۆ بەهەشت و بۆ لێخۆشبون بانگ دەکات و، نیشانەکانی خۆی بۆ خەڵکی ڕون دەکاتەوە، تا بێننەوە یاد و پەند وەربگرن.﴾** البقرة:٢٢١.

## خوازگەی چوارەم

### گەورەترین تاوانەکانی ئەوانەی تاسەر لە دۆزەخ دەمێننەوە

قورئان بە درێژی تاوانەکانی ئەو کەسانی ڕونکردۆتەوە کە تاسەر لە دۆزەخی دەمێننەوە و بەو تاوانانەش شایەنی مانەوەی تاهەتایی بون لە دۆزەخدا، ئێمەش لێرەدا گرنگترینیان باس دەکەین:

١- بێبڕوایی و هاوبەش دانان: خودای بەرز هەواڵی پێداوین بێبڕواکان لە دۆزەخدا دەکەنە هاوار، جاپێیان دەگوترێ ڕك و تورەیی خودا بۆ ئێوە مەزنترە لە ڕك و کینی خۆتان بۆ خۆتان لەبەر بێبڕواییتان، پاشان ئەوەی ڕونکردۆتەوە کە مانەوەی هەتا هەتاییان لە دۆزەخ بەهۆی بێبڕوایی و هاوبەش دانانیانەوەیە:

﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا يُنَادَوْنَ لَمَقْتُ اللَّهِ أَكْبَرُ مِنْ مَقْتِكُمْ أَنْفُسَكُمْ إِذْ تُدْعَوْنَ إِلَى الإِيمَانِ فَتَكْفُرُونَ، قَالُوا رَبَّنَا أَمَتَّنَا اثْنَتَيْنِ وَأَحْيَيْتَنَا اثْنَتَيْنِ فَاعْتَرَفْنَا بِذُنُوبِنَا فَهَلْ إِلَى خُرُوجٍ مِنْ سَبِيلٍ، ذَلِكُمْ بِأَنَّهُ إِذَا دُعِيَ اللَّهُ وَحْدَهُ كَفَرْتُمْ وَإِنْ يُشْرَكْ بِهِ تُؤْمِنُوا فَالْحُكْمُ لِلَّهِ الْعَلِيِّ الْكَبِيرِ: بێباوەڕان لە ڕۆژی دوایی بانگ دەکرێن، خەشم و ڕقی خودا بۆ ئێوە گەورەترە لە رقی خۆتان بۆ خۆتان، بێنەوەیاد کە بۆ بڕواهێنان بانگکران و کوفرتان کرد. دەڵێن ئەی پەروەردگاری ئێمە دوجار ئێمەت مراند و دو جارت زیندی کردینەوە، جا ئێمە پێ لە گوناهی خۆمان دەنێین. جا چ ڕێگە بۆ دەرچون هەیە؟ ئەمەتان بۆیە بەسەر دێ بە تاقانەبونی خودا بانگ کرابان بێبڕوا دەبون، ئەگەر هاوبەشیان بۆ خودا دابنابا بڕواتان بە شیرك دێنا فەرمان تەنیا بۆ خودای بەرز و گەورەیە﴾ غافر: ١٠-١٢.

خودای مەزن باسی ئەوەشی بۆ فەرموین کاتێ کە بێبڕواکان دەگەنە دۆزەخ ئاگرەوانەکان لێیان دەپرسن:

﴿أَوَلَمْ تَكُ تَأْتِيكُمْ رُسُلُكُمْ بِالْبَيِّنَاتِ: ئایا پێغەمبەرانتان بەڵگەگەلی ڕونیان بۆ نەهێنابون؟﴾ غافر: ٥٠.

وەڵامەکە وادەبێت کە: ئەوان بەهۆی وەدرۆخستنەوەی پێغەمبەران و پەیامەکانیان شایستەی دۆزەخ بون:

﴿قَالُوا بَلَى قَدْ جَاءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ اللَّهُ مِنْ شَيْءٍ إِنْ أَنْتُمْ إِلاَّ فِي ضَلاَلٍ كَبِيرٍ: دەڵێن: بەڵێ، ترسێنەر هاتبوە لامان، ئەوسا باوەڕمان پێنەکرد و گوتمان خوا هیچ شتی نەناردوّتە خوار، ئێوە لە گومڕایی گەورەدان.﴾ الملك:٩.

لەباسی ئەوانەی قورئانیش وە درۆدەخەنەوە، دەفەرمێ:

﴿وَقَدْ آتَيْنَاكَ مِنْ لَدُنَّا ذِكْرًا، مَنْ أَعْرَضَ عَنْهُ فَإِنَّهُ يَحْمِلُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وِزْرًا، خَالِدِينَ فِيهِ وَسَاءَ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حِمْلاً: ئەم قورئانەمان بە خۆمانڕا داوە بە تۆ، هەر کەس لەوە رو بسوڕێنێ لە رۆژی دواییدا بارێکی گران هەڵدەگرێ، هەرگیز لێی دەرناچێ، ئای کە لە رۆژی قیامەتا بۆ ئەوانە چەند بارێکی ناڵەبارە﴾طـه:١٠٠-١٠١.

لەبارەی ئەوانەش پەیامەکانی خوا وەدرۆ دەخەنەوە و هاوبەش بۆ خودا دادەنێن دەفەرموێ:

﴿الَّذِينَ كَذَّبُوا بِالْكِتَابِ وَبِمَا أَرْسَلْنَا بِهِ رُسُلَنَا فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ، إِذِ الأَغْلاَلُ فِي أَعْنَاقِهِمْ وَالسَّلاَسِلُ يُسْحَبُونَ، فِي الْحَمِيمِ ثُمَّ فِي النَّارِ يُسْجَرُونَ، ثُمَّ قِيلَ لَهُمْ أَيْنَ مَا كُنْتُمْ تُشْرِكُونَ، مِنْ دُونِ اللَّهِ قَالُوا ضَلُّوا عَنَّا بَلْ لَمْ نَكُنْ نَدْعُو مِنْ قَبْلُ شَيْئًا كَذَلِكَ يُضِلُّ اللَّهُ الْكَافِرِينَ، ذَلِكُمْ بِمَا كُنْتُمْ تَفْرَحُونَ فِي الأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَبِمَا كُنْتُمْ تَمْرَحُونَ، ادْخُلُوا أَبْوَابَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا فَبِئْسَ مَثْوَى الْمُتَكَبِّرِينَ: ئەو کەسانەی کە هەر بڕوایان بەم قورئانەو بەو شتانەی پێغەمبەرانمان بۆ ناردون نیە، زۆر ناخایەنێ تێدەگەن، ئەوسا کە هەر یەکە چەند تۆقی دە ملدایەو بە زنجیر رایان دەکێشن بۆ ناو ئاوێکی کوڵاو، لە دوای ئەوە لەناو ئاگردا گڕدەگرن. ئەم جارە لێیان دەپرسن کوان ئەوانەی دەتانگوت شەریکی خوان، بێجگە لەخوا، دەڵێن: لەبەرچاومان ونن؛ خۆ ئێمە کە لەسەر دنیاش بوین غەیرەخوامان نەدەپەرست، خودا ئاوا خوانەناسان گومڕا دەکا. ئەوە لەبەر ئەوەیە کە لەسەرزەمین بە ناڕەوا کەیفو دەکرد و بە ناز و مەبەستی خۆشحاڵ دەبون. لە دەرگاکانی دۆزەخ بچنە ئەو دیو تا هەتایە لەوێدا بمێننەوە. جێگەی خۆ بەزل زانەکان چەند ناخۆشە؟!﴾غافر:٧٠-٧٦.

**هەروەها لەبارەی ئەو بێبڕوا هاوبەش دانەرانەی خوداکانی خۆیان هێناوەتە پاڵ پەروەردگاری جیهانیان، دەفەرمێ:**

﴿فَكُبْكِبُوا فِيهَا هُمْ وَالْغَاوُونَ، وَجُنُودُ إِبْلِيسَ أَجْمَعُونَ، قَالُوا وَهُمْ فِيهَا يَخْتَصِمُونَ، تَاللَّهِ إِنْ كُنَّا لَفِي ضَلَالٍ مُبِينٍ، إِذْ نُسَوِّيكُمْ بِرَبِّ الْعَالَمِينَ: **جا هەمو ئەوانە و بێبڕوایان سەرەونخون دەخرێنە دۆزەخ. لەگەڵ سەرجەم لەشکری ئیبلیس. دەڵێن لەکاتێکدا ئەوانە لە دۆزەخدا دژایەتی یەکدی دەکەن. سوێند بە خوا ئێمە لە گومڕاییەکی ئاشکرا دابوین. ئەو کاتی ئێوەمان لەگەڵ پەروەردگاری جیهانیان بەرامبەر کرد**﴾الشعراء:٩٤-٩٨.

**دەرهەق ئەوانەی ڕۆژی قیامەتیش بەدرۆدەخەنەوە، دەفەرمێ:**

﴿بَلْ كَذَّبُوا بِالسَّاعَةِ وَأَعْتَدْنَا لِمَنْ كَذَّبَ بِالسَّاعَةِ سَعِيرًا: **بەڵکو ئەوانە ڕۆژی قیامەتیان وەدرۆخستەوە و، بۆ هەرکەسێکی ڕۆژی دوایی بە درۆ دانێ ئاگری سوتێنەرمان سازداوە**﴾ الفرقان:١١.

**و دەفەرمێ:** ﴿وَإِنْ تَعْجَبْ فَعَجَبٌ قَوْلُهُمْ أَءِذَا كُنَّا تُرَابًا أَئِنَّا لَفِي خَلْقٍ جَدِيدٍ أُولَئِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ وَأُولَئِكَ الأَغْلَالُ فِي أَعْنَاقِهِمْ وَأُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ: **ئەگەر واقت وڕدەبێ، سەیر قسەی ئەوانە کە دەڵێن: ئایا کاتێك دەبینە خۆڵ جارێکی دی سەر لەنوێ ساز دەکرێینەوە؟! ئەوانە کەسانێکن بێبڕوا بە پەروەردگاری خۆیان و، ئەوانەکۆت و زنجیریان لەئەستۆدایە و یاوەری دۆزەخن و تاهەتایە تێیدا دەبن.**﴾ الرعد:٥.

**هەروەها دەفەرمێ:**﴿ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ كُلَّمَا خَبَتْ زِدْنَاهُمْ سَعِيرًا، ذَلِكَ جَزَاؤُهُمْ بِأَنَّهُمْ كَفَرُوا بِآيَاتِنَا وَقَالُوا أَئِذَا كُنَّا عِظَامًا وَرُفَاتًا أَئِنَّا لَمَبْعُوثُونَ خَلْقًا جَدِيدًا: **ئارامگەیان دۆزەخە و هەردەمێك ئاگرەکەی کزبێ، نێلی دەدەین و گڕی زیاد دەکەین. ئەمە سزای ئەوانە، چونکە بە نیشانەکانی ئێمە بێبڕوا بون و گوتیان: ئایا کاتێك دەبینە ئێسك و پروسك، جارێکی دی زیندو دەکرێینەوە!**﴾مدثر:٤٢.

**٢- بەر لە جێبەجێ نەکردنی ئەرکە شەرعییەکان لەگەڵ وەدرۆخستنەوەی ڕۆژی قیامەت و پابەند نەبون بە بەندوبەستە شەرعیەکان، خودای بەرز پێی ڕاگەیاندوین کە**

**بەهەشتیەکان لە دۆزەخیان دەپرسن:**

﴿مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ: **چی ئێوەی پەلکێشی دۆزەخ(سقر) کرد؟**﴾المدثر:٤٢.

**لەوەلامدا دەڵێن:** ﴿قَالُوا لَمْ نَكُ مِنَ الْمُصَلِّينَ، وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ الْمِسْكِينَ، وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ الْخَائِضِينَ، وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ الدِّينِ، حَتَّى أَتَانَا الْيَقِينُ: **لە نوێژکاران نەبوین و خۆراکمان بە هەژار نەدەدا هەردەم دەگەڵ قسە پوچان بوین و ڕۆژی قیامەتمان بەدرۆ دادەنا هەتا مەرگمان گەیشتێ!**﴾ المدثر:٤٣-٤٧.

**٣- گوێڕایەڵی سەرکردەکانی گومڕایی و سەرانی کوفر، لە بڕیار و ڕێبیرە وێڵ و هەنگاوە بێبڕواکانیان کە بەرلە دینی خوا و شوێنکەوتنی پێغەمبەرەکان دەگرن. خوای بەرز لە بارەی وانەوە دەفەرمێ:**

﴿وَقَيَّضْنَا لَهُمْ قُرَنَاءَ فَزَيَّنُوا لَهُمْ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَحَقَّ عَلَيْهِمُ الْقَوْلُ فِي أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِهِمْ مِنَ الْجِنِّ وَالإِنسِ إِنَّهُمْ كَانُوا خَاسِرِينَ، وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لاَ تَسْمَعُوا لِهَذَا الْقُرْآنِ وَالْغَوْا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ، فَلَنُذِيقَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا عَذَابًا شَدِيدًا وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَسْوَأَ الَّذِي كَانُوا يَعْمَلُونَ، ذَلِكَ جَزَاءُ أَعْدَاءِ اللَّهِ النَّارُ لَهُمْ فِيهَا دَارُ الْخُلْدِ جَزَاءً بِمَا كَانُوا بِآيَاتِنَا يَجْحَدُونَ: **دۆستی واشمان لە دنیا بۆ پەیداکردن، کاری ئێستە و ئایندەیان بۆ خەملاندن، بۆ ئەمان و ئەوجنۆکە و مرۆڤانەی بەر لەوان بون، بەڵێنی خودا هاتەجێ، لەبەر ئەوەی زیانباربون. خودانەناسەکان گۆتیان: گوێ بۆ ئەم قورئانە مەگرن؛ قسەی بێتامی خۆتانی تێکەڵ بکەن، بەشکو بەسەریا سەرکەون، سا مەرج بێ ئەوکەسانەی خوانەناس بون، لە ئێمەوە جەزرەبەی دژوار بچێژن: لەوەی دەیانکرد، خراپتر ئازاریان دەین، سزای دوژمنانی خودا هەر ئەمەیە: لە سۆنگەی حاشاکردنیان لە نیشانەکانی ئێمە، ئاگری لەبن نەهاتو شوێنی حەوانەوەیانە**﴾فصلت:٢٥-٢٨.

**جاکە بێبڕواکان لەنێو ئاگر ئارام دەگرن و ڕویان تێیدا هەڵگێر و وەرگێر دەکرێ، پەشیمان دەبنەوە کە تاعەتی خودا و پێغەمبەرەکەیان نەکردوە و گوێڕایەڵی سەروەر و گەورەکانی خۆیان بون:**

﴿إِنَّ اللَّهَ لَعَنَ الْكَافِرِينَ وَأَعَدَّ لَهُمْ سَعِيرًا(٦٤) خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا لاَ يَجِدُونَ وَلِيًّا وَلاَ

صيرًا(٦٥)يَوْمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمْ فِي النَّارِ يَقُولُونَ يَالَيْتَنَا أَطَعْنَا اللَّهَ وَأَطَعْنَا الرَّسُولاَ(٦٦)وَقَالُوا رَبَّنَا إِنَّا أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَاءَنَا فَأَضَلُّونَا السَّبِيلاَ: **خودا نەفرینی لە کافران کردوە و ئاگرێکی هەڵایساوی بۆ ئامادە کردون، بەهەمیشەیی لەوێدا دەبن و کەسیش نابێ بەدۆست و یارمەتیدەریان. ئەوێ رۆژی کە دەم و چاویان لە ئاگردا ئەم دیو ئەودیوی پێدەکرێ، دەڵێن: خۆزی تاعەتی خوا و تاعەتی پێغەمبەرمان بکردایە. دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان، ئێمە دوی ئاغاکان و گەورەکانی خۆمان کەوتین ئەوان ئێمەیان گومرا کرد**﴾ الأحزاب:٦٤-٦٧.

**٤- دوڕوویی(نفاق): خودا بەڵێنی دۆزەخی بە دەغەڵ و دو ڕوان داوە، بەڵێنێکی یەکجارەکیە و دەیگەیەنێتە سەر:**

﴿وَعَدَ اللَّهُ الْمُنَافِقِينَ وَالْمُنَافِقَاتِ وَالْكُفَّارَ نَارَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا هِيَ حَسْبُهُمْ وَلَعَنَهُمُ اللَّهُ وَلَهُمْ عَذَابٌ مُقِيمٌ: **خودا بەڵێنی ئاگری دۆزەخی بە پیاوان و ژنانی دەغەڵ و بێبڕوایان داوە کە تا سەر لەوێدا دەبن. ئەمە بۆ وان بەسە و، خودا نەفرەتی لێکردون و ئەشکەنجەی هەمیشەیی بۆ ئەوانە**﴾ التوبة:٦٨.

**هەواڵی ئەوەشی پێداوین شوێنی دو ڕوان نهۆمی هەرەژێرەکانی دۆزەخە، کە لە هەموان گەرمترە و سەختترە و، ئازار و ئێشیان پترە:**

﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الأَسْفَلِ مِنْ النَّارِ: **دو ڕوەکان لەنهۆمی هەرەژێری ئاگری دان.**﴾ النساء:١٤٥.

**٥- زلفیزی(الکبر): ئەمەش سیفەتێکی گشت دۆزەخیانە، خوای بەرز دەفەرمێ:**

﴿وَالَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَاسْتَكْبَرُوا عَنْهَا أُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ: **کەسانێك نیشانەکانی ئێمە وە درۆبخەنەوە و لە ئاستیاندا خۆ بەزل بگرن. ئەوانە یاری دۆزەخن و تاهەتا تێیدا دەمێننەوە**﴾ الأعراف:٣٦.

**موسلیم لە صەحیحەکەیدا دەروازەیەکی داناوە بە ناوی (زۆرداران دەچنە دۆزەخ و، بێدەسەڵاتن دەچنە بەهەشت)، جا لەوێدا بیانوگری بەهەشت و دۆزەخی هێناوەتەوە، چییان گوتوە و خوداش چی پێ فەرمون. جا ئەو فەرمودەی هاوردوە کە ئەبو هوریرە بۆ پێغەمبەرﷺی بەرز دەکاتەوە و، تێیدا هاتوە کە دۆزەخ گوتی:**

((يدخلني الجبارون و المتكبرون: زۆردار و خۆبەزل زانان دێنە ناوم)) لەگێڕانەوەیەکیشیدا دەڵێ ((اوثـرت بالمتكـبرين و الجبـارين: بەزلفیز و زۆرداران تایبەت کراوم)). خـودای بەرزیش پێی فەرمو: ((انت عذابي اعذب بك من اشاء: تۆ ئەشکەنجەی منی و هەرکەسی بمەوێ بە تۆی ئەشکەنجە دەدەم))[1].

هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرمێ ((الا اخبركم باهل الجنة؟ كل ضعيف متضعف، لو اقسم على الله لأبره، الا اخبركم باهل النار، كل عتل جواظ مستكبر: ئەدی هەواڵی بەهەشتیانتان نەدەمێ؟ هەمو لاوازێکی خۆ بە لاواز گر، ئەگەر سوێند لەسەر خوا بخوات، سوێندەکەی ناشکێنێت. ئەدی هەواڵی دۆزەخیانتان پێ نەدەم، هەمو دڵڕەقێکی لەخۆبایی زلفیزە))[2]، لەگێڕاونەوەیەکی موسلیمشیدا هاتوە: ((كل جواظ زنيم متكبر: هەمو زۆڵێکی زلفین))[3].

خودای بەرز لەم بارەیەوە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمێ:

﴿أَلَيْسَ فِي جَهَنَّمَ مَثْوًى لِلْكَافِرِينَ: ئەدی دۆزەخ جێگەی زلفیزان نیە؟!﴾الزمر:٦٠.

و دەفەرمێ: ﴿فَالْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ الْهُونِ بِمَا كُنْتُمْ تَسْتَكْبِرُونَ فِي الأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ: ئەمڕۆش زۆر بە سوکایەتی ئازار دەدرێن، لەبەر ئەوەی ئێوە لەسەر زەوی بەناڕەوا خۆتان بەزل دادەنا﴾الأحقاف:٢٠.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا مَنْ طَغَى، وَآثَرَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا، فَإِنَّ الْجَحِيمَ هِيَ الْمَأْوَى: جا ئەو کەسەی یاخی بوە و سەربزێوی کردوەو ژینی دنیای هەڵبژاردوە بەڕاستی دۆزەخ جێیەتی﴾ النازعات: ٣٧.

---

[1] صحيح مسلم: (٢١٨٦/٤) ورقم الحديث (٢٨٤٦).

[2] صحيح البخاري ومسلم وسنن الترمذي عن حارثة بن وهب؛ جامع الأصول: (٥٤٧/١٠) ورقم الحديث: (٨١١١).

[3] تەماشای فەرمودەکەو گێڕانەوەکانی بکە لە صحيح مسلم كتاب الجنة (باب النار يدخلها الجبارون): (٢١٩٠/٤) ورقمە (٢٨٥٣).

## کۆی ئەو تاوانانەی مایەی چونە دۆزەخن

لەئینبو تەیمیەی شێخی ئیسلامیان -رەحمەتی خوای لێبێت- پرسی: کردەی دۆزەخیان چیە و کردەی بەهەشتیان چیە؟ لە وەڵامدا گوتی: (کردەوەی دۆزەخییان بریتین لە: هاوبەش دانان بۆ خودای بەرز و درۆخستنی پێغەمبەران و، بێبڕوایی و، حەسودی و درۆ و خیانەت و، ستەم و، داوێن پیسی و، غەدر و پچڕینی خزماتی و، ترسنۆکی لە جیهاد و، ڕژدی، جیاوازی دەرودەرون، بێئومێدی لە بەهرەی خودا و، بێ نیاز بون لە مەکری خوا و، نوزاندنەوە لەکاتی کارەساتان و بەخۆنازین و بایی بون بە نیعمەتان و، وازهێنان لە فەرزەکانی خوا و، بەزاندنی سنورەکانی و، ئەنجامدانی حەرامەکان و، ترسان لە بەدیهێنراوان نەك لە خوای بەدیهێنەر و، کردەوە بۆ ڕیا و ناوبانگ و، پێچەوانەکردنی قورئان و فەرموده، چ بە بیروباوەڕ یان بەکردەوە، تاعەتی خەڵك بە یاخیبون لە خوای بەدیهێنەر و، دەمارگیری بۆ ناڕەوا و، تیزکردن و گاڵتەکردن بەنیشانەکانی خوا و، نکوڵی کردنی هەق و، شاردنەوەی ئەو زانست و شایەدیەی کە دەرخستنیان پێویستە و، جادوگەری و خراپی لەگەڵ دایك و باوك و، کوشتنی بەناهەق و، خواردنی ماڵی هەتیو و، ریبا و، هەڵاتن لە لەشکرکێشی و، ناوبەدکردن و پاڵدانی زینا بۆ ئافرەتی بەمێردی بێئاگای بڕوادار)[1].

پێغەمبەرﷺیش کۆمەڵی لەو تاوانانەی باسکردوە کە مایەی چونە دۆزەخن، هەروەك لە وتارێکی درێژدا فەرموی:

((واهل النار خمسة: الضعيف الذي لا زبر له، الذين هم فيكم تبعا لايتبعون اهلا و لا مالا، و الخائن الذي لايخفى له طمع وان دق الاخانة، ورجل لايصبح ولايمسي الا وهو يخادعك عن اهلك و مالك. وذكر البخل، والكذب، والشنظير، الفحاش: دۆزەخیەکان پێنجن: ئەو لاوازەی عەقڵی نیە لە کرداری نەشیاو وەبگەڕێنن، ئەوانەی لە نێو ئێوەدا شوێنکەوتەن و بەشوێن نەکەس و نەماڵ ناکەون، ئەو ناپاکەی تەماعی نەشاردبێتەوە. هەرچەندە

[1] يقظة اولي الأعتبار؛ ص٢٢٢

ناپاکیەکەی وردیش بێت. پیاوێك هەمو سبەینە و ئێوارێك لەکەس و کار و لەماڵت دەتخەڵەتێنێت. باسی چروکیشی فەرمو لەگەڵ درۆ و بێڕەوشتی و داوێن پیس))[1].

## خوازگەی شەشەم

### هەندێ کەسی دیاریکراوی دۆزەخ

گومان لەوەدانیە هەمو بێبڕوا و هاوبەشدانەران لە دۆزەخدان، قورئانی پیرۆز و فەرمودەکانی پێغەمبەرﷺیش کەسانێکی دیاریکراوی دۆزەخیانی پێ ناساندوین، لەوانە فیرعەونی سەردەمی موسا:

﴿يَقْدُمُ قَوْمَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَأَوْرَدَهُمُ النَّارَ: ئەو لە ڕۆژی قیامەتدا وە پێش دەستەی خۆی دەکەوێت و هەموان دەباتە ناو ئاگر﴾ هود:٩٨.

هەروەها ژنی نوح و ژنی لوط: ﴿ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلاً لِلَّذِينَ كَفَرُوا امْرَأَةَ نُوحٍ وَامْرَأَةَ لُوطٍ كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَالِحَيْنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ اللَّهِ شَيْئًا وَقِيلَ ادْخُلاَ النَّارَ مَعَ الدَّاخِلِينَ: خودا بە ژنی نوح و ژنی لوط -بۆ ئەوانەی خوانەناسن- بەنمونە دێنێنەوە، هەردوکیان لەبن دو بەندەی چاکی ئێمە بون، ناپاکییان دەگەڵ کردن، ئەو دو پێغەمبەرەش نەیانتوانی لەلای خوا هیچ شتێکیان بۆ بکەن، گۆترا: ئێوەش بڕۆنە ناو ئاگرەوە، لەگەڵ ئەوانەی تێی دەچن.﴾التحريم:١٠.

هەروەها ئەبو لەهەب و ژنەکەی:

﴿تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ، مَا أَغْنَى عَنْهُ مَالُهُ وَمَا كَسَبَ، سَيَصْلَى نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ، وَامْرَأَتُهُ حَمَّالَةَ الْحَطَبِ، فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِنْ مَسَدٍ: هەردو دەستی ئەبو لەهەب بە بڕین چێت و مەرگی بۆبێ. دەسکەوت و ماڵ و سامانی هیچ سودێکی پێ

[1] رواه مسلم في صحيحه عن عياض بن حمار؛ في كتاب الجنة وصفة نعيمها، باب الصفات التي يعرف بها في الدنيا اهل الجنة واهل النار: (٤/٢١٩٧) ورقمه (٢٨٦٥).

**نەبەخشـــی. زو دەکەوێتـــەی نێـــو ئـــاگری بڵیســـەدار و دەســـوتێ. ژنەکەشـــی کـــە دەستەچیلکە بەکۆڵ دێنێ، لە حاڵێکدا تەنافێکی پێست خورمای لە مل دایە﴾** المسد:١-٥

**هەروەها عەمری کوڕی عامیری خوزاعی، کە پێغەمبەرﷺ دیتی لەنێو دۆزەخدا، ڕیخەڵۆکەکانی ڕادەکێشا[1] . هەروەها ئەو کەسی عەمماری کوشت و ڕوتی کردەوە، هەروەك پێغەمبەرﷺ دەفەرمێ:**

((قاتل عمار و سالبه في النار: **بکوژ و تالآنکەری عەممار لە دۆزەخدایە**))[2].

## خوازگەی هەفتەم

## بێبڕوایانی جنۆکان دەچنە دۆزەخ

**بێبڕوایانی جنۆکان هەروەك بێبڕوایانی مرۆڤ دەچنە دۆزەخ، چونکە جنۆکەش وەکو مرۆڤ ئەرکبارن:**

﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالإِنسَ إِلاَّ لِيَعْبُدُونِ: **جنۆکە و مرۆڤم بەدیهێناون تا عیبادەتم بکەن.**﴾ الذاريات:٥٦.

**لە ڕۆژی قیامەتیشدا جنۆکە و مرۆڤ وەکو یەك حەشر دەکرێن:**

﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا يَامَعْشَرَ الْجِنِّ قَدْ اسْتَكْثَرْتُمْ مِنْ الإِنسِ: **ئەو ڕۆژەی هەمویان کۆدەکاتەوە و پێیان دەڵێ: ئەی کەلی جنۆکان، ئێوە کەسانێکی زۆرتان لە مرۆڤ کردە داردەستەی خۆتان و گومڕاتان کردن.**﴾ الأنعام:١٢٨.

﴿فَوَرَبِّكَ لَنَحْشُرَنَّهُمْ وَالشَّيَاطِينَ ثُمَّ لَنُحْضِرَنَّهُمْ حَوْلَ جَهَنَّمَ جِثِيًّا، ثُمَّ لَنَنزِعَنَّ مِنْ كُلِّ شِيعَةٍ أَيُّهُمْ أَشَدُّ عَلَى الرَّحْمَانِ عِتِيًّا، ثُمَّ لَنَحْنُ أَعْلَمُ بِالَّذِينَ هُمْ أَوْلَى بِهَا صِلِيًّا: **جا سوێند بە پەروەردگارت هەمو ئەوانە لەگەڵ شەیتانەکان حەشر دەکەین، ئەوسا**

---

[1] حديث صحيح رواه البخاري ومسلم واحمد، دەقەکەی لەشوێنێکی دیکەدا باس کرا.

[2] في معجم الطبراني بأسناد صحيح عن عمرو بن عاص عن ابنه؛ صحيح الجامع: (١١٠/٤) ورقمه: ٤١٧٠

**هەمویان لەسەر چۆك بە دەوری دۆزەخ حازر دەکەین، پاشان لەهەر دەستەیەکیان کامەی لە خوا یاخیتر بون دەریان دێنین و جیایان دەکەینەوە. پاشان ئێمە زاناترین بەو کەسانەی زێتر شایستەی سوتانی نێو دۆزەخن.**﴾مريم:٦٨.

**پاشان بە بێبڕوایان دەگوترێ:** ﴿ادْخُلُوا فِي أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِكُمْ مِنَ الْجِنِّ وَالإِنسِ فِي النَّارِ: **وێڕای ئوممەتگەلا وا بەر لە ئێوە لەبەین چون لە مرۆڤ و جنۆکە بڕۆنە ناو ئاگرەوە**﴾ الأعراف:٣٨.

**ئەوکاتە سەرەوژێر هەڵدەدرێنە دۆزەخ:**

﴿فَكُبْكِبُوا فِيهَا هُمْ وَالْغَاوُنَ، وَجُنُودُ إِبْلِيسَ أَجْمَعُونَ: **جا هەمو ئەوانە و گومڕاکان سەرنخون دەخرێنە دۆزەخ. لەگەڵ هەمو شوێنکەوتەو سەربازانی ئیبلیس.**﴾الشعراء:٩٤-٩٥.

**بەمەش بڕیارەکەی خودای مەزن وەدی دێ کەوا دەخوازێ دۆزەخ بە بێبڕوایانی جنۆکە و مرۆڤان پڕ ببێ:**

﴿وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ لأَمْلأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ: **بڕیاری پەروەردگارت هەر دێتە جێ کە دۆزەخ لە یاخیانی مرۆڤ و جنۆکە پڕ دەکەم.**﴾هود:١١٩.

﴿وَحَقَّ عَلَيْهِمُ الْقَوْلُ فِي أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِهِمْ مِنَ الْجِنِّ وَالإِنسِ: **بۆ ئەمان و ئەو جنۆکەو مرۆڤانەی بەر لەوان بون، بەڵێنی خوا هاتە جێ، لەبەر ئەوەی زیانبار بون.**﴾فصلت:٢٥.

## جێباسی دوەم

## ئەوانەی بەهەتایی لە دۆزەخدا نامێننەوە

### خوازگەی یەکەم

### ناساندنیان

ئەوانی دەچنە دۆزەخ و پاشان لێی دێنە دەرێ، بریتین لە ئەهلی تەوحید کە هیچ هاوبەشێکیان بۆ خودا دانەناوە، بەڵام تاوان و گوناهگەلێکی زۆریان هەیە، تەرازوی سوك کردون، جا خودای بەرز دەزانێ ئەوانە چەند لە دۆزەخدا دەمێنن، پاشان بە تکای تکاکاران لە دۆزەخێ دێنەدەر، خوداش بەمیهری خۆی خەڵکانێکی تیا دەردێنێ کە هەرگیز چاکەیان نەکردوە.

### خوازگەی دوەم

### ئەو گوناهانەی بە دۆزەخ گفتیان پێدراوە

لێرەدا هەندێك گوناهان باس دەکەین کە دەقانێکیان لەبارە هاتوە، وا ڕادەگەیەنن ئەوانەی ئەو تاوانانە ئەنجام بدا بە ئاگر ئەشکەنجە دەدرێت:

**١- ئەو کۆمەڵانەی پێچەوانەی سوننەتن:**

لە موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیانەوە هاتوە، دەڵێ: پێغەمبەرﷺ لەنێوماندا ڕاوەستا و فەرموی:

((ألا ان من قبلكم من اهل الكتاب افترقوا على ثنتين و سبعين ملة، وان هذه الملة ســـتفترق على ثلاث و سبعين، ثنتان و سبعون في النار، و واحدة في الجنة، وهـــي الجماعـــة: ئەو ئەهلی کتێبیانی پێشوتان بۆ هەفتا و دو کۆمەڵ دابەش بون، ئەم میللەتەش بۆ هەفتا و سێ

کۆمەڵ دابەش دەبێت، هەفتا و دویان بۆ دۆزەخ و یەکێکیان بۆ بەهەشتە کە ئەویش کۆمەڵە))[١].

ئەم فەرمودەیە صەحیحە، حاکیم پاش ڕیزکردنی سەنەدەکانی دەڵێ: (ئەم سەنەدانە بیانویان پێ دەبڕێ بۆ ڕاستکردنەوەی فەرمودان) زەهەبیش لەسەری یەکدەنگ بوە، ئیبنو تەیمیەی شێخی ئیسلامیش دەڵێ: (ئەمە فەرمودەیەکی دروستی بەناوبانگە) هەروەها شاطبي لە (الاعتصام)دا بە صەحیحی داناوە. شێخ ناصرەددینی ئەلبانیش ڕێگەکانی کۆکردوە و لەبارەی سەنەدەکانیەوە دواوە، ئەوەشی ڕونکردۆتەوە کە فەرمودەیەکی صەحیحە و چ گومان لە ڕاستی و دروستی نیە[٢].

صیدیقی حەسەن خانیش وای بۆ دەچێت زێدەی فەرمودەکە کە دەڵێ: (کلها هالکة الا واحدة: یەکێکیان بترازێ هەمو تونا دەبن))، یا دەفەرمێ: ((ثنتان و سبعون في النـــار: هەفتا و دویان لە دۆزەخن)) زێدەیەکی لاوازە. لاواز کردنەکەش لە شەوکانی و پێش ئەویش لە ئیبنو وەزیر و پێش ئەویش لە ئیبنی حەزم ڕاگواستوە. قسەی ئەوانیشی پەسند کردوە کە دەڵێن: (ئەو زێدەیە ڕەگەڵ خستنێکی(دسائس) پێچەوانەی دینەکانە(الملاحدە)، چونکە دورخستنەوە لە ئیسلام و ترساندن لەموسڵمان بونی تێدایە)[٣].

بەڵام شێخ ناصرەددینی ئەلبانی لە دو ڕوەوە وەڵامی ئەوانەی داوەتەوە کە ئەم زێدەیە بە لاواز دادەنێن:

**یەکەم:** ڕەخنەی زانستیانەی فەرمودەناسیی بەڵگەی ڕاستی ئەم زێدەیەیە. بۆیە قسەی ئەوانی لاوازی دەکەن چ سەنگی نیە.

**دوەم:** ئەوانەی ئەم زێدەیەیان بە ڕاست داناوە زۆرتر و زاناترن لە ئیبن حەزم، بەتایبەتی کە ئەو لەنێو زانایاندا ڕەخنە توندەکانی ناسراوە، جا نابێت بۆچونی وی ببێتە بیانو ئەگەر بەتەنێ ئەو ڕایە هەبو و لەکاتێکدا پێچەوانە نەبو، ئەگەر

---

[١] رواه ابو داود والدارمي واحمد والحاكم وغيرهم.

[٢] انظر سلسلة الأحاديث الصحيحة، ورقم الحديث: ٢٠٤

[٣] يقظة اولي الأعتبار: ص٢٠٦

پێچەوانەش بو ئەوا هێوەتر.

هەرچی ئیبنو وەزیریشە، زێدەکە لە ڕوی ماناوە ڕەت دەکاتەوە نەك لە ڕوی سەنەد، هەروەها صیددیق حەسەن خان لە (یقظة أولی الاعتبار)دا لەم بارەیەوە دواوە و ئەوەی رونکردۆتەوە کە ئەو زێدەیە وادەگەیەنێ ژمارەیەکی کەم لەم ئوممەتە دەچنە بەهەشت، بەلام دەقانی صەحیح و چەسپاو وادەگەیەنن کە خەڵکێکی یەکجار زۆری ئەم ئوممەتە دەچنە بەهەشت، کە نیوەی بەهەشت دا دەگرن[1].

وەلامی ئەم ڕایەش لە چەند ڕویەکەوەیە:

یەکەم: دابەش بونی ئوممەت بەسەر هەفتا و سێ کۆمەلان ئەوە ناگەیەنی کە زۆربەی ئوممەت دەچنە دۆزەخ، چونکە زۆربەی ئوممەت ڕەشۆکییە و تێکەڵی ئەو کۆمەلانە نابن. ئەوانەی کە جوداش بونەتەوە و دانیشتون و ڕەگیان داکوتا بنچینەیان دارشتوە و پێچەوانەی سوننەتن ژمارەیان کەمە لە چاو ئەوانەی لە هەمو ئەو شتانە دور بون.

دووەم: هەرکەسێکی لە یەکێك لە مەسەلەکاندا جیاواز بێ لە ئەهلی سوننەت، بە کۆمەڵێکی جیا لە ئەهلی سونەت ناژمێردرێت. بەڵکو مەبەست ئەوانەی کە بنەمای وایان دارشتوە دەیانکاتە کۆمەڵی سەربەخۆ، لە پێناو بۆچونەکانیشیان گەلێك دەقی قورئان و فەرمودەیان جێ هێشتوە، وەکو خەواریج و موعتەزیلە و رافیزەکان.

بەلام ئەوانی پەیرەوی قورئان و فەرمودە دەکەن و لێیان لانادەن، ئەگەر لە یەکێك لە مەسەلەکانیش ڕاو بۆچونێکی جیایان هەبو بە یەکێك لەو کۆمەلانە ناژمێردرێن.

سێیەم: زێدەکە وادەگەیەنی کە کۆمەڵەکان لە دۆزەخدان، بەلام ڕاینەگەیاندوە کە تاهەتایی لە ئاگردا دەمێننەوە.

ئاشکرایە کە هەندێك پەیرەوانی ئەو کۆمەلانە کافر و بێبڕوان و تاهەتایی لە دۆزەخدان، وەکو توندڕەوی باطینیان کە لە سەرەوەدا ئیمان دەردەخەن و لەناوەوەش بێبڕوان وەکو ئیسماعیلیەکان و دروزیەکان و نەصیرییەکان و هاوشێوەی ئەوان.

هی واشیان تێدایە لە مەسەلەی زۆر مەزندا پێچەوانەی ئەهلی سونەتن، بەلام

[1] تەماشای قسەکانی شێخ بکە لە (سلسلة الأحادیث الصحیحة/ رقم٢٠٤) و (یقظة اولی الأعتبار ص٢٠٧)

ناگاتە ڕادەی بێبڕوایی، جا ئەوانە بەڵێنێکی ڕەهای چونە بەهەشتیان پێ نەدراوە، بەڵام ئەوانە لەژێر ویستی خودان گەر بیەوێ لێیان دەبورێ و بیەوێ ئەشکەنجەیان دەدات. ڕەنگە کردەوەی چاکی وا گەورە و مەزنیشیان هەبێت لە دۆزەخ رزگاریان بکات، واش دەبێت بە تکای تکاکاران لە دۆزەخ دەرباز دەبن، یان دەچنە دۆزەخ و هێندی خودا بیەوێ تێیدا دەمێننەوە، ئەوجا بە تکای تکاران و میهری میهرەبانترین میهرەبانان لە دۆزەخ دێنە دەرێ.

٢- ئەوانەی کۆچ ناکەن .

دروست نیە موسڵمان لە خانەی کوفردا نیشتەجێ بێ ئەگەر خانەی ئیسلام هەبێ، بەتایبەتی ئەگەر مانەوەی لە وڵاتی کافراندا فیتنە و ئاشوبی بێنێتە ڕێ. خوداش پاکانە و بیانوی ئەوانەی قبوڵ نەکرد کە لە کۆچی وەپاش کەوتن. پەروەردگار هەواڵی ئەوەشی پێ داوین کە فریشتەکان بیانوبڕی ئەو جۆرە کەسانە دەکەن لە سەرەمەرگدا. ئەو پاکانەشیان لێ وەرناگرن کە گوایە ئەوان لەسەر زەویدا بێهێز و بێدەسەڵات بون:

﴿إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمْ الْمَلاَئِكَةُ ظَالِمِي أَنْفُسِهِمْ قَالُوا فِيمَ كُنتُمْ قَالُوا كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الأَرْضِ قَالُوا أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُوا فِيهَا فَأُوْلَئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَسَاءَتْ مَصِيرًا، إِلاَّ الْمُسْتَضْعَفِينَ مِنْ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ لاَ يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلاَ يَهْتَدُونَ سَبِيلاً: ئەو کەسانەی هەر لەجێی خۆیان مانەوەو ئەو ستەمەیان لەخۆ کرد، کاتێ فریشتەی گیانکێشان پێیان گوتن: لەسەر چ بارێك بون؟ گوتیان: ئێمە لەسەر زەویدا هێز و وزەلێگیراو بوین، پێیان گوت: مەگەر زەوی خودا بەرفراوان و واڵا نەبو، تاکو کۆچی تێدا بکەن و بڕۆنە جێگەیەکیتر؟ جا جێگەی ئەوانە دۆزەخە و سەرەنجامێکی بەدفەڕانەیان هەیە. بێجگە لەو دەستە پیاو و ژن و منداڵە ناتەوان و کزۆڵانەی چ چارەیەکی نینە بۆ دەرچون، لەو ژینگەیەدا چ ڕێگایەك نادۆزنەوە﴾النساء:٩٧-٩٨.

جا خودای مەزن لەنێوان ئەوانەدا تەنیا تەوازۆ(عذر)ی ئەو بێدەسەڵاتانەی وەرگرت کە چ دەرەتانێکی دەرکەوتنیان بۆ نەڕەخسا بو، و ئەو ڕێگەیان نەدۆزیبوە کە بە خانەی ئیسلامیان دەگەیەنێت.

**٣- ئەوانەی لە حوکمدا ستەمکارن:**

**خودا بۆیە شەریعەتی دابەزاندوە، تا دادوەری لەنێو خەڵکیدا بەرپا بکات و، فەرمانیشی بە بەندە گەلی خۆی کردوە دادگەر بن:**

﴿إِنَّ اللَّـهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ: **خودا فەرمان بە دادگەریو چاکە دەکات.**﴾النحل: ٩٠. **جا ئەمەی بەسەر حوکم و قازییانیشدا فەرز کردوە، دادگەربن و ستەمکار نەبن:**

﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تُؤَدُّوا الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُمْ بَيْنَ النَّاسِ أَنْ تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ: **خودا فەرمانی پێداون ڕاسپاردان بە خاوەنەکانیان بدەنەوە، هەرکاتێك لەنێو خەڵکی داوەریتان کرد، دادگەرانە داوەری بکەن و فەرمان بدەن.**﴾النساء:٥٨.

**هەروەك خودا هەڕەشەی دۆزەخی لەوانە کردوە کە حوکمی حەق وڕەوا دەرناکەن، پێغەمبەرﷺ دەفەرمێ:**

**((القضاة ثلاثة: واحد في الجنة، واثنان في النار، فاما الذي في الجنة، فرجل عرف الحق و قضى به، و رجل عرف الحق فجار في الحكم، فهو في النار، و رجل قضى للناس على جهل، فهو في النار: قازیەکان سێ جۆرن: یەکێکیان لە بەهەشتە و دوانیان لە دۆزەخ، هەرچی ئەوەی بەهەشتە پیاوێکە هەقی ناسیوە و حوکمی پێ کردوە، ئەو پیاوەی هەقیش ناسیبێ و لە حوکمدا ستەمکار بێت، ئەوە دەچێتە دۆزەخ، پیاوێکیش بە نەزانی حوکم بەسەر خەڵکی دابدات، ئەویش دەچێتە دۆزەخ))**[١].

**٤- درۆ هەڵبەستن بەزاری پێغەمبەری خواوەﷺ:**

**ئیبنی ئەثیر لە کتێبی (جامع الأصول)دا بەندێکی سازداوە، گەلێك فەرمودەی تێدا ڕیزکردون کە مرۆڤ لە درۆ هەڵبەستن بەزاری پێغەمبەرﷺ ئاگادار دەکەنەوە. هەروەك دەفەرمێ: ((لاتكذبوا عليَّ، فانه من كذب عليَّ يلج النار: درۆ بەزاری من هەڵمەبەستن، ئەوی درۆ بە زاری من بکات دەچێتە ناو دۆزەخێ))**[٢].

**هەروەها بوخاری لەسەلەمەی کوڕی ئەکوەع دەگێڕێتەوە کە دەڵێ: لە پێغەمبەرﷺم بیستوە فەرموی:**

---

[١] رواه بريدة بن الحصيب؛ اخرجه ابوداود؛ جامع الأصول: (١٦٧/١٠) وقال محقق الكتاب: هو حديث صحيح.

[٢] رواه البخاري ومسلم والترمذي عن علي بن ابي طالب

((من تقول عليَّ مالم أقل، فليتبوأ مقعده في النار: ئەوەی قسەیەك بەزاری من هەڵبەستێت کەمن نەمگوتبێ، بانشینگەی خۆی لەنێو دۆزەخدا دابنێ)).

هەروەك زوبەیری کوڕی عەوام دەڵێ: لە پێغەمبەرﷺم بیست فەرموی:

((من كذب عليَّ متعمدا فليتبوأ مقعده من النـــار: ئەوی بە ئەنقەست درۆ بەزاری من هەڵبەستێت، نشینگەی خۆی لە دۆزەخدا بگرێت))[1].

هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرمێ: ((ان كذبا عليَّ ليس ككذب على احد، فمن كذب عليَّ متعمدا فليتبوأ مقعده من النـــار: درۆ هەڵبەستان بەزاری من وەك درۆ هەڵبەستان بەزاری کەسێکی دیکە نیە، جا ئەوی بە ئەنقەست درۆ بەزاری من هەڵبەستێت، با ئەوکەسە نشینگەی خۆی لە دۆزەخدا بگرێت))[2].

**٥- زلفیزی( الكبر ):**

زلفیزی یەکێکە لە تاوانە گەورەکان. لەئەبو هورەیرەوە هاتوە، دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرموی:

((يقول الله تعالى: الكبرياء ردائي، و العظمة ازاري، فمن نازعني واحدا منهما ادخلته النـــار – وفي رواية– أذقته النار: خودای بەرز فەرموی: خۆ بەگەورەزانی جلکی منە و مەزنێتی پۆشاکی منە، هەرکەسێ لەیەکێکیان کێشەی لەگەڵ کردم دەیبەمە دۆزەخ))[3].

لە ئیبنی مەسعودەوە هاتوە، دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرموی:

((لا يدخل الجنة احد في قلبه مثقال ذرة مـــن كـــبر: ئەوی تۆزقاڵێك زلفیزی دە دڵیدا هەبێت ناچێتە بەهەشت)).

جا پیاوێك گوتی: پیاو هەیە حەز دەکات پۆشاکی جوان بێ و پێڵاوی جوان بێت. فەرموی: ((ان الله جميل يحب الجمال، الكبر: بطر الحق، وغمـــط النـــاس: خودا جوانە و جوانیی خۆشدەوێت، زلفیزی بریتیە لە حەق نەسەلماندن و بە کەم گرتنی خەڵکە))[4].

---

[1] رواه البخاري في صحيحه، وابوداود في سننه عن عبدالله بن الزبير عن ابيه الزبير بن العوام.

[2] رواه البخاري ومسلم عن مغيرة بن شعبة؛ جامع الأصول: (١٠/٦١١)، کۆمەڵێك گێڕانەوەی دیکەیشی هێناوەتەوە ئەگەر مەبەستت بو بگەڕێوە بۆی.

[3] رواه مسلم.

[4] رواه مسلم؛ سەرنجی ئەم دو فەرمودەیەو فەرمودەی دیکەش لەبارەی لۆمەو ترساندن لە زلفیزی لە (مشكاة المصابيح: ٣/٦٣٤-٦٣٥) بدە.

### ٦- بكوژی بەناهەق:

خودای بەرز دەفەرمێ: ﴿وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَـزَاؤُهُ جَـهَنَّمُ خَـالِدًا فِيـهَا وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَابًـا عَظِيمًـا: هەرکەسێ بە قەستی بڕوادارێك بکوژێت، سزای دۆزەخە و هەمیشە لەوێدا دەمێنێتەوە و دەکەوێتە بەرخەشم و ڕقی خوا و لەمیهری خودا بێ بەشە و، ئەشکەنجەی مەزنی بۆ ئامادە کردوە﴾النساء:٩٣.

جا لە دینی خودا لە سێ هۆیان بترازێ بەهیچ جۆرێکی دیکە دروست نیە مرۆڤی موسڵمان بکوژرێت، هەروەك پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ:

((لايحل دم امرئ مسلم يشهد ان لا اله الا الله، واني رسول الله، الا بـاحدى ثـلاث، النفـس بالنفس، الثيب الزاني، التارك لدينه المفارق للجماعة: هەر موسڵمانێکی شایەدی بدا بێجگە لە خودا چ خوای دی نینە و، منیش پێغەمبەری خوام، خوێنی حەڵاڵ نیە مەگەر بە سێ هۆیان؛ کەسێکی کوشتبێ و لەباتی بکوژرێتەوە، یان هاوسەردارێکی زیناکار بێت، یان وازی لە دینەکەی هێنابێ و لە کۆمەڵ جودا بوبێتەوە)).[1]

هەروەها لە صەحیحی بوخاریدا لە ئیبنی عومەر (ڕەزای خودای لێبێ) هاتوە، دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرموی:

((لن يزال المؤمن في فسحة من دينه مالم يصب دما حرامـا: موسڵمان هێشتا لەبەرفرەیی دینەکەیدایە تا دەستی بە خوێنی حەرام سور نەبوبێت)).

ئیبنی عومەر دەڵێ: (یەکێك لە کارە بەهیلاك بەرەکان کە درەبازبونی نیە هی کەسێکە خۆی لە بە ناهەق ڕژانی خوێنەوە بگلینێ).[2]

پێغەمبەرﷺیش موسڵمانانی لەوە ئاگادار کردۆتەوە کە لەگەڵ یەکدی بجەنگێن و هەواڵی داوەکە کوژراو و بکوژ لە دۆزەخن. لە (ئەبی بەکرە)وە هاتوە دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرموی:

((اذا تواجه المسلمان بسيفهيما، فالقـاتل و المقتـول في النـار: ئەگەر دو موسڵمان بە شمشێرەکانیان ڕوبەڕو بونەوە، بکوژ و کوژراو دەچنە دۆزەخ))، دەڵێ گوتم، یان

---

[1] رواه البخاري ومسلم عن ابن مسعود، تفسير ابن كثير: (٢/٣٥٥).

[2] رواه البخاري في صحيحه؛ كتاب الديات، باب قول الله تعالى: (ومن يقتل مؤمنا متعمدا)؛ فتح البـاري: (١٢/١٨٧).

**گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا بکوژ قەیناکات، ئەی کوژراوەکە بۆچی؟**

**فەرموی:** ((انه كان حريصا على قتل صاحبه: **چونكە مكوڕ بو لەسەر كوشتنی براكەی**))[1].

**بۆیە بەندە چاكەكە رازی نەبوە براكەی بكوژێت، لەترسی ئەوەی دوچاری ئاگری دۆزەخ نەبێت، ئیدی بكوژ تاوانی خۆی و براكەی هەڵدەگرێت:**

﴿وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ ابْنَيْ آدَمَ بِالْحَقِّ إِذْ قَرَّبَا قُرْبَانًا فَتُقُبِّلَ مِنْ أَحَدِهِمَا وَلَمْ يُتَقَبَّلْ مِنَ الآخَرِ قَالَ لأَقْتُلَنَّكَ قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللَّهُ مِنَ الْمُتَّقِينَ، لَئِنْ بَسَطتَ إِلَيَّ يَدَكَ لِتَقْتُلَنِي مَا أَنَا بِبَاسِطٍ يَدِيَ إِلَيْكَ لأَقْتُلَكَ إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ رَبَّ الْعَالَمِينَ، إِنِّي أُرِيدُ أَنْ تَبُوءَ بِإِثْمِي وَإِثْمِكَ فَتَكُونَ مِنْ أَصْحَابِ النَّارِ وَذَلِكَ جَزَاءُ الظَّالِمِينَ: **چیرۆكی دو كوڕی ئادەمیان بە هەق بەسەردا بخوێنەوە. ئەو كاتەی هەریەكە لەو دوانە بۆ نێزیك بونەوە لە خوا قوربانیەكانیان دا. بەلاّم هی یەكێكیان قبولّ كرا ئەوی دی قبولّ نەكرا. ئەوی قوربانیەكەی لێ وەنەگیرا بو گوتی: دەبێ بتكوژم. گوتی: من تاوانم نیە، خوا تەنیا قوربانی لە پارێزكاران قبولّ دەكات. ئەگەر تۆ بۆ كوشتنی من دەست درێژ بكەیت، من دەست درێژكەر نیم. بەڕاستی من لە پەروەردگاری جیهانیان دەترسم. بەڕاستی دەمەوێ گوناهی خۆم و خۆت هەڵگری و ببیە خەڵكی دۆزەخ، و ئەمە سزای ستەمكارانە**﴾المائدة:٢٧-٢٩.

**٧- ریبا خۆران:**

**ریبا لەو گوناهانەیە كە خاوەنەكەی بە هیلاك دەبات. خودای گەورەش لەبابەت ئەو كەسانەی فەرمانی حەرام كردنی ریبایان پێگەیشتوە و هێشتا هەر دەیخۆن، دەفەرمێ:**

﴿وَمَنْ عَادَ فَأُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ: **هەر كەسێكیش بگەڕێتەوە سەر سوخۆری دۆزەخنشینە و هەتا هەتایی تێیدا دەمێنێتەوە**﴾ البقرة:٢٧٥.

**هەروا دەفەرمێ:** ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَأْكُلُوا الرِّبَا أَضْعَافًا مُضَاعَفَةً وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ، وَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ: **ئەی كەسانێكی بڕواتان هێناوە ریبای چەند بەرامبەر مەخۆن و بۆ خوا پارێزكار بن بەڵكو سەردەكەون، و خۆبپارێزن**

[1] رواه مسلم، كتاب الفتن، باب اذا تواجه المسلمان بسيفيهما: (٤/٢٢١٣).

لەو ئاگرەی بۆ بێبڕوایان ئامادە کراوە﴾آل عمران:١٣٠-١٣١.

پێغەمبەرﷺیش سوخۆریی بە یەکێك لەو هەفت گوناهە ژماردوە کە خاوەنەکانیان بە هیلاك دەبەن، هەروەك دەفەرموێ:

((اجتنبوا السبع الموبقات: لەو هەفت گوناهەوە دوربکەون کە مایەی هیلاك چونن)).

گوتیان: ئەوانە چین ئەی پێغەمبەری خواﷺ؟

فەرموی: ((الشرك بالله، والسحر، وقتل النفس التي حرم الله الا بالحق، وأكل الربا، وأكل مال اليتيم والتولي يوم الزحف، وقذف المحصنات الغافلات المؤمنات: هاوبەشدانان بۆ خودا و جادو و کوشتنی بەناهەق و ریبێدەخواردن و خواردنی ماڵی هەتیوان و هەڵاتن لە ڕۆژی لەشکرکێشی و ناوزڕاندنی ئافرەتانی داوێن پاکی بێئاگای بڕوادار)).[1]

### ٨- بەناهەق خواردنی ماڵی خەڵکی:

لەو ستەمە گەورانەی خاوەنەکەی شایستەی ئاگری دۆزەخ دەکات بەناهەق خُواردنی ماڵی خەڵکیە، هەروەك خوای بەرز دەفەرمێ:

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إِلاَّ أَنْ تَكُونَ تِجَارَةً عَنْ تَرَاضٍ مِنْكُمْ وَلاَ تَقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا، وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ عُدْوَانًا وَظُلْمًا فَسَوْفَ نُصْلِيهِ نَارًا وَكَانَ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرًا: هۆ ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ماڵ و سامانی یەکتر لەناوەخۆ بە ناهەق مەخۆن، مەگەر بازرگانیەك بێ کە بە خۆشنودی هەردو لا ئەنجام بدرێ و سەربگرێ، و خۆتان مەکوژن، بەڕاستی خوا سەبارەت بە ئێوە میهرەبانە. هەر کەسێکیش بە دەستدرێژی وستەمکاری ئەم کارە بکات، زو دەیخەینە ناو ئاگر، ئەمەش لای خوا زۆر ئاسانە﴾ النساء:٢٩-٣٠.

جا ئەو کەسەی بەناهەق ماڵی خەڵکی بخوات، ئەوا ماڵی هەتیوانیش بەزۆر دەخوات، خودای بەرز لەبەر لاوازییان و سانایی خواردنی ماڵیان و بێزەوەری ئەو تاوانە بەتایبەت باسی ماڵی هەتیوانی فەرموە:

﴿إِنَّ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَالَ الْيَتَامَى ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ نَارًا وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا: ئەو کەسانەی بەناڕەوا دارایی هەتیوان دەخۆن، با بزانن ئاگرێ دەخەنە

---

[1] في صحيحين عن ابي هريرة؛ متفق عليه.

**هەناویانەوەو توشی ئاگرێکی بە هەڵپەو گڕ دەبن.﴾ النساء: ١٠.**

**٩- وێنەکێشان:**

**وێنەکێشان لە ڕۆژی دواییدا ئەشکەنجەیان لە هەمو خەڵکیتر سەختترە، ئەو وێنەکێشانەی هاوشێوەی بەدیهێنراوانی خودا دروست دەکەن، لە هەردو صەحیحاندا لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعود هاتوە، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خواﷺ بو دەیفەرمو:**

((اشد الناس عذابا عند الله المصورون: **وێنەکێشەکان لەلای خودادا ئەشکەنجە و ئازاریان لە هەمو خەڵکی سەختترە))**[1].

**لە ئیبنو عەبباسیشەوە هاتوە دەڵێ: لە پێغەمبەرﷺم بیست دەیفەرمو:**

((کل مصور في النار، يجعل له بكل صورة صورها نفسا، فيعذبه الله في جهنم: **هەمو وێنەکێشێك لە دۆزەخدایە، دەبێت بۆ هەر وێنەیەك کە کێشاویەتی گیانی بکاتە بەر، جا خودا لە دۆزەخدا ئەشکەنجەی دەدا))**[2].

**هەروەها لە خاتو عایشەوە هاتوە لە پێغەمبەرﷺ لەبارەی ئەو بالیفەی وێنەی تێدابو فەرموی:**

((ان اصحاب هذه الصور يعذبون يوم القيامة، و يقال لهم: احيوا ما خلقتم: **خاوەنی ئەم وێنانە لە ڕۆژی پەسلاندا ئەشکەنجە دەدرێن و پێیان دەگوترێت: ئەوانە بژێنن کە دروستتان کردون))**[3].

**دیسان لە خاتوعایشەوە هاتوە، لە پێغەمبەرەوەﷺ فەرموی:**

((اشد الناس عذابا الذين يضاهون بخلق الله: **ئەوانەی ئەشکەنجەیان لەهەمو خەڵکی زیاترە لە ڕۆژی قیامەتدا ئەوانەن کە هاوشێوەی بەدیهێنراوانی خوا دروست دەکەن))**[4].

**هەروا لە ئەبو هوریرە (ڕەزای خوای لێبێ) هاتوە: گوێم لێ بو پێغەمبەرﷺ فەرموی:**

((قال الله تعالى: ومن اظلم ممن ذهب يخلق كخلقي، فليخلقوا ذرة، او ليخلقوا حبة، او

---

[1] مشكاة المصابيح: (٢/٥٠٥).
[2] متفق عليه؛ هەمان سەرچاوە.
[3] متفق عليه؛ هەمان سەرچاوە.
[4] متفق عليه؛ هەمان سەرچاوە.

شــــعيرة: خـوداى بـەرز دەفــەرمى: كــێ لــەو كەســە ســتەمكارترە، كــە دەڕوات وەك بەديهێنراوانى من دروست دەكات، يا گەرديلەيەك دروسـت بكـەن، يـا دانەوێڵەيـەك دروست بكەن، يان دەنكە جۆيەك بەدى بهێنن))[1].

**١٠- هۆگرى و ئاڵودەبونى ستەمكاران:**

هۆگرى ستەمكارانى دوژمنـانى خـودا و دۆستايەتى كردنيـان هۆكارێكى ديكـەى مايەى چونە دۆزەخە:

﴿وَلاَ تَرْكَنُوا إِلَى الَّذِينَ ظَلَمُوا فَتَمَسَّكُمْ النَّـــارُ: هۆگر و ئالودەى ئەوانە مەبن كە ستەمىَ دەكەن، دەنا بە ئاگر دەسوتێن.﴾هود:١١٣.

**١١- ئافرەتى پۆشتەى ڕوت و ئەوانى بە قامچى لە پشتى خەڵكى دەدەن:**

هــەر لــەو پۆلانــەى كــە ئـاگرى دۆزەخ دەچێـژن ئـەو ئافرەتـە فاسـقە نـا پۆشـتە و ڕوتانەن كە بەندەگەلى خودا توشى فيتنە دەكەن و، لـە سـەر تاعـەتى خـودا بـەردەوام نابن، ئەبو هوريرە (ڕەزاى خواى لێبێ) لە پێغەمبەرﷺ دەگێڕێتەوە:

((صنفان من اهل النار لم ارهما: قوم معهم سياط كاذناب البقر يضربون بها النـــاس، ونســـاء كاسيات عاريات، مميلات مائلات، رؤوسن كاسنمة البخت المائلة، لايدخلـــن الجنـــة و لايجـــدن ريحها، وان ريحها لتوجد من مسيرة كذا و كـــذا: دو جۆرى دۆزەخييـان هـەن مـن نـەمديون؛ كەسانێك قامچى وەك كلكە چێڵيان لايە لـە خـەڵكى پـێ دەدەن، لەگـەڵ ئافرەتـانێكى ڕوتى پۆشتە خۆيان با دەدەن و دڵى خەڵكى بۆ لاى خۆيان ڕادەكێشن، سـەريان وەكو كوپـەرانى حوشتر گرمۆڵەيە، نەدەچنـە بەهەشـت و نـەبۆنى هەسـت پێدەكـەن، بۆنـى بەهەشتيش لە دورى هێندە و هێندە قۆناغەوە هەست پێدەكرێت))[2].

قورطوبى لـەبارەى ئەوانـەى قامچى وەك كلكە چێڵيـان پێيـە، دەڵـێ: (ئـەم شـێوە قامچيە تا ئێستا لەلاى ئێمە، لـە مـەغريبدا دەبينـرێت) هـەروەها صديق حەسەن خان لەسـەر ئـەم وتەيـەى قورطوبى دەڕوات و دەڵێ: (بـەڵكو ئـەو دياردەيـە لەهـەمو كـات و شوێنێكدا دەبينرێت، ڕۆژ بە ڕۆژيش لاى سەران و سەركردەكان زياتر دەبێت. جا خۆ بـە خـوا پـەنا دەگريـن لەهــەمو شـتێكى كـە ڕكـى لێيـە). دەڵێـم: ئێمـەش تـا ئێسـتا

---

[1] متفق عليه؛ هەمان سەرچاوە.

[2] اخرجه مسلم والبيهقي واحمد؛ سلسلة احاديث الصحيحة: (٣/٣١٦) ورقم الحديث (١٣٢٦).

خەڵکانێکی زۆر لەو جۆرە کەسانە دەبینین لە زۆر وڵاتان بەمجۆرە لە خەڵکی دەدەن. ئەوانە و هاوشێوەکانیان توناو تون چن.

هەرچی ئافرەتانی پۆشتەی ڕوتیشن، لەسەردەمی ئەمڕۆدا گەلێك زۆرن، ڕەنگە پێشتر چ کاتێك هێندی ئەم سەردەمەی ئێمە فیتنەیان بڵاوەی نەکردبێت، بەهەمان ئەو شێوەیەش کە پێغەمبەرﷺ وەسفی پێ کردون؛ پۆشتەی ڕوتن، بەلەنجە و لار خۆ بادەدەن، دڵان بۆ لای جەستەی خۆیان رادەکێشن، سەریان وەکو کۆپەرانی حوشتر گرمۆڵەیە.

**١٢- ئەوانی ئاژەڵان ئازار دەدەن:**

موسلیم لە صەحیحەکەیدا لە جابیرەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرموی:

((عرضت علي النار، فرأيت فيها امرأة من بني اسرائيل تعذب في هرة لهـــا، ربطتـــها فلـــم تطعمها، ولم تدعها تاكل من خشاش الارض، حتي مـــاتت جوعـــا: دۆزەخم پێ نیشان درا، ژنێکی بەنی ئیسرائیلم تێدا دیت لەبەر پشیلەیەکی ئەشکەنجە دەدرا، کە بەستبویەوە و خواردنی نەدابویێ و بەرەڵڵای نەکردبو تا لە جر و جانەوەری زەوی بخوات، تا لەبرسان مرد))[1].

جا ئەگەر ئەمە حاڵی یەکێك بێت پشیلەیەکی ئازار دابێت، ئەدی حاڵی ئەو کەسە چۆن دەبێت کە لە ئەشکەنجەدانی بەندان هونەر دەنوێنێت؟! ئەدی ئەوە چۆن دەبێت کە ئەشکەنجەدانەکە بۆ صاڵحان بێت و تەنیا لەبەر ئیمان و ئیسلامەکەشیان بێ؟!

**١٣- دڵڕاست نەبون لە زانست خوازیدا:**

مونذیری حافیظ گەڵێك فەرمودەی هاوردون کە ئەو کەسە دەترسێنن بۆ غەیری خوا خۆی فێردەکات، ئێمەش لێرەدا هەندێکیان بۆت هەڵدەبژێرین: لە ئەبو هورەیرەوە، دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرموی:

((من تعلم علما مما يبتغي به وجه الله تعالى، لا يتعلمه الا ليصيب به عرضا من الدنيـــا لم يجـــد عرف الجنة يوم القيامة، يعني ريحها: ئەوەی زانستێك فێربو بەتەنیا هەر مەبەستی خێری خودا بوبێ، کەچی بۆ ئەوە کاری بهێنێت پشکێکی دنیای پێ وەدەست بێنیت. ئەوە

---

[1] مشكاة المصابيح (٣/٦٨٨).

**له رۆژی دواییدا بۆن و بەرامەی بەهەشت هەست پێ ناکا))**[1].

**هەروەها لە جابیرەوە هاتوە، دەڵێ، پێغەمبەرﷺ فەرموی:**

((لا تعلموا العلم لتباهوا به العلماء، ولا تماروا به السفهاء، ولا تخيروا به المجالس، مـن فعـل ذلك فالنار النار: **خۆفێرە زانست مەکەن تا بەهۆیەوە شانازی لەناو زانایانی پێ بکەن. یا لەگەڵ گێلۆکان دەمەبۆڵەی پێ بکەن، یا سەری کۆڕو مەجلیسانی پێ هەڵبژێرن. چونکە هەرکەسێك وابکات بۆ نێو ئاگری دۆزەخ دەچێت))**[2].

**لە ئیبنی عومەریشیەوە هاتوە، لە پێغەمبەرﷺەوە گێڕاویەتەوە فەرموی:**

((من تعلم علما لغير الله، او اراد به غير الله، فليتبوأ معقده من النار: **هەرکەسێك بۆ غەیری خوا خۆی فێری زانستێك کرد، یا مەبەستی لەو فێربونە غەیری خودا بو، با نشینگەی خۆی لە دۆزەخ دیاری بکات))**[3].

**١٤- ئەوانەی لە دەفری زێڕ و زیو دەخۆنەوە:**

**لەبوخاری وموسلیمدا لە ئوم سەلەمەوە هاتوە: پێغەمبەرﷺ دەفەرمێ:**

((الذي يشرب في انية الذهب والفضة انما يجرجر في بطنه نار جهنم: **ئەو کەسەی لە دەفری زێڕ و زیودا دەخواتەوە، ئەوا ئاگری دۆزەخ لەنێو زگیدا قوڕەی دێت))**.

**لە گێڕانەوەیەکی موسلیمیشدا:** ((ان الذي ياكل و يشرب في انية الفضة و الذهـب...: **ئەو کەسەی لە دەفری زیو و زێڕ دەخوات و دەخواتەوە...))**[4].

**هەروەها لە حوذەیفەوە هاتوە: دەڵێ لە پێغەمبەرﷺم بیست دەیفەرمو:**

((لاتلبسوا الحرير و الديباج، و لاتشربوا في انية الذهب و الفضة، و لاتاكلوا في صحافـها، فانها لهم في الدنيا، وهي لكم في الاخرة: **ئاوریشم و ئارموش و دیباج مەپۆشن و، لەدەفری زیو و زێڕ مەخۆنەوە و، لە قاپ و قاچاخەکانیاندا مەخۆن، ئەوانە لە دنیایێ بۆ ئەوانن، لە دوایینشیدا بۆ ئێوەن))**[5].

---

[1] رواه ابوداود وابن ماجة، وابن حبان في صحيحه، والحاكم وقال: صحيح على شرط البخاري ومسلم.

[2] رواه ابن ماجة، وابن حبان في صحيحه، والبيهقي.

[3] رواه الترمذي وابن ماجة كلاهما عن خالد بن دريك عن ابن عمر، و لم يسمع منه. ورجال اسنادهما ثقات. انظر هذه الأحاديث وتخريجها في (الترغيب والترهيب) للحافظ المنذري: (٩١/١).

[4] مشكاة المصابيح: (٤٦٢/٢).

[5] متفق عليه؛ مشكاة المصابيح: (٤٦٢/٢).

**١٥- ئەو كەسەی ئەو دارە دەبڕێت كە سێبەر بۆ خەڵكی دەكات:**

**لە عەبدوڵلای كوڕی حوبەیش دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرموی:**

((من قطع سدرة صوب الله راسه في النـار: **هەركەسێك درەختێكی سێبەردار ببڕێ كە خەڵك لەبەری دەحەسێنەوە، خودا سەری لە ئاگری دۆزەخ ڕادەكات**))[1].

**هەروەها دەفەرموی:** ((ان الذين يقطعون السدر يصبون في النار على رؤوسهم صبا: **ئەو كەسانەی درەختی سێبەردار دەبڕنەوە كە خەڵك لەبەری دەحەسێنەوە، لەسەر سەریان هەڵدەڕیژرێنە نێو ئاگری دۆزەخ**))[2].

**١٦- سزای خۆكوشتن:**

**لەهەردو صەحیحاندا لە ئەبو هوریرە (ڕەزای خوای لێبێ) هاتوە كە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:**

((من قتل نفسه بحديدة، فحديدته في يده، يجأبها في بطنه في نار جهنم خالدا مخلدا فيها ابدا، ومن قتل نفسه بسم، فسمه في يده يتحساه في نار جهنم خالدا مخلدا فيها ابدا، ومن تردى من جبل فقتل نفسه فهو يتردى في نار جهنم خالدا مخلدا فيها ابدا: **ئەو كەسەی خۆی بە ئاسنێك بكوژێت، ئاسنەكەی لە دەستی دایە و، بە زیندویی و نەمری تا هەتایێ لەنێو ئاگری دۆزەخدا زگی خۆی پێ هەڵدەدڕێت، هەركەسێكیش بە ژەهر خۆی بكوژێت، ژەهرەكەی لە دەستی دایە و، بە زیندویی و نەمری تاهەتایی لەنێو ئاگری دۆزەخدا هەڵیدەقوڕێنێ، ئەو كەسی لەشاخێكیش خۆی هەڵدێرێ و خۆی بكوژێ، بەزیندوییو نەمری تاهەتایی لەنێو ئاگری دۆزەخدا هەڵدەدێرێ**))[3].

**لەصەحیحی بوخاریشدا لە ئەبو هوریرەوە گێڕایتیەوە كە پێغەمبەرﷺ دەفەرمێ:**

((الذي يخنق نفسه يخنقها في النار، والذي يطعنها يطعنها في النار: **ئەو كەسەی خۆی بخنكێنێت، لە دۆزەخدا خۆی دەخنێكنێت و، ئەو كەسی خۆی بپێكێ لە دۆزەخدا خۆی دەپێكێ**))[4].

---

[1] رواه ابوداود: مشكاة المصابيح: (٢/١٢٥)، وأولارده الشيخ ناصر في (صحيح الجامع): (٥/٣٤١) رقم الحديث (٦٣٥٢) وعزاه الى ابي داود والضياء في (المختارة) وقال: صحيح.

[2] رواه البيهقي بأسناد صحيح عن عائشة: عزاه في (صحيح الجامع) (٢/٨٨) الى البيهقي في (السنن) وقال فيه: صحيح.

[3] التخويف في النار: ص١٤٨

[4] صحيح الجامع: (٥/١١٤).

## بەندی شەشەم

## زۆریی دۆزەخنشینان

### جێباسی یەکەم

### ئەو دەقانەی بەڵگەی ئەو زۆریەن

دەقگەلێکی زۆر و فرە هاتون کە بەڵگەی ئەوەن بینادەمگەلێکی زۆر دەچنە دۆزەخ و ژمارەیەکی کەمیان دەچنە بەهەشتێ.

خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَكْثَرُ النَّاسِ وَلَوْ حَرَصْتَ بِمُؤْمِنِينَ: هەرچەندە زۆر بەتاسەو داواکاربی، ئەم مەردمە زۆربەیان بڕواناهێنن.﴾یوسف:١٠٣.

هەروەها دەفەرمێ: ﴿وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُ فَاتَّبَعُوهُ إِلاَّ فَرِيقًا مِنْ الْمُؤْمِنِينَ: شەیتان دی کە گومانی سەبارەت بەوان وەراست گەڕا، شوێنی کەوتن، لە دەستەیەکی بڕواداران بترازێت هەمو پەیڕەویان لەو کرد﴾سبأ:٢٠.

خودای گەورە بەشەیتانی ڕاگەیاند: ﴿لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنْكَ وَمِمَّنْ تَبِعَكَ مِنْهُمْ أَجْمَعِينَ: دۆزەخ لە تۆ و لەوانی پەیڕەویت دەکەن، پڕ دەکەم.﴾ ص:٨٥.

سەرەڕای ئەوەی ژمارەی ئادەمیزادی بێبڕوا گەلێکن، هەرکەسێکی بێبڕوابێت دە دۆزەخێ دەکەوێت. بەڵگەی زۆری ئەو بێبڕوا و هاوبەش دانەرانەی بانگەوازی پێغەمبەرانیان ڕەتکردۆتەوەئەوەیە کە لە ڕۆژی قیامەتێدا پێغەمبەر هەیە دێت و لە خوار دە کەسانی لەگەڵ دایە، پێغەمبەر هەیە پیاوێك یا دوی لەگەڵدایە . تەنانەت پێغەمبەرانێك بەتاقی تەنێ دێن و هیچ کەسێك بڕوای پێ نەهێناون. پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((عرضت علی الامم فرأیت النبي و معه الرهیط، والنبي ومعه الرجل و الرجلان، والنبي و لیس معه احد...: ئوممەتەکانم پێ نیشاندران، جا پێغەمبەرم دیت لەخوار دە کەسان(دەستەیەك)ی لەگەڵ بو، پێغەمبەریشم دیت پیاوێك و دو پیاوی لەگەڵ بو،

پێغەمبەریش هەبو کەسی لەگەڵدا نەبو.)) [1].

گەلێك دەقیش وادەگەیەنن لە هەزار ئادەمیزادان نۆسەدو نەودو نۆیان دەچنە دۆزەخ و تەنیا یەکێکیان لێ دەچێتە بەهەشت.

پێغەمبەرﷺ دەفەرمێ: ((یقول الله: یاادم، فیقول: لبیك و سعدیك و الخیر في یدیك، ثم یقول: اخرج بعث النار، قال: وما بعث النار؟ قال: من کل الف تسعمائة و تسعة و تسعین، فذاك حین یشیب الصغیر، و تضع کل ذات حمل حملها، وتری الناس سکری و ماهم بسکری، ولکن عذاب الله شدید: خودای بەرز دەفەرمێ: ئەی ئادەم، ئادەم دەڵێ: لەخزمەت و بەرفەرمانم، خێر لەدەستانی تۆدایە، پاشان دەفەرمێ: نێردەی دۆزەخ دەربهێنە، دەڵێ نێردەی دۆزەخ چیە؟ دەفەرمێ: لەهەر هەزاری نۆسەد و نەوەد و نۆ. جا ئەو دەمە منداڵ پیر دەبێت و هەمو ئەوانەی دوگیانن سکەکەیان دادەنێن و خەڵکی بەسەرخۆش دەبینی،کەچی سەرخۆش نین، بەڵام ئەشکەنجەی خودا سەختە)).

جا ئەوە زۆر سەخت هاتە بەر چاوی یاوەران، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، کامەمان ئەو پیاوەین کە ڕزگاری دەبێت؟ فەرموی:

((ابشروا، فان من یاجوج و ماجوج الفا و منکم رجل، ثم قال: والذي نفسي بیده، اني لأطمع ان تکونوا ثلث اهل الجنة: قال: فحمدنا الله و کبرنا، ثم قال: والذي نفسي بیده اني لأطمع ان تکونوا شطر اهل الجنة، ان مثلکم في الامم کمثل الشعرة البیضاء في جلد الثور الاسود، او کالرقمة في ذراع الحمار: موژدەتان لێبێت، هەزار لە یاجوج و ماجوجە و یەك پیاو لەئێوەیە. پاشان فەرموی: سوێند بەو زاتەی گیانی منی وەدەستە. تەمام وایە ئێوە سێیەکی بەهەشتییان بن دەڵێ: سوپاسی خوامان کرد و بە گەورەمان دانا، پاشان فەرموی: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە حەز دەکەم و هیوام وایە ئێو نیوەی ئەهلی بەهەشت بن. ئێوە لەچاو ئوممەتەکانی دی وەکو تاڵە موێکی سپی وان لە گایەکی رەشدا، یا وەك پەڵەی پیلی گوێدرێژ وان)) [2].

هەروەها عیمرانی کوڕی حوصەین دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەرﷺ لە گەشتێکیدا بو

[1] رواه مسلم عن ابن عباس؛ صحیح مسلم: (١/١٩٨) ورقم الحدیث: (٢٢٠).

[2] رواه البخاري عن ابي سعید في کتاب الرقاق، باب قول الله ﷻ: (إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ) فتح الباري: (١١/٣٨٨).

هاوەڵانیشی لە ڕۆیشتنێدا پاش و پێش و جیاواز بون. جا پێغەمبەرﷺ بەم دو ئایەتە دەنگی بەرز کردەوە:

﴿يَاأَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ، يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّا أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى النَّاسَ سُكَارَى وَمَا هُمْ بِسُكَارَى وَلَكِنَّ عَذَابَ اللَّهِ شَدِيدٌ: ئەی خەڵکینە لە پەروەردگارتان بترسن، بەڕاستی بومەلەرزەی ڕۆژی دوایی شتێکی مەترسیدارو گەورەیە. ئەو ڕۆژی ئێوە دەیبینن هێند بەسامە هەر شیردەرێك لەترسان ساوای شیرەخۆرەی خۆی بەجێ دێڵی و هەمو دوگیانێك سکەکەی لەبار دەچێ و خەڵکی مەست و بێ هۆش دەبینی کەچی مەست نین، بەڵام ئەشکەنجەی خوا سەختە﴾الحج: ١-٢.

جا کە هاوەڵانی گوێیان لێبو خێرا حوشترەکانیان لێخوڕی و، زانیان بەنیازە فەرمودەیەك بڵێ، جا کە لە چواردەوری نزیك بونەوە فەرموی:

((أتدرون أي يوم ذاك، ذاك يوم ينادى آدمعليه السلام، فيناديه ربهعز وجل، فيقول: يا آدم ابعث بعثا الى النار. فيقول: يا رب، وما بعث النار؟ فيقول: من كل الف تسعمائة وتسعة وتسعين الى النار و واحد في الجنة: دەزانن ئەو ڕۆژە چیە ؟ لەو ڕۆژی ئادەم عليه السلام بانگ دەکرێ، پەروەردگاری بەرزو بەدەسەڵات بانگی دەکات و دەفەرموێ: هۆ ئادەم نێردەیەك بۆ دۆزەخ بنێرە. دەڵێ: پەروەردگارا، نێردەی دۆزەخ چیە ؟ دەفەرموێ: لەهەر هەزارێکی نۆ سەدو نەوەدو نۆ بۆ دۆزەخ و یەکێکیش بۆ بەهەشت.

دەڵێ: جا یاوەرانی پێغەمبەرﷺ دڵتەنگ بون و بزەیەکیان نەهاتە سەر لێوان. کە پێغەمبەرﷺ ئەوەی دیت فەرموی: ((أبشروا وأعملوا، فوالذي نفس محمد بيده إنكم لمع خليقتين ما كانتا مع شيء قط الاّ كثرتاه؛ يأجوج ومأجوج، ومن هلك من بني آدم وبني ابليس: موژدەتان لێ بێت و کردەوان وئەنجام دەن، سوێند بەوەی گیانی موحەممەدی وەدەستە، ئێوە لەگەڵ دو بەدیهێنراو دان، کە لەگەڵ هەر شتێك دا بن زۆری دەکەن، ئەوانیش یاجوج و ماجوج و بەهیلاك چوەکانی ئادەمیزادو نەوەکانی ئیبلیسن)).

دەڵێ: جا هاوەڵان گەش بونەوە.

پاشان فەرموی: ((أعملوا وأبشروا، فولذي نفس محمد بيده ما أنتم في الناس الاّ كالشامة في

جنب البعير أو الرقمة في ذراع الدابة: **كردان ئەنجام دەن و موژدان وەرگرن، سوێند بەوەی گیانی موحەممەدی بەدەستە. ئێوە لە چاو خەڵکی وەکو خاڵی تەنگەی حوشترێك یا ماکی قۆڵی جوڵندەیەك وان))**[1].

**تیرمیذی لە سونەنەکەیدا لە عیمرانی حوصەینەوە دەگێڕێتەوە، کاتێك ئەم ئایەتە دابەزی:**

﴿يَاأَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ: **هۆ خەڵکینە لە پەروەردگارتان بترسن، بەراستی بومەلەرزەی قیامەت زۆر گەورەو ترسناکە**﴾الحج:١.

**پێغەمبەرﷺ لە سەفەردا بو. فەرموی** ((أتدرون أي يوم ذلك؟: **دەزانن ئەو رۆژە چ رۆژێکە؟))، گوتیان: خوداو پێغەمبەرەکەی زاناترن.**

**فەرموی:** ((ذلك يوم يقول الله لآدم: ابعث بعث النار، قال: يا رب، وما بعث النار؟ قال تسعمائة وتسعة وتسعون الى النار و واحد الى الجنة: **ئەو رۆژەیە کە خودا بەئادەم دەفەرمێ: نێردەی دۆزەخێ بنێرە. دەڵێ: ئەی پەروەردگارم، نێردەی دۆزەخ چیە ؟ دەفەرموێ: نۆسەدو نەوەدو نۆ بۆ دۆزەخ و یەکێك بۆ بەهەشت)).**

**جا موسڵمانان دەستیان بە گریان کرد، ئەوجا پێغەمبەرﷺ فەرموی:**

((قاربوا وسددوا، فانها لم تكن نبوة قط الا كان بين يديها جاهلية، قال: فيؤخذ العدد من الجاهلية، فان تمت، والاّ كملت من المنافقين وما مثلكم ومثل الأمم الاّ كمثل الرقمة في ذراع الدابة. أو كالشامة في جنب البعير: **لێك نیزیك کەون و ڕاستاڵ بن، هەر پێغەمبەراتیەك هەبوبێ، جاهیلێتیەکی لە بەردەمدا بوە، فەرموی: ئەو ژمارەیەش لە جاهیلێتی وەردەگیرێ، جا ئەگەر تەواو نەبو، ئەگەر نا لە دوڕوان وەردەگیرێ، ئێوەش لەچاو ئوممەتەکانی دی وەك پەڵەی قۆڵی جوڵندە یا خاڵی تەنگەی حوشتر وان)). پاشان فەرموی:** ((إني لأرجو أن تكونوا نصف اهل الجنة: **تکام وایە ئێوە نیوەی خەڵکی بەهەشتێ بن)). جا تەکبیرێکیان کرد، ئەوجا گێڕەرەوە دەڵێ: نازانم باسی دوسێیەکی فەرمو یان نا**[2].

---

[1] رواه أحمد والترمذي والنسائي في كتاب التفسير في سننهما، وقال الترمذي: حسن صحيح؛ تفسير ابن كثير: (٤/٦١٠) وهو في مسند احمد (٤/٤٣٥).

[2] رواه الترمذي وقال حديث حسن صحيح، وكذا رواه الأمام احمد: تفسير ابن كثير: (٤/٦١٠).

ڕەنگە بگوترێ چۆن ئەم فەرمودانــە لەگــەڵ ئــەو فــەرمودە كــۆ دەكەیــەوە كــە لــە صەحیحی بوخاریدا لە ئەبو هورەیرەوە هاتوە كە پێغەمبەرﷺ دەفەرمێ:

((أول من يدعى يوم القيامة آدم، فتراءى ذريته، فيقال: هذا ابوكـــم آدم، فيقــول: لبيــك وسعديك، فيقول: اخرج بعث جهنم من ذريتك، فيقول: يا رب، كم اخرج؟ فيقول: اخرج مـــن كل مائة تسعة و تسعين: ئادەم یەكەمین كەسە لە ڕۆژی دواییدا بانگ دەكرێ، وەچەكانی خۆی پیشان دەدرێ و، دەگوترێ ئەمە ئادەمی بابتانە، دەڵێ: لەخزمەت و بەرفەرمانم، جا خودا دەفەرمێ: نێردەی دۆزەخ لە وەچەكانت دەربێنە، دەڵێ پەروەردگارم چەندی دەربێنم؟ دەفەرموێ: لە هەر سەدی نەوەدو نۆیان دەربێنە)).

گوتیـان: ئـەی پێغەمبـەری خـوا، ئەگـەر لەهـەر سـەدی نـەوەدو نۆمـان لێ دەربێنـی، چەندمان لێ دەمێنێتەوە؟ فەرموی: ((إن أمتي في الامم كالشعرة البيضاء في الثــور الأســـود: ئوممەتی من لە نێو ئوممەتان وەكو تاڵە مویەكی سپیە لە گایەكی رەشدا))[1].

ئاشكرایە ئەم گێڕانەوەیە پێچەوانەی گێڕانەوە دروستەكانی دیكە نیە كە پێشتر هاوردومانە، چونكە ئەو ژمارەیەی لەواندا هاتوە بە گوێرەیەكەو، ئەم ژمارەیـەش بـە گوێرەیەكی تـرە. دەكـرێ ئـەم فەرمودانـەی ڕێژەكـە دەكەنـە نۆسـەدو نـەوەدو نـۆ بـە گوێـرەی هەمو نـەوەو نـەوەكانی ئـادەم لێـك بدرێنـەوەو فەرمودەكـەی بوخـاریش كـە دەیانكاتە نەوەدو نۆ بەگوێرەی هەمو زاروڵانی ئادەم لێك بدرێتەوە، بێجگـە لـە یـاجوج و ماجوج، ئەم كۆكردنەوەی نێوان فەرمودەكانیش نیزیك دەبێتەوە، ئەگەر وەك ئیبنـی حەجەر دەڵێ: ئەوە لەبەرچاو بگرین كە باسی یاجوج و ماجوج لـە فەرمودەكـەی ئەبو سـەعیددا هـاتوەو لەفەرمودەكـەی ئـەبو هورەیـرە نـەهاتوە. دەشـگونجێ بگوتـرێ فەرمودەكانی یەكەم بە تێكڕای خەڵكیەوە پەیوستە. جا ئەگـەر بە گوێـرەی سـەرجەم ئوممەتـەكانی لێك دەینـەوە، ئـەوانی دەچنـە دۆزەخ لـەچاو ئـەوانی دەچنـە بەهەشـت ڕێژەیـان (٩٩٩) یە. فەرمودەكـەی بوخـاری تـەنیا بـە گوێـرەی ئـەم ئوممەتـە دەبـێ و ڕێژەی ئەو كەسانەی تێدا دەردەخات كە دەچنە دۆزەخ.

ئیبن حەجەر دەڵێت: "ئەو گوتەیە وتەیان لەمەڕ فەرمودەكەی ئەبو هورەیرە (اذا

[1] رواه البخاري في صحيحه، كتاب الرقاق، باب الحشر، فتح الباري: (١١/٣٧٨).

اخذ منا) نزیك دەكاتەوە.

پاشان دەڵێ: (ڕێی تێ دەچێ دابەشكردنەكە دوجاران روبدات، جارێك لەسەرجەم ئوممەتانی پێش ئەم ئوممەتە، جا لەهەر هەزاری یەكێكیان بۆ بەهەشت بێ. جارێكیش لەم ئوممەتەدا بێ‌و، لەهەر هەزاری دەیان بچنە بەهەشت".[1]

## جێباسی دوەم

## نهێنی زۆریی دۆزەخنشینان

هۆی ئەم زۆرییە ئەوە نیە كە هەق بە مرۆڤ نەگەیشتبێ لەگەڵ جیاوازی سەردەم و شوێنەكانیانەوە، چونكە خودا لەبەندان ناگرێ ئەگەر بانگەوازەكەی پێیان ڕانەگەیشتبێ:

﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولاً: ئێمە هیچ تاك و تاقمێك سزاو ئەشكەنجە نادەین تا پێشتر پێغەمبەرێكیان بۆ دەنێرین﴾الأسراء:١٥.

بۆیە خودا بۆ هەر ئوممەتێك ترسێنەرێكی ڕەوانە كردوە:

﴿وَإِنْ مِنْ أُمَّةٍ إِلاَّ خلاَ فِيهَا نَذِيرٌ: هیچ ئوممەتێك نیە، مەگەر ترسێنەرێكیان بۆ چوە﴾فاطر:٢٤.

بەڵكو هۆی ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ كەمی ژمارەی ئەو كەسانەوە كە بە پیر بانگەوازی پەیامبەرانەوە هاتون و، زۆریی ئەوانەی كوفریان پێكردون، سەرەڕای ئەوەی كە زۆر لەوانی وەڵامی بانگەوازەكانیان داوەتەوە بڕواكەیان پاك و بێگەردو بێ‌پەڵە نەبوە.

ئیبنی رەجەب لە كتێبی (التخویف من النار)دا باسی هۆی كەمی بە هەشتیان و زۆری دۆزەخیانی كردوەو دەڵێ:

(ئەم فەرمودانەو هاو واتاكانیان بەڵگەی ئەوەن كە زۆرینەی ئادەمییان دۆزەخین.

---

[1] فتح الباري: (١١/٣٩٠)، گەلێك گوتەی دیكەشی هاوردوە، ئەگەر دەتەوێ لە زێتریان بڕوانی، بۆوێ بگەڕێوە.

هەروەها بەڵگەی ئەوەشن کە شوێنکەوتەی پێغەمبەران لەچاو خەڵکی دی کەمن، لە شوێنکەوتەی پێغەمبەرانیش بترازێ هەمو لە دۆزەخدان بێجگە لەوەی بانگەوازی پێ نەگەیشتوە یان نەیتوانیوە وەکو پێویست تێی بگات. ئەوانەی دەدرێنە پاڵ شوێنکەوتەی پێغەمبەرانیش گەلێکن، هەیانە دەستیان بە ئاینێکی سڕدراو (منسوخ) و کتێبێکی گۆڕاوەوە گرتوە، جا ئەوانەش هەر دۆزەخیین، هەر وەك خودا دەفەرمێ:

﴿وَمَنْ يَكْفُرْ بِهِ مِنْ الأَحْزَابِ فَالنَّارُ مَوْعِدُهُ: هەر کەسیش لەو کۆمەڵانە حاشای لێبکا، جێی لەئاگر خۆش کراوە﴾هود:١٧.

ئەوانەش کە سەر بە کتێبی پتەو و شەریعەتێکی بە پاڵپشت و دینی هەقیشن، زۆریان لە دۆزەخییانن، ئەوانەش ئەو دوڕوانەن کە لە نهۆمی هەرەژێری دۆزەخ دان. ئەوانەش کە بەدەرو دەرونیش سەر بە ئیسلامن زۆریان توشی ئاشوبی گومان بون، ئەوانیش ئەهلی بیدعەو گومڕایین، فەرمودەش هەن رایانگەیاندوە کە ئەو نەتەوەیە بۆ سەر هەفتاو چەند کۆمەڵ دابەش دەبیٚو لە یەکێکیان بترازێ ئەوانی تر هەمو دەچنە دۆزەخ. ژمارەیەکی زۆریش هەن توشی ئاشوبی ئەو ئارەزوە حەرامانە بون کە گەف و هەڕەشەی دۆزەخیان لەسەر هاتوە -هەرچەندە نەشبنە مایەی مانەوەی هەتایی لە دۆزەخدا- جا لە هەڕەشەی دۆزەخ رزگار نابن. کەواتە لەم ئوممەتەدا لەیەك کۆمەڵ بترازێ کەس شایستەی بەڵێنی ڕەهای بەهەشت نیە، ئەو کۆمەڵەش ئەوانەن کە بەدەرو دەرون پابەندی ڕێو شوێنی پێغەمبەرﷺ و یاوەرە خاوەن ڕێزەکانن و توشی ئاشوبی ئارەزو و گومانان نەبون، ئەمانەش ژمارەیان زۆر کەمە بەتایبەتی لە سەردەمە دواینەکاندا.)[1]

ڕەنگە هۆکاری هەرە گەورەش شوێنکەوتنی ئارەزوەکان بیٚ، چونکە حەزی ئارەزوبازی لە قوڵایی نەفسی مرۆڤدا چاندراوەو ڕەگی داکوتاوە:

﴿زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ الشَّهَوَاتِ مِنْ النِّسَاءِ وَالْبَنِينَ وَالْقَنَاطِيرِ الْمُقَنْطَرَةِ مِنْ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَالْخَيْلِ الْمُسَوَّمَةِ وَالأَنْعَامِ وَالْحَرْثِ ذَلِكَ مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا: خۆشەویستی ئارەزوکان بۆ خەڵکی ڕازاوەتەوەو ئارایشت دراوە، لە ژنان، مندالآن و کیسەی پڕی

---

[1] التخويف من النار، لأبن رجب، ص٢١٤

زێرو زیو و ئەسپی خۆشڕەنگ و نیشانەدارو پڕ لە خاڵ و مەڕومالآت و کشتوکاڵ، ئەمانە کالآی ژیانی دنیان.﴾آل عمران:١٤.

خەڵکێکی زۆریش حەز دەکەن بەو ڕێگایانەی کە دەرونیان دەیخوازێ و دڵیان پێی خۆشە ئەم ئارەزوانەیان تێرو پڕ بکەن، جا لە پێناو ئەمەدا گوێ ناداتە شەرعێ دابەزیوی خودا، سەرباری ئەم هۆیەش دەسگرتنی منداڵانە بەو میرات و کەلەپۆرەی باوکان بۆیان بەجێ‌هێشتون کە دژو پێچەوانەی شەرعی خودان:

﴿مَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ فِي قَرْيَةٍ مِنْ نَذِيرٍ إِلاَّ قَالَ مُتْرَفُوهَا إِنَّا وَجَدْنَا آبَاءَنَا عَلَى أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَى آثَارِهِمْ مُقْتَدُونَ، قَالَ أَوَلَوْ جِئْتُكُمْ بِأَهْدَى مِمَّا وَجَدْتُمْ عَلَيْهِ آبَاءَكُمْ قَالُوا إِنَّا بِمَا أُرْسِلْتُمْ بِهِ كَافِرُونَ: هەر بەم تەرزە بەر لەتۆش هەر پێغەمبەرێکمان ناردۆتە هەر ئاوەدانیەك کە لە ئێمەوە ترسیان وەبەر نێ، هەمو خۆشگوزەرانەکانی ئەوانە گوتویانە: باب و باپیرانمان لەسەر ئاینێك ڕۆیشتون، ئێمەش پەیڕەوی ئەوانین، گوتویەتی: ئەدی ئەگەر من ڕێیەکتان نیشان بدەم کە لە ڕێی باب و باپیرتان دروست تر بێ؟ گوتویانە: ئێمە بەوەی ئێوەی بۆی بەڕێ‌کراون باوەڕ ناکەین.﴾الزخرف:٢٣-٢٤.

کاریگەری ڕاهاتن و دەق پێ‌گرتن و بە پیرۆزگرتنی داب و نەریتی بابوباپیران کە گەلێك نەتەوە موبتەلای بون، چیی کەمتر نیە لەو ئارەزوە ڕەگ داکوتاوەی قوڵایی ناخی مرۆڤ، ئەگەر خۆی لە خۆیدا ئارەزویەك نەبێ.

لە ئەبو هورەیرە هاتوە کە پێغەمبەرﷺ دەفەرمێ: ((لما خلق الله النار، قال لجبريل: اذهب فانظر إليها، فذهب فنظر إليها ثم جاء، فقال: وعزتك لا يسمع بها أحد فيدخلها، فحفها بالشهوات، فقال: اذهب فانظر إليها، فذهب فنظر إليها، فلما رجع قال: وعزتك لقد خشيت أن لا يبقى أحد إلا دخلها: کە خودا دۆزەخی بەدیهێنا بە جبریلی فەرمو: بڕۆ سەیری بکەو تەماشا بکە چیم بۆ خەڵکەکەی ئامادە کردوە، جا چو سەیری کردو پاشان گەڕاوەو گوتی: سوێند بە عیززەتت هەر کەسێ شتێکی لە بارە ببیستێ ناچێتە ناوی، جا خودا دەوری دۆزەخی بە ئارەزوان تەنی‌و فەرموی: بڕۆ تەماشای بکە، چو تەماشای کرد، کە گەڕاوە، گوتی: سوێند بە عیززەتی تۆ لەوە ترسام کەس نەمێنێ و هەمو تێی

**بچن))** [1].

**هەر لە ئەبو هورەیرەوە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ:** ((حجبت النار بالشهوات، وحجبت الجنة بالمكاره: **دۆزەخ بە ئارەزوان پەردەدراوەو، بە هەشتیش بە ناخۆشییان پەردەدراوە))** [2].

**صیدیق حەسەن خان دەڵێ: (مەبەست لە ئارەزوان ویست و مرازو چێژو هەوەسی نەفسەکانە)** [3]. **قورطوبی دەڵێ: (ئارەزوەکان هەمو ئەو شتانەن کە لەگەڵ نەفس کۆک و گونجاون و نەفس بانگەوازیان بۆ دەکات و، لەگەڵیان ڕێدەکەوێ. تەنینیش لە بنەڕەتدا مانای دەورەدانی هەیە بە شێوەیەك پێی ناگات تا پێیدا تێدەپەڕێ)** [4].

## جێباسی سێیەم

## زۆربەی ئەوانەی دەچنە دۆزەخ ئافرەتن

**ئافرەتان زۆرینەی ئەو یەکخواپەرستە یاخیانەن کە دەچنە دۆزەخ، هەروەك لە هەردو صەحیحاندا لە ئیبنی عەبباسەوە لە پێغەمبەرﷺ هاتوە. کەلە وتاری رۆژگیراندا فەرموی:** ((رأيت النار ورأيت أكثر اهلها النساء: **دۆزەخم دیت ودیتم زۆربەی دۆزەخییەکان ئافرەتن)).**

**هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموی:** ((يا معشر النساء تصدقن، فإني رأيتكن اكثر اهل النار: **ئەی گەلی ئافرەتان زۆر خێر بکەن، ئەمن دیتم زۆرینەی خەڵکی دۆزەخ لە ئێوە بون)).**

**گوتیان: جا ئەمە بۆچی ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرموی:** ((تكثرن اللعن، وتكفرن العشير:

---

[1] اخرجه الترمذي وابوداود، وزاد النسائي بعد قوله (اذهب فأنظر اليها)، (والى ما أعددت لأهلها فيها): جامع الأصول: (١٠/٥٢٠) ورقمه ٨٠٦٨، وقال المحقق: قال الترمذي: حديث حسن صحيح.

[2] اخرجه البخاري ومسلم في صحيحيهما، ولمسلم (حفت) بدل (حجبت): سەرچاوەی پێشو(١٠/٥٢٠) ورقمه٨٠٦٩

[3] يقظة اولي الأعتبار: ص٢٢٠

[4] يقظة اولي الأعتبار: ص٢٢٠.

زۆر نەفرەت دەکەن و چاکەو پێکەوە ژیانتان لەبەر چاو نیە))[1].

هەروەها فەرموی: ((وقمت على باب النار، فإذا عامة من دخلها النســـاء: لەبـەر دەرگـەی دۆزەخ ڕاوەستام، بە گشتی ئەوانەی دەچونە ناوی ئافرەت بون))[2].

دیسان دەفەرمێ: ((إن أقل ســـــاكني الجنـــة النســـاء: کەمترین ژمارەی بەهەشـتیان ئافرەتن))[3].

ئەمـەش لەگـەڵ ئـەوەدا تێك ناگیرێ کە هەر پیاوێك لـە بەهەشـتدا زێتر لـە ژنێکـی هەیە، چونکە مەبەست لەو ژنانەی کە زۆربەی دۆزەخنشینان پێك دێنن ئەو ژنانەن کە لە ڕەچەڵەکی ئادەمن. هەرچی ژنە زۆرەکانی بەهەشتییانن لەپەرییە چاو بەڵەکانن.

(بۆیـەش ئافرەتـان کـەمترین دانیشـتوانی بەهەشـتن، چونکـە ئـارەزو و بـەلاداچونی خۆشی دنیایان بەسەردا زاڵە، لەبەر کـەمی عـەقڵیان چاویـان دورتـر بڕ ناکات. جا لـە ئاست کردەی قیامەت و خۆ بۆ سازدانی لاواز دەبن، هەروەها لەبـەر چاو بڕینـە دنیـاو خۆ بۆ ڕازاندنەوەی. سـەرەڕای ئـەوەش ئافرەتـان کاریگـەرترین هـۆی دنیـان پیـاوان لـە ڕۆژی دوایی دادەبڕن، چونکە ئارەزو و هەوەسێکی زۆریان تێدایە، زۆربەیان پشـت لـە قیامـەت دەکـەن و بـە خۆیانـەوە دەخـافلێن و ڕێگـە لـە غـەیری خۆشـیان دەگـرن، زو هەڵدەخەڵەتێن و بە پیر بانگەوازی دورە دینانەوە دەچن و، وەڵامدانـەوەیان ئەسـتەم و سەختە لە ئاست ئەو تەقوادارو خۆپارێزانەی بۆ قیامەت و کردەوەی قیامەتی بانگیان دەکەن)[4]. لەگـەڵ ئەمەشـدا چاکەکارو خێرخوازیـان زۆر تێدایـە، کـە سـنورەکانی خـوا بەجێ دێنن و پابەندی شەریعەتەکەی دەبن و تاعـەتی خـوداو پێغەمبەرەکەی دەکەن، کەسانێکی زۆریشیان لێ دەچێتـە بەهەشـت، هـی واشـیان تێدایـە بـە هـۆی کـردەوەی چاکیانەوە پێش زۆربەی پیاوان دەکەون.

---

[1] في صحيحين من حديث ابي سعيد الخدري.

[2] في صحيحين من حديث اسامة بن زيد.

[3] صحيح مسلم عن عمران بن حصين.

[4] التذكرة للقرطبي: (١/٣٦٩).

# بەندی هەفتەم

## زەبەلاحی دۆزەخنشینان

دۆزەخییەکان زۆر بە زەبەلاحی ناقولآیی دەچنە نێو ئاگر، بە شێوەیەك هەر خودای بەدیهێنەریان دەزانێ چەند زلحۆ دەبن. لەو فەرمودەیەی کە ئەبو هورەیرە بۆ پێغەمبەرﷺی بەرز دەکاتەوە، دەفەرمێ:

((ما بين منكبي الكافر في النار مسيرة ثلاثة ايام للراكب المسرع: نێوان هەردو شانی بێبڕوا لە دۆزەخدا بۆ سوارێکی خۆشڕەو سێ ڕۆژە ڕێیە))[1].

هەروەها ئەبو هورەیرە دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرموی: ((ضرس الكافر، او ناب الكافر، مثل احد، وغلظ جلده مسيرة ثلاث: کەڵبەی بێبڕوا هێندی ئوحودەو، ئەستوری پێستەشی سێ قوناغە ڕێیە))[2].

زەیدی ئەرقەم دەڵێ: ((إن الرجل من اهل النار ليعظم للنار، حتى يكون الضرس من اضراسه كأحد: هەر پیاوێك لە دۆزەخییان بۆ دۆزەخ زل و گەورە دەکرێ، تا هەر کەڵبەیەکی هێندی ئوحودی لێ دێت))[3].

لە ئەبو هورەیرەوە دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرموی: ((إن غلظ جلد الكافر اثنان وأربعون ذراعا، وإن ضرسه مثل أحد، وإن مجلسه من جهنم ما بين مكة والمدينة: ئەستوری پێستی بێبڕوا چل و دو باڵەو، کەڵبەکەی هێندی ئوحودە. دانیشگەشی لە دۆزەخدا هێندی ماوەی نێوان مەککەو مەدینەیە))[4].

---

[1] رواه مسلم في صحيحه؛ كتاب الجنة، باب يدخلها الجبارون: (٢١٩٠/٤).

[2] رواه مسلم في صحيحه؛ كتاب الجنة، باب يدخلها الجبارون: (٢١٨٩/٤)، وعزاه في سلسلة الأحاديث الصحيحة (١٣٢/٤) الى مسلم والترمذي والحاكم وابن حبان و احمد.

[3] رواه احمد وهو مرفوع، ولكن زيدا لم يصرح برفعه: سلسلة الأحاديث الصحيحة (١٣١/٤) وقال فيه: اسناده صحيح على شرط مسلم.

[4] رواه الترمذي؛ مشكاة المصابيح: (١٠٣/٣) وقال محقق المشكاة: (رواه الترمذي وقال: حديث حسن صحيح، قلت: وسنده صحيح).

دیسان ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ((ضرس الكافر يـــوم القيامة مثل أحد، وعرض جلده سبعون ذراعا، وعضده مثل البيضاء، وفخذه مثل ورقان، ومقعــده من النار مثل ما بيني وبين الربــذة: کەڵبـەی بێـبڕوا لـە ڕۆژی دواییدا وەکو کێوی ئوحودە، پانی پێستیشـی هـەفتا باڵـە، قۆڵـی وەکو کێوی (یـان شـاری) بەیضایـەو، ڕانـی وەکـو وەرەقانە، شوێنی دانیشتنیشی هێندی نێوان من و ڕەبزەیە))[1].

جەستەی بێبڕوایان بۆیـە هێنـدە قەبـەو زەبەلاح دەبـێ تـا زێـتر ئەشـکەنجەو ژانـان بچێژێ. (نـەوەوی) لـە ڕاڤــەی فـەرمودەکانی موسـلیم لـەم دەروازەیـەدا دەڵـێ: (ئەمـە هەموی بۆ ئەوەیە تا بۆ ئێش و ژان کاریگەرتر بێ، هەموشی لە توانستی خودا بەدەر نیەو دەبێ بڕوای پێ بێنین. چونکە پێغەمبـەری ڕاستگۆ پێـی ڕاگەیاندوین)[2]. ئیبنـی کەثیریش لەو فەرمودانەدا دەدوێ کە هاوردونیو دەڵێ: (بۆ ئەوەیـە تـا ئەشـکەنجەیان کاریگەرتر بێو زیاتر هیلاك بن و بڵێسەی ئاگر داخیان بکات. هەروەك خودای خاوەن دەسەڵات دەفەرمێ: ﴿ليذوقوا العذاب: تا ئازارو ئەشکەنجەیان بچێژن.﴾)[3].

[1] اخرجه الحاكم واحمد: سلسلة الأحاديث الصحيحة (٩٤/٣)، ونسب الى الحاكم والذهبي تصحيح الحديــث و وافقهما على ذلك على ضعف في احد رواة الحديث وهو ابن اسحاق، وقد ساق المؤلف كثيراً من المتابعات والشواهد للحديث.

[2] شرح نووی علی مسلم: (١٨٦/١٧).

[3] النهاية لإبن كثير: (١٣٩/٢).

## بەندی هەشتەم

## خواردن و خواردنەوەو پۆشاکی دۆزەخییان

خۆراکی دۆزەخنشینان درکەشیلانێ و ژەقنەموتی تفت و تاڵە، خواردنەوەشیان ئاوی داغ و خوێناو و خیزاوی دۆزەخییانە، خوای بەرز دەفەرمێ:

﴿لَيْسَ لَهُمْ طَعَامٌ إِلاَّ مِنْ ضَرِيعٍ، لاَ يُسْمِنُ وَلاَ يُغْنِي مِنْ جُوعٍ: بێجگە لە درکەشیلانێ و تفت و تاڵ چ خواردنێکی دیکەیان نیە. ئەو خۆراکەی نەقەڵەویان دەکات و نەبرسیەتیان دەشکێنێ﴾الغاشية:٦-٧.

(ضريع)یش دڕکێکە لەخاکی حیجاز شین دەبێو پێی دەڵێن (الشبرق).

ئیبن عەبباس دەڵێ: شبرق: ڕوەکێکی دڕکنە بەخاکەوە نوساوە. کە وشك بو پێی دەگوترێ (ضەریع).

قەتادە دەڵێ: (ضەریع) لەخراپترین وناشرینترین جۆرە خۆراك هاتوە[1].

ئەو خواردنە کە جەهەننەمی دەیخۆن و قازانجیان پێ ناگەیەنێ، نەتامی لێدەکەن و نەجەستەکانیان سودی لێدەبینێ، بۆیە خواردنیشی جۆرە ئەشکەنجەیەکە بۆ خۆی.

هەروا خودای بەرز دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ شَجَرَةَ الزَّقُّومِ، طَعَامُ الأَثِيمِ، كَالْمُهْلِ يَغْلِي فِي الْبُطُونِ، كَغَلْيِ الْحَمِيمِ: بەری دارەکەی ژەقنەموت، خواردنی گوناهبارانە. کە چەشنی ڕۆن زەیتون لە زگیاندا دەکوڵێ. وەك کوڵانی ئاوی گەرم.﴾ الدخان: ٤٣-٤٦.

هەروەها لەئایەتێکی دیکەدا وەسفی درەختی ژەقنەموت (زقوم) دەکا و دەفەرموێ:

﴿أَذَلِكَ خَيْرٌ نُزُلاً أَمْ شَجَرَةُ الزَّقُّومِ، إِنَّا جَعَلْنَاهَا فِتْنَةً لِلظَّالِمِينَ، إِنَّهَا شَجَرَةٌ تَخْرُجُ فِي أَصْلِ الْجَحِيمِ، طَلْعُهَا كَأَنَّهُ رُءُوسُ الشَّيَاطِينِ، فَإِنَّهُمْ لآكِلُونَ مِنْهَا فَمَالِئُونَ مِنْهَا الْبُطُونَ، ثُمَّ إِنَّ لَهُمْ عَلَيْهَا لَشَوْبًا مِنْ حَمِيمٍ، ثُمَّ إِنَّ مَرْجِعَهُمْ لإِلَى الْجَحِيمِ: ئایا ئەم

---

[1] التخويف من النار لابن رجب:ص١١٥.

بەهەشتە باشترە یا دارەکەی ژەقنەموت؟! ئێمە ئەو دارەمان کردۆتە بەلایەك بۆ گرۆی ستەمکاران، بەراستی ئەوە دارێکە لەناوەڕاستی دۆزەخەوە دێتەدەرێ. بەرێك دەدا کە لە بیچمی کەسسەسەری شەیتانەکان دەچێت، جا دۆزەخییەکان لەوە دەخۆن و ورگی لێ پردەکەن. لەپاشان ئاوی بۆگەنی داغی بەسەردا دەخۆنەوە. بەراستی گەرانەوەشیان هەر بۆ دۆزەخە﴾الصافات: ٦٢-٦٧.

لەجێگایەکی دیکەش دەفەرمێ: ﴿ثُمَّ إِنَّكُمْ أَيُّهَا الضَّالُّونَ الْمُكَذِّبُونَ، لَآكِلُونَ مِنْ شَجَرٍ مِنْ زَقُّومٍ، فَمَالِئُونَ مِنْهَا الْبُطُونَ، فَشَارِبُونَ عَلَيْهِ مِنَ الْحَمِيمِ، فَشَارِبُونَ شُرْبَ الْهِيمِ، هَٰذَا نُزُلُهُمْ يَوْمَ الدِّينِ: پاشان ئێوە ئەی گومڕایانی وەدرۆخەرەوە. بێگومان لەداری ژەقنەموت دەخۆن. زگتانی لێ پڕ دەکەن. ئاوی داغیشی بەسەردا دەخۆنەوە. هەروەکو وشترانی تینو دەخۆنەوە، ئەمە خۆراکی ئەوانەیە لەڕۆژی قیامەتدا﴾الواقعة: ٥١-٥٦.

لەم ئایەتە پیرۆزانەوە وا دەفامرێتەوە کە ژەقنەموت درەختێکی زۆر بەدو پیسە، ڕەگەکانی لەقولایی دۆزەخدا چەقیون ولکەکانی پێیدا پەرتن. بەری ئەو درەختەش شێوەو دیمەنێکی دزێو و ناشیرینی هەیە بۆیە بەسەری شەیتانان شوبهێنراوە، سەری شەیتانانیش هەر بە دزێو ناڕێك و بەدوێنە دێنە بەرچاوان، ئەگەر بەراستیش نەدیترابن. جا لەگەل ئەوەی ئەو درەختەو بەروبومەکەی هێندە پیس و دزێون، دۆزەخیەکان وا برسی دەکرێن، بێجگە لە خواردنی چ دەرفەت ودەرەتانێکی دیکە شك نابەن. ئەوەندەی لێدەخۆن زگیان پڕدەبێ، ئەوجا لەنێو هەناویاندا وەکو قازانی پڕ ڕۆن دەکولێ و قولپ دەدا، دەبێتە مایەی ژان و ئێشێکی گورچکبڕ و پڕ ئازار، جا کە باریان دەگاتە ئەو ڕادەیە غار دەدەنە حەمیم (ئاوی داغ) کە تائەوپەڕی کولیو و گەرمە، دەمی پێوە دەنێن و وەکو ئەو حوشترە لێی دەخۆنەوە کە هەر فڕدەکات و پڕی ناشکێ چونکە دەردێکی هەیە، ئیدی ئەو کاتە حەمیمیش هەناویان لەت و پەت دەکا:

﴿وَسُقُوا مَاءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَاءَهُمْ: ئاوی داغیان دەرخوارد درا، جا ڕیخۆلەیانی لەت و پەت کرد﴾محمد: ١٥.

ئەمە میوانداری شیاوی ئەوێ ڕۆژییانە. خودا بەمیهرو بەخشندەیی خۆی لەحالی

دۆزەخییانمان بپارێزێ.

ئەوجا کە دۆزەخییەکان ئەو دڕك و ژەقنەموتە دڕو تاڵە دەخۆن هێندە گەندو پیس و خراپە لەقوڕگیان دەگیرێ:

﴿إِنَّ لَدَيْنَا أَنكَالاً وَجَحِيمًا، وَطَعَامًا ذَا غُصَّةٍ وَعَذَابًا أَلِيمًا: لەلای ئێمە کۆت و زنجیرو دۆزەخ هەیە، لەگەڵ خۆراکی گەروگر و ئەشکەنجەی بە ئازار و ئێش.﴾المزمل: ١٢.

پێغەمبەری پایەداریش ﷺ باسی پیسی و گەنیو پۆخلی ئەو ژەقنەموتەی بۆ کردوین کە دەفەرمێ:

((لو أن قطرة من الزقوم قطرت في دار الدنيا لأفسدت على أهل الأرض معايشهم، فكيف بمن يكون طعامه: ئەگەر یەك دڵۆپ ژەقنەموت دڵۆپێنرایە خانەی دنیایێ. ژیانی هەمو خەڵکی سەرزەوی تێك دەدا، چ جای ئەو کەسەی ببێتە خۆراکی؟))[2].

هەروەها کێم و زوخاو(غیسلین)یش خۆراکێکی دۆزەخییانە، خودای توانا دەفەرمێ:

﴿فَلَيْسَ لَهُ الْيَوْمَ هَاهُنَا حَمِيمٌ، وَلاَ طَعَامٌ إِلاَّ مِنْ غِسْلِينٍ، لاَ يَأْكُلُهُ إِلاَّ الْخَاطِئُونَ: جا ئەمرۆ لێرەدا چ دۆست و پارێزەرێکی نیە، لە کێم و خوێناوی دۆزەخییانیش بترازی چ خواردن و خواردنەوەی نیە، تاوانباران نەبن ئەو خۆراکە ناخۆن﴾ الحاقة: ٣٥-٣٧.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿هَذَا فَلْيَذُوقُوهُ حَمِيمٌ وَغَسَّاقٌ، وَآخَرُ مِنْ شَكْلِهِ أَزْوَاجٌ: ئەمە خواردنەوەیەکی داغ و سوتێنەرو کێم و زوخاو بخۆنەوە، هەر لەم تەرزە جەزرەبانە چەندین وێنەی تریش هەیە﴾ص: ٥٧-٥٨.

(غیسلین) و (غەساق)یش بە یەك واتان، کە برتییە لەو کێم و خوێن و خیزاوەی لەپێستەی دۆزەخییان دەتکێ، دەشڵێن بریتیە لەوەی کە لە داوێنی ژنانی زیناکارو گۆشت و پێستی گەنیوی بێبڕوایان دەڕوا، قورطوبی گوتویەتی: بریتیە لە گوشراوی دۆزەخییان[3].

هەروەها خودای زاناو کاربەجێ ڕایگەیاندوە کە زوخاو یەکێکە لە نێوان زۆر

---

[2] رواه ابن عباس؛ حديث حسن صحيح؛ مشكاة المصابيح: (١٠٥/٣)

[3] يقظة اولي الاعتبار: ص٨٦.

جۆری دیکه که لەپیسی و بەدیی هەمان شێوەن.

خواردنەوەشیان ئاوی داغە، خوا دەفەرموێ:

﴿وَسُقُوا مَاءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَاءَهُمْ: ئاوی داغیان دەرخواردرا، جا ڕیخۆڵەکانی لەت و پەت کرد﴾محمد:١٥.

هەروا دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ يَسْتَغِيثُوا يُغَاثُوا بِمَاءٍ كَالْمُهْلِ يَشْوِي الْوُجُوهَ بِئْسَ الشَّرَابُ وَسَاءَتْ مُرْتَفَقًا: ئەگەر داوای یارمەتی بکەن، بەئاوێك کۆمەك دەکرێن وەکو قوڕقوشمی تواوەیەو ڕویان دەبرژێنێ، چ خواردنەوەیەکی خراپ و نشینگەیەکی بەدفەڕە﴾الكهف:٢٩.

وە دەفەرموێ: ﴿ وَيُسْقَى مِنْ مَاءٍ صَدِيدٍ، يَتَجَرَّعُهُ وَلاَ يَكَادُ يُسِيغُهُ: لەکێماو ئاو دەدرێ، قوم قوم دەیخواتەوەو ناتوانێ بەئاسانی قوتی بدات﴾ابراهيم:١٦-١٧.

هەمدیس دەفەرمێ: ﴿هَذَا فَلْيَذُوقُوهُ حَمِيمٌ وَغَسَّاقٌ: ئەمە خواردنەوەیەکی داغ و سوتێنەرو کێم و زوخاو، دەبێ بیچێژن و بیخۆنەوە﴾ ص:٥٧.

ئەم ئایەتە پیرۆزانە چوار جۆرە خواردنەوەی دۆزەخییان باس دەکەن:

یەکەم: حەمیم: ئەو ئاوەیە کە تا ئەوپەڕی داغ و گەرم بوە، هەروەك خودا دەفەرموێ:

﴿يَطُوفُونَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ حَمِيمٍ ءَانٍ: ئێستا لەنێو ئاگری دۆزەخ و ئاوی کوڵیو داغ دا دەخولێنەوە﴾الرحمن:٤٤.

﴿تُسْقَى مِنْ عَيْنٍ آنِيَةٍ: لەکانی ئاوی زۆر گەرم و داغ ئاویان دەدرێت﴾الغاشية:٥.

جۆری دووەم: غەساق، کەپێشتر باسکراوەو وەبەر خواردن و خواردنەوەی دۆزەخییان دەکەوێ.

جۆری سێیەم: صەدید: ئەو کێمەیە کە لەبەر گۆشت و پێستی بێبڕوایان دەڕوا، لەصەحیحی موسلیمدا لەجابیرەوە کە ئەویش لە پێغەمبەر ﷺ هاتوە، فەرموی:

((إن على الله عهدا لمن شرب المسكرات يسقيه طينة الخبال: خودا پەیمانێکی داوە بۆ ئەو کەسانەی بادەی سەرخۆشکەر دەخۆنەوە، قوڕاوی گێلاتیان پێنۆش دەکا،

گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، قوڕاوی گێلاتی چیە؟ فەرموی (عـرق اهـل النـار، او عصارة اهل النار: ئارەقەی دۆزەخییان یان گوشراوی دۆزەخییانە)).

**جۆری چوارەم: موهل؛ ڕۆنی قرچاوە**، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ: ((کعکر الزیـت، فـاذا قرب وجهه سقطت فروة وجهه فیه: وەکو ڕۆنی تواوەیە، ئەگەر لەدەم و چاو نزیك بوەوە، پێستی دەم و چاو بەردەبێتەوە ناوی))[4].

## ئاگر خواردنیان

هـەندێك گوناهكـار هـەن، لـەپای تاوانـەكانیان خـودا سـكلْ(پشـكۆی ئـاگر)ی دۆزەخییان دەرخوارد دەدا:

﴿إِنَّ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَالَ الْيَتَامَى ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ نَارًا وَسَـيَصْلَوْنَ سَعِيرًا: ئەو كەسانەی ماڵی هەتیوان بە ناڕەوا دەخۆن با بزانن كە ئاگر دەخەنە ناو هەناویانەوە﴾النساء:١٠.

هەروەها دەفەرموێ ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلَ اللَّهُ مِنْ الْكِتَابِ وَيَشْـتَرُونَ بِـهِ ثَمَنًا قَلِيلاً أُولَئِكَ مَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ إِلاَّ النَّـارَ: ئەو كەسانەی ئەوە دەشارنەوە كە خودا لەكتێبێ دایبەزاندوەو بەنرخی كەم دەیفرۆشن، ئەوانە لەئاگر بترازێ چی دیكە ناخەنە نێو زگیانەوە﴾البقرة:١٧٤.

هەرچی پۆشاكی خەلكی دۆزەخیشە، خودای بەرز هەواڵی پێداوین كە جلوبەرگی دۆزەخییان لەئاگر هەڵدەبڕێ، هەروەك دەفەرمێ:

﴿فَالَّذِينَ كَفَرُوا قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ مِنْ نَارٍ يُصَبُّ مِنْ فَوْقِ رُءُوسِـهِمْ الْحَمِيـمُ: جا ئەوانەی بێبڕوا بون، پۆشاكیان لەئاگر بۆ هەڵدەبڕدرێ‌و ئاوی كولێوی سوتێنەریان بەسەردا دەكرێ﴾الحـج:١٩. ئیبراهیمی تـەیمی ئەگـەر ئـەم ئایەتـەی بخوێندبـاوە، دەیگوت: پاكی بۆ ئەو زاتەی پۆشاكگەلێكی لەئاگری بەدیهێناوە.[5]

---

[4] في حديث ابي سعيد الخدري عند أحمد والترمذي.

[5] التخويف من النار: ص١٢٦.

هەروەها خودا دەفەرمێ: ﴿وَتَرَى الْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ مُقَرَّنِينَ فِي الأَصْفَادِ، سَرَابِيلُهُمْ مِنْ قَطِرَانٍ وَتَغْشَى وُجُوهَهُمْ النَّارُ: لەو ڕۆژەدا تاوانباران پێکەوە لەکۆت و زنجیردا دەبینی، پۆشاك و جلەکانیان لەقەتیرانە،و ئاگر دەم وچاویان دادەپۆشێ﴾ابراهیم:٤٩. جا (القطران): مسی تواوەیە.

پێغەمبەرﷺیش دەفەرمێ: ((النائحة إذا لم تتب قبل موتها، تقام يوم القيامة، وعليها سربال من من قطران ودرعا من جرب: ئەگەر ژنی سەردولکەوێژ لەپێش مردن تەوبەی نەکرد، کەلەڕۆژی قیامەتیدا قیت دەکرێتەوە، کراسێکی لەقورقوشمی تواوەو، قەڵغانێکی لەگرویێتی لەبەرە)).[٦]

ئیبنی ماجەش بەم بیژەیە هاوردویە: ((النائحة اذا ماتت ولم تتب قطع الله لها ثيابا من قطران ودرعا من جرب: ئەگەر ژنی سەردولکەوێژ مرد پێش ئەوەی تۆبە بکات خودا پۆشاکی لەقورقوشمی تواوەو قەڵغانی لەگرویێتی بۆ هەڵدەبڕێ)).

[٦] في صحيح مسلم عن ابي مالك الاشعري.

## بەندی نۆیەم

## ئەشکەنجەی دۆزەخنشینان

## جێباسی یەکەم

### سەختی ئەو ئەشکەنجانەی دۆزەخنشینان دەیانچێژن

**ئەشکەنجەی دۆزەخ زۆر سەختە، هێندەی نارەحەتی و پەرژەنگ وئازاری جۆراوجۆر تێدان، وا دەکا مرۆ لەپێناو لێرزگاربونی، چی گرانبەهایە بیبەخشێ:**

﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا وَمَاتُوا وَهُمْ كُفَّارٌ فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْ أَحَدِهِمْ مِلْءُ الأَرْضِ ذَهَبًا وَلَوْ افْتَدَى بِهِ أُولَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ وَمَا لَهُمْ مِنْ نَاصِرِينَ: **ئەوانەی بێباوەڕ بون و هەر بە بێبڕوایی مردن، ئەگەر پڕی ئەم زەمینە زێڕیش بە بارمتە بدا، هەرگیز بەهرەی پێناگەیەنێ، ئەوانە ئازاری بەژانیان دەبێت و کەسیشیان وە هانا نایە**﴾آل عمران:٩١.

**خودای بەرز هەر بەم مانایە دەفەرمێ:** ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْ أَنَّ لَهُمْ مَا فِي الأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُ مَعَهُ لِيَفْتَدُوا بِهِ مِنْ عَذَابِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَا تُقُبِّلَ مِنْهُمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ: **ئەو کەسانەی کافربون، ئەگەر هەمو ئەوەی لەزەویداو هێندەی دیکەش هی ئەوان بێ‌و بۆ رزگاربونیان لەئەشکەنجەی ڕۆژی قیامەت بیبەخشن لەوان قبوڵ ناکرێ‌و توشی ئەشکەنجەیەکی گەلێ بەژان دەبن**﴾المائدة:٣٦.

**لەصەحیحی موسلیمیشدا لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە هاتوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:**

((يؤتى بأنعم أهل الدنيا من أهل النار يوم القيامة، فيصبغ في النار صبغة، ثم يقال: يا ابن آدم هل رأيت خيرا قط؟ هل مر بك نعيم قط؟ فيقول: لا والله يا رب: **لەڕۆژی قیامەتدا، شادو بەهرەدارترین خەڵکی دنیا لەدۆزەخییان دەهێنن و، جارێك لەئاگری هەڵدەکێشن، پاشان دەگوترێ: ئەی ئادەمیزاد، ئایا هەرگیز خۆشیت دیوە؟ قەت شادیت بەسەر**

دڵدا تێپەڕیوە؟ دەڵێ: نا بەخوا، ئەی پەروەردگارم))[1].

ئەوانە چەند چرکەیەکی کەمن هەمو کاتەکانی شادیو ئاسودەیی لەبیر بەهرەدارترین بێبڕوای دنیا دەبەنەوە. پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ:

((يقول الله تعالى لأهون أهل النار عذابا يوم القيامة لو أن لك ما في الأرض من شيء أكنت تفتدي به؟ فيقول: نعم. فيقول: أردت منك أهون من هذا وأنت في صلب آدم أن لا تشرك بي شيئا فأبيت إلا أن تشرك بي: لەڕۆژی دواییدا خودای بەرز بە ئەشکەنجە سوکترین خەڵکی دۆزەخ دەفەرمێ: ئەگەر هەمو ئەو شتانی سەرزەوی هی تۆ بان، ئایا دەتکردنە قوربانی خۆت؟ دەڵی: بەڵێ، دەفەرمێ: من زۆر لەوەها ساناترم لێویستبوی، هەر لەو ساتەی لەپشتی ئادەمدا بوی، لێم ویستبوی هیچ هاوبەشم بۆ دانەنێی، رازی نەبوی، هەر هاوبەشت لەبۆ دانام))[2].

سەختی دۆزەخ و پەرژەنگەکانی مرۆڤ لەهۆش دەبات و، وای لێ دەکەن، بۆ رزگاربونی لەدۆزەخ هەمو خۆشەویستەکانی بکاتە قوربانی خۆی، بەڵام لەکوێ رزگاردەبێ؟!

﴿يَوَدُّ الْمُجْرِمُ لَوْ يَفْتَدِي مِنْ عَذَابِ يَوْمِئِذٍ بِبَنِيهِ، وَصَاحِبَتِهِ وَأَخِيهِ، وَفَصِيلَتِهِ الَّتِي تُؤْوِيهِ، وَمَنْ فِي الأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ يُنجِيهِ، كَلاَ إِنَّهَا لَظَى، نَزَّاعَةً لِلشَّوَى: تاوانبار ئاوات دەخوازێت ئەگەر بکرێت (بۆ دەربازبونی خۆی) لە سزای ئەو رۆژە هەمو کوڕەکانی بکاتە قوربانی خۆی، هەروەها هاوسەرەکەی، براکەی و خزم و عەشیرەتی کە لە دنیادا پەنای بۆ دەبردن. بەڵکو هەرچی دانیشتوانی زەوی هەیە تا خۆی رزگاری بێت. نەخێر، ئەو ئاواتانە هیچی نایەتەدی.. ئەمە بڵێسەی ئاگرە، پێست دادەڕنێ﴾المعارج:١١-١٦.

جا ئەو ئەشکەنجە بێژمارەو سەرومڕە، ژیانی ئەو تاوانبارانە دەکاتە تفتی وتاڵیەکی بەردەوام و ئێش و ژانێکی هەمیشە.

---

[1] رواه مسلم؛ مشكاة المصابيح: (١٠٢/٣).

[2] في الصحيحين عن انس بن مالك، ورواه البخاري في كتاب الرقاق، باب الجنة والنـار، فتح البـاري: (٤١٦/١١) وانظر مشكاة المصابيح: (١٠٢/٣).

## جێباسی دووەم

## چەند وێنەیەك لەئەشکە نجەکانیان

## خوازگەی یەکەم

### جودایی ئەشکە نجەی دۆزەخنشینان

لەبەر ئەوەی دۆزەخ نهۆم نهۆمەو هێندێك ئەشکەنجەو پەرژەنگیان لەهەندێك سەختره، ئازارو ئەشکەنجەی خەڵکەکەشی جودا دەبێ. پێغەمبەر ﷺ لەبارەی دۆزەخییانەوە دەفەرمێ:

((منهم من تأخذه النار إلى كعبيه، ومنهم من تأخذه النار إلى ركبتيه، ومنهم من تأخذه النار إلى حجزته، ومنهم من تأخذه النار إلى ترقوته: هی وایان تێدایە ئاگر تا گۆزینگانی دەگرێ، هی وای تێدایە تا چۆکانی وتێیدایە هەتا دۆخینی، ئی واش هەیە تاقوڵکەستۆی دەگرێ. لەگێرانەوەیەکیش دەفەرمێ: ((الى عنقه: تاگەردنی))[٣].

هەروەها پێغەمبەر ﷺ باسی ئازار سوکترین کەسی دۆزەخی بۆ فەرموین، هەروەك لەصەحیحی بوخاریدا هاتوە کە نوعمان کوڕی بەشیر دەڵێ: لە پێغەمبەرﷺم بیست دەیفەرمو:

((إن أهون أهل النار عذابا يوم القيامة لرجل توضع في أخمص قدميه جمرة يغلي منها دماغه: ئەشکەنجە سوکترین کەس لەڕۆژی قیامەتی پیاوێکە ژیلەمۆیەکی لەقولایی پێ دادەنرێ مێشکی لەگەڵ دەکوڵێ)).

هەر لەصەحیحی بوخاریدا بە گێرانەوەیەکی دیکەوە هەر لەنوعمانی کوڕی بەشیروە هاتوە: ((إن أهون أهل النار عذابا يوم القيامة رجل على أخمص قدميه جمرتان يغلي منهما دماغه كما يغلي المرجل في القمقم: ئەشکەنجە سوکترین کەس لەڕۆژی دواییدا پیاوێکە دو ژیلەمۆی لەسەر هەردو سینگە پێیانە، مێشکی وەکو ئاوی ناو مەنجەڵ

[٣] رواه مسلم واحمد عن سمرة؛ صحيح مسلم، كتاب الجنة وصفة نعيمها، باب شدة حرّ النار، (٤/٢١٨٥).

**لەگەڵیدا قوڵپ دەداو دەکوڵێ))**[٤].

**هەر لەگێڕانەوەی هەمان یاوەر لای موسلیم هاتوە:** ((إن أهون أهل النار عذابا من لـــه نعلان وشراكان من نار، يغلي منهما دماغه كما يغلي المرجل ما يرى أن أحدا أشد منه عذابا وإنـــه لأهونهم عذابـــا: **ئەشکەنجە سوکترین خەڵکی دۆزەخ ئەو کەسەیە کە جۆتە پێڵاوێك وجۆتە قەیتانێکی ئاگرینی هەیە، مێشکی لەتاویان وەکو مەنجەڵ دەکوڵێ، وا دەزانێ کەس ئەشکەنجەی هێندەی وی سەخت نیە، لەکاتێکدا ئەشکەنجەی لەهەموان ساناو سوکترە))**[٥].

**دیسان لەصەحیحی موسلیمدا لەئەبوسەعیدی خودری هاتوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموی:** ((إن أدنى أهل النار عذابا ينتعل بنعلين من نار يغلي دماغه من حـــرارة نعليـــه: **ئازار سوکترین کەس لەدۆزەخدا جوتە سۆڵێکی ئاگرین لەپێ دەکا، مێشکی لەتاو گەرمایی ئەو جوتە سۆڵە دەکوڵێ))**[٦].

**وبوخاری و موسلیم لەئەبو سعیدی خودری (ڕەزای خوای لێبێ) دەگێڕنەوە، کە گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بو پاش ئەوەی باسی ئەبو طالیبی مامی بۆ کراوە، فەرمویەتی:** ((لعله تنفعه شفاعتي يوم القيامة فيجعل في ضحضاح من النار يبلغ كعبيه يغلي منـــه أم دماغـــه: **بەڵکو لەڕۆژی دواییدا شەفاعەتی من بەکەڵکی بێ ولەتەنکاگرێکی دابنرێ، تا گۆزینگانی بێ کە مێشکی لەتاوان بکوڵێ))**[٧].

**دەقە قورئانیە پیرۆزەکانیش بە ڕاست دانانی جودایی ئەشکەنجەی دۆزەخییان هاتون، هەروەك خودای بەرز دەفەرمێ:**

﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الأَسْفَلِ مِنْ النَّـــارِ: **دوڕوەکان لەچینی هەرە ژێرەوەی دۆزەخدان**﴾النساء:١٤٥.

**و دەفەرمێ:** ﴿وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ أَدْخِلُوا آلَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ الْعَذَابِ: **لەڕۆژی قیامەت**

---

[٤] رواه البخاري في صحيحه: كتاب الرقاق، باب صفة الجنة والنار، فتح الباري: (٤١٧/١١).

[٥] صحيح مسلم، كتاب الإيمان: (١٩٦/١) ورقم الحديث: (٣٦٤).

[٦] صحيح مسلم، كتاب الإيمان: (١٩٥/١) ورقم الحديث: (٣٦١).

[٧] رواه البخاري في كتاب الرقاق، باب صفة الجنة والنار، فتح الباري: (٤١٧/١١)، ورواه مسلم في صحيحه في كتاب الأيمان، باب شفاعة النبيﷺ لأبي طالب، (١٩٥/١) حديث رقم ٣٦٠، وساق فيه عدة احاديث اخرى.

**فەرمان دەدرێ دەستەوبەستەکەی فیرعەون زۆر بەتوندی ئازار بدەن﴾**غافر:٤٦.

**دیسان دەفەرمێ:** ﴿الَّذِينَ كَفَرُوا وَصَدُّوا عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ زِدْنَاهُمْ عَذَابًا فَوْقَ الْعَذَابِ بِمَا كَانُوا يُفْسِدُونَ: **ئەو کەسانەی کافربون وخەڵکیان لەڕێی خودا دەگێڕایەوە، لە جەزای ئەو بەدفەڕیەدا کە دەیانکرد -قات لەبان قات- هەر ئازاریان پتر دەکەین.**﴾النحل:٨٨.

**قورطوبی لەم بابەتە دەڵێ: (ئەم دەروازەیە کە تەنیا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە کوفری بێبڕوایان، وەکو کوفری ئەو کەسە نیە کە بێبڕوایەو سەرکەش و یاخی دەبێ و سنور دەبەزێنێ، گومانیش لەوەدا نیە کە پشکی بێبڕوایان لەئەشکەنجەی دۆزەخ لێك جودایە، هەروەك لەقورئان و فەرمودەدا زانراوەو، لەبەر ئەوەی ئێمە بەشێوەیەکی سەلماو و گردەبڕ(قطع) دەزانین ئەشکەنجەی ئەوانەی پێغەمبەران و موسڵمانانیان کوشتوەو بەدکاری لەنێودا کردون و گەندەڵی خستۆتە زەوی و بێبڕوا بوە، یەکسان نیە بەئەشکەنجەی ئەوەی تەنیا بێبڕوا بوە، بەڵام لەئاست پێغەمبەران و موسڵمانان چاکەکار بوە، نابینی پێغەمبەر ﷺ چۆن ئەبو طالیبی بۆ تەنکاگرێك دەرهێناوە؟ چونکە سەری دەخست و داکۆکی لێ دەکرد و لەگەڵی چاکەکار بو، ئەو فەرمودەی موسلیمیش لەسەمرە دەیگێڕێتەوە بەبەڵگەی فەرمودەکەی ئەبوطالیب، دەگونجێ بۆ بێبڕوایان بێ، هەروەك دروستە بۆ ئەو یەکخواپەرستانە بێ کە ئەشکەنجە دەدرێن)**[8].

**ئیبنی رەجەب دەڵێ: (بزانە جودایی ئاستی ئەشکەنجەی دۆزەخییان بەگوێرەی ئەو کارو کردەوانەیانە کە لەدۆزەخێی خستون) ئەو بەڵگانەی هێناوەتەوە کە بەڵگەی ئەمەن و ئەم گۆتەیەی ئیبنی عەباسیشی هێناوەتەوە: (سزای ئەو کافرەی لەبێبڕواییەکەی توندو ڕەقەکار بوەو خراپەو گەندیی لەزەویدا بڵاو کردوەو بۆ بێبڕوایی بانگەوازی کردوە، وەك سزای یەکێك نیە ئەو کارانەی نەکردبێ). پاشان ئیبنی رەجەب دەڵێ: (ئەشکەنجەی یەکخواپەرستە یاخییەکانیش لەدۆزەخدا هەر بەم شێوەیەو بەگوێرەی کردەوەکانیان جودایە، جا سزای ئەوانەی تاوانی گەورەو ناقوڵا ئەنجام دەدەن وەك هی ئەوانە نیە کە گوناهی گچکە ئەنجام دەدەن، ڕەنگە بەهۆی**

---

[8] التذكرة للقرطبي: ص٤٠٩

خێرو چاکەی دیکە یا بە هەر هۆیەکی خودای گەورە بیەوێ، ئەشکەنجەی هەندێکیان سوك بێ، لەبەر ئەمەشە کە هەندێکیان لەدۆزەخدا دەمرن)[9].

## خوازگەی دوەم

## برژاندنی پێستان

ئاگری خودای زاڵو خاوەن دەسەلات پێستەی دۆزەخییان دەسوتێنێ، پێستیش جێی هەستکردن بەئێشی سوتانە، بۆیە هەر چەند جارێ پێستیان بسوتێ خودا بەپێستەی دی بۆیان دەگۆڕێ، هەتا سەرلەنوێ بسوتێتەوە، جا بەم شێوەیە وەرەدوێ:

﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُمْ بَدَّلْنَاهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُوا الْعَذَابَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا: بەراستی ئەو کەسانەی لە نیشانەکانی ئێمە حاشا دەکەن، لە دوارۆژدا بە ئاگر دەیان سوتێنین، هەر کاتێ پێستی لەشیان ببرژێ و بسوتێ، پێستی دیکەیان بۆ دەگۆڕین تا ئازار پتر بچێژن، خودا خاوەن دەسەلاتی لەکار زانە﴾النساء:٥٦.

[9] التخويف من النار: ص١٤٢-١٤٣.

## خوازگەی سێیەم

## تاواندنەوە

یەکێك لەجۆرەکانی ئەشکەنجە بەسەردا ڕێشتنی حەمیمە، کە ئەو ئاوە داغەیە تا ئەوپەڕی کوڵیو گەرمەو لەبەر زۆر گەرمی ڕیخۆڵەکان وهەر شتێکی لەهەناودا بێ دەیتاوێنێتەوە:

﴿فَالَّذِينَ كَفَرُوا قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ مِنْ نَارٍ يُصَبُّ مِنْ فَوْقِ رُءُوسِهِمُ الْحَمِيمُ، يُصْهَرُ بِهِ مَا فِي بُطُونِهِمْ وَالْجُلُودُ: جا ئەو کەسانەی بێبڕوا بون، جلکیان لەئاگر بۆ دەبڕدرێ و ئاوی کوڵاو داغیان بەسەردا دەڕێژدرێ، بەشێوەیەك هەناو و پیستەیان هەمو دادەکوڵێ و دەتوێتەوە﴾الحج:١٩-٢٠.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ: ((إن الحميم ليصب على رؤوسهم فينفذ حتى يخلص إلى جوفه فيسلت ما في جوفه، حتى يمرق من قدميه، وهو الصهر، ثم يعود كما كان: حەمیمیان بەسەردا هەڵدەڕێژێ جا تا دەگاتە هەناویان دەیانسمێو ئەوی لە هەناویاندایە ڕایدەماڵێ، هەتا لەپێیانی دەردەچێ، ئەمەش تاوانەوەیە، پاشان چۆن بو ئاوهای لێدەکرێتەوە))[١٠].

[١٠] اخرج الترمذي من حديث ابي هريرة: التخويف من النار لأبن رجب: ١٤٥، جامع الأصول: (٥٤٠/١٠).

## خوازگەی چوارەم

### داخ کردن

**ڕوخسار ڕیزدارترین ئەندامی مرۆڤە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ نەهی لێ کردوین لە ڕوان بدەین، بۆ زێدە سوك کردنی دۆزەخییان لەلایەن خوداوە، لەڕۆژی دوایی بەکوێری و کەڕی و لاڵی لە سەر ڕو حەشر دەکرێن:**

﴿وَنَحْشُرُهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى وُجُوهِهِمْ عُمْيًا وَبُكْمًا وَصُمًّا مَأْوَاهُمْ جَـــهَنَّمُ كُلَّمَـــا خَبَتْ زِدْنَاهُمْ سَعِيرًا: **لەڕۆژی قیامەتیدا ئەوانە بەسەر ڕویاندا بە کوێری و لاڵی و کەڕی حەشریان دەکەین و جێگەیان دۆزەخە، هەر کاتێك ئاگرەکەی کز بێ نێلی دەدەین و بڵیسەی زیادەکەین**﴾الاسراء:٩٧.

**هەر لەسەر ڕوش هەڵدەدرێنە نێو دۆزەخ:**

﴿وَمَنْ جَاءَ بِالسَّيِّئَةِ فَكُبَّتْ وُجُوهُهُمْ فِي النَّارِ هَلْ تُجْزَوْنَ إِلاَّ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ: **هەر کەسێکی کاری بەدو ناحەز بکا، بەسەر ڕوی هەڵدەدرێتە نێو ئاگر. ئایا سزاتان هەر لەپای کاروکردەوەتان نیە؟**﴾النمل: ٩٠.

**پاشان ئاگر هەتاهەتایە ڕویان دادەگرێ و داخی دەکا و هەرگیز ناتوانن بەربەستێك لەنێو خۆیان و ئاگردا بەرپا کەن:**

﴿لَوْ يَعْلَمُ الَّذِينَ كَفَرُوا حِينَ لاَ يَكُفُّونَ عَنْ وُجُوهِهِمُ النَّارَ وَلاَ عَنْ ظُـــهُورِهِمْ وَلاَ هُمْ يُنْصَرُونَ: **ئەگەر بێبڕوایان بیانزانیبا کاتێك کە ناتوانن بلێسەی ئاگر لەدەموچاو وپشتی خۆیان دور بخەنەوەو ئەوانە سەرناخرێن و یارمەتی نادرێن**﴾الانبیاء:٣٩.

﴿تَلْفَحُ وُجُوهَهُمُ النَّارُ وَهُمْ فِيهَا كَـــالِحُونَ: **دەم و چاویان بە ئاگر هەڵدەپروزێت و لێوەکانیان هەڵدەچرچێ**﴾المؤمنون: ١٠٤.

﴿سَرَابِيلُهُمْ مِنْ قَطِرَانٍ وَتَغْشَى وُجُوهَهُمُ النَّارُ: **پۆشاکیان لەقەترانی ڕەشەو ڕویان ئاگر دایپۆشیوە**﴾ابراهیم: ٥٠.

﴿أَفَمَنْ يَتَّقِي بِوَجْهِهِ سُوءَ الْعَذَابِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: ئاخۆ كەسێ ناچار دەبێ سزای بەژانی قیامەتێ، بەچارەی خۆی لە خۆ لادا، دەبێ چۆن بێ﴾الزمر:٢٤.

سەیری ئەو دیمەنە کاریگەرەش بکە کە جەستە لەتاوی دەتەزێ:

﴿يَوْمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمْ فِي النَّارِ يَقُولُونَ يَالَيْتَنَا أَطَعْنَا اللَّهَ وَأَطَعْنَا الرَّسُولاَ: ئەوێ رۆژێ دەم وچاویان لە ئاگردا ئەم دیو و ئەودیوی پێدەکرێ، ئێژن: خۆزی بە فەرمانی خوامان کردبا و بەرفەرمانی پێغەمبەر باین.﴾الاحزاب:٦٦.

بینیت چۆن گۆشت لەسەر ئاگری هەڵگێرو وەرگێر دەکرێ، دیتیت ماسی چۆن سور دەکرێتەوە، ڕوی وانیش ئاوا سەروژێر دەکرێ، خۆ بەخوا پەنا دەگرین لەئەشکەنجەی ئاگری.

## خوازگەی پێنجەم

## ڕاکێشـان

جۆرێکی دی لەئەشکەنجە پڕ ئێشەکان، ڕاکێشانی کافرانە بۆ دۆزەخی لەسەر ڕویان:

﴿إِنَّ الْمُجْرِمِينَ فِي ضَلاَلٍ وَسُعُرٍ، يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِي النَّارِ عَلَى وُجُوهِهِمْ ذُوقُوا مَسَّ سَقَرَ: تاوانباران لە دەبەنگی و گومڕاییدان ئەوێ رۆژێ کە دەمەوڕو لە ئاگردا ڕەکێش دەکرێن، دە بچێژن گڵپەی ئاگری دۆزەخ.﴾القمر:٤٧-٤٨.

ئەوی ژانیان زێتر دەکاو، ئێشیان پتر پێ فرەدەکا، لەکاتی جەڕاندن وڕاکێشانیان بەکۆت و زنجیری ئەستور بەندکراون:

﴿فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ، إِذْ الأَغْلاَلُ فِي أَعْنَاقِهِمْ وَالسَّلاَسِلُ يُسْحَبُونَ، فِي الْحَمِيمِ ثُمَّ فِي النَّارِ يُسْجَرُونَ: جا ئەوانە دەزانن، ئەو دەمەی کۆتەکانیان لەمل دەکرێ و بەزنجیرەوە پەلکێشی دۆزەخ دەکرێن، لەناوی داغ و ئینجا لەئاگردا گڕ دەگرن﴾غافر:٧٠-٧٢.

قەتادە دەڵێ: جارێك بەناو ئاگریدا ڕادەکێشرێن، جارێکی دیکە لەناو حەمیم هەڵدەکێشرێن[11].

---

[11] التخويف من النار، لابن رجب،ص١٤٧.

## خوازگەی شەشەم

## ڕەشکردنی ڕووەکان

**خودای گەورە لەدواییدا ڕوی دۆزەخییان ڕەش دەکا:**

﴿ يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ فَأَمَّا الَّذِينَ اسْوَدَّتْ وُجُوهُهُمْ أَكَفَرْتُمْ بَعْدَ إِيمَانِكُمْ فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ: **ئەو ڕۆژەی هەندێك رویان سپی و هەندێك رویان رەش هەڵدەگەڕێ، هەرچی ئەوانەن كە ڕویان ڕەش هەڵگەراوە، پێیان دەگوترێ: ئایا دوای بڕواهێنان كافر بون؟ دە ئێستا ئەشكەنجە تام كەن لەپای ئەو كافربونەوە**﴾آل عمران:١٠٦.

**ڕەشاتیەكەش گەلەك تۆخە، دەڵێی تاریكایی شەوێ بەسەر ڕویان داباریوە:**

﴿وَالَّذِينَ كَسَبُوا السَّيِّئَاتِ جَزَاءُ سَيِّئَةٍ بِمِثْلِهَا وَتَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ مَا لَهُمْ مِنَ اللَّهِ مِنْ عَاصِمٍ كَأَنَّمَا أُغْشِيَتْ وُجُوهُهُمْ قِطَعًا مِنَ اللَّيْلِ مُظْلِمًا أُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ: **ئەو كەسانەی خراپەیان كردوە بەقەد تاوانەكانیان سزادەدرێن و، خەجاڵەتی و سەرشۆڕی و ڕوڕەشی ماندوی كردون، كەس نیە پەنایان بدات لەخەشم و قینی خوا، ئەوەندە ڕوڕەشن هەر دەڵێی پارچەیەك لە شەوی تاریك ڕوخساری داپۆشیون. ئا ئەوانە نیشتەجێی ناو ئاگری دۆزەخن، تا هەتایی تێیدا دەمێننەوە**﴾یونس:٢٧.

## خوازگەی هەفتەم

### دەورەداگرتنی ئاگر لەکافران

دۆزەخییەکان ئەو بێبڕوایانەن کە گوناه و تاوانەکانیان دەوری گرتون و دایگرتون، چ چاکەکیان نەماوە، هەروەکو خودای کاربەجێ لە وەڵامی ئەو جولەکانەی کە دەیانگوت: چەند ڕۆژێکی دیاریکراو نەبێ ئاگر نامانسوتێنێ. فەرموی:

﴿بَلَى مَنْ كَسَبَ سَيِّئَةً وَأَحَاطَتْ بِهِ خَطِيئَتُهُ فَأُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ: دیارە هەرکەس خۆی توشی خراپە بکا و خراپەکەی دەوری دابێ، ئەو کەسانە دۆزەخیین و تاسەر لەنێو ئاگردا دەمێننەوە﴾البقرة:٨١.

مرۆڤیش وای بەسەر نایێ ئەگەر بێبڕوایەکی هاوبەش دانەر نەبێ. صیددیقی حەسەن خان دەڵێ: (لێرەدا مەبەست تێکڕای خراپەکاریەکانەو وا دەخوازێ هۆکارەکان لەهەر چوار لاوە دەوریان تەنیبێ‌و چ چاکەیەکی نەمابێ و، هەمو دەروێکی ڕزگاربونی لێگیرابێ، تاسەر مانەوەش لەدۆزەخدا بۆ کافرو موشریکانە، جا دەبێ لەم ئایەتەدا خراپەکاری و گوناح بەکوفرو شیرك ڕاڤە بکرێن، بەم شێوەیە ئەو ڕایەی موعتەزیلەو خەواریج پێوەی پابەست بون پوچەڵ دەبێتەوە، چونکە بەفەرمودەی موتەواتیر سەلماوە کە یەکخواپەرستە گوناهبارەکان لەدۆزەخ دەردەچن)[١٢].

جا لەبەر ئەوەی گوناه و تاوان وەکو بازنی دەستان دەوری بێبڕوایان دەدەن، سزاش لەجۆری کردار دەبێ، جا لەهەمو لایەکەوە ئاگر چواردەوری بێبڕوایان دادەگرێ، هەروەکو خودا دەفەرمێ:

﴿لَهُمْ مِنْ جَهَنَّمَ مِهَادٌ وَمِنْ فَوْقِهِمْ غَوَاشٍ: ئەوانە لەدۆزەخدا ڕایەخ و سەرپۆشیان لەئاگر دەبێ﴾الاعراف:٤١.

مەبەست ئەوەیە کە ئاگر لەسەرو لەبن دایاندەگرێ، هەروەك خوای بەرز دەفەرمێ:

---

[١٢] يقظة اولي الاعتبار / ص٦٧

﴿يَوْمَ يَغْشَاهُمْ الْعَذَابُ مِنْ فَوْقِهِمْ وَمِنْ تَحْتِ أَرْجُلِهِمْ: ئەو ڕۆژەی کە ئەشکەنجە لەبان سەریان و لەژێر پێیان ئەوان دەگرێتە بەر و دایان دەپۆشێ﴾العنكبوت:٥٥.

لەشوێنێکی تریشدا دەفەرمێ ﴿لَهُمْ مِنْ فَوْقِهِمْ ظُلَلٌ مِنْ النَّارِ وَمِنْ تَحْتِهِمْ ظُلَلٌ: ئەوانە لەسەریانەوە پەڵەهەوری دوکەڵ لە ئاگر و لەژێریانەوە هەمان پەڵەهەورو دوکەڵ هەیە﴾الزمر:١٦.

لەشوێنێکی دیکەشدا زۆر بەڕاشکاوی باسی دەورەداگرتنی فەرموە:

﴿وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌ بِالْكَافِرِينَ: بەڕاستی دۆزەخ دەوری بێباوەڕانی گرتوە﴾التوبة:٤٩.

ئەو دەورەدانە بەواتایەکی تریش دێ دۆزەخ شورەیەکی هەیە کە دەوری بێبڕوایان دەداو بەهیچ جۆرێك ناتوانن لێی دەربازبن، خوای بەرز دەفەرمێ:

﴿إِنَّا أَعْتَدْنَا لِلظَّالِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَا وَإِنْ يَسْتَغِيثُوا يُغَاثُوا بِمَاءٍ كَالْمُهْلِ يَشْوِي الْوُجُوه بِئْسَ الشَّرَابُ وَسَاءَتْ مُرْتَفَقًا: ئێمە بۆ ستەمکاران ئاگرێکمان ئامادە کردوە کە لەهەموو لایەك دەوری داون بەدیوار و بەربەستی سەخت ئابلۆقە دراون و ئەگەر داوای ئاو بکەن، ئاوێکیان دەدرێتێ کە وەك کانزایەکی تواوە وایە دەم وچاویان دەبرژێنی. ئای چ خواردنەوەیکی خراپ و جێگەیەکی نالەبارە﴾الكهف:٢٩.

## خوازگەی هەشتەم

## ئاگر دەگاتە دڵان

لەوە دواین کە دۆزەخییەکان لەنێو ئاگردا گەورە و زەبەلاح دەبن، لەگەڵ هەندێش ئاگر دەچێتە ناو جەستەیان تا دەگاتە قوڵترین شتیان:

﴿سَأُصْلِيهِ سَقَرَ، وَمَا أَدْرَاكَ مَا سَقَرُ، لاَ تُبْقِي وَلاَ تَذَرُ، لَوَّاحَةٌ لِلْبَشَرِ: بەم زوانە دەیهاوێمە دۆزەخەوە، کوا دەزانی دۆزەخ چیە؟ نە دەهێڵێ و نە واز دێنێ، پێستی مرۆڤ ڕەش دەکاو دەبرژێنێ﴾المدثر:٢٦-٣٠.

هەندیك لەپێشینانیش دەڵێن (لاَ تُبْقِي وَلاَ تَـذَرُ) واتـە: (هێسك و گۆشت و مێشك هەڵدەلوەشێ و وەکو خۆی نایهێڵێ)[13].

هەروەها خودای بەرز فەرموی: ﴿كَلاَّ لَيُنبَذَنَّ فِي الْحُطَمَةِ، وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْحُطَمَـةُ، نَارُ اللَّهِ الْمُوقَدَةُ، الَّتِي تَطَّلِـــعُ عَلَـــى الأَفْئِـدَةِ: وانیـە، تورهەڵدەدرێتە نێو دۆزەخـی وردوخاشکەر، تۆ چوزانی دۆزەخ چیە؟ ئاگری هەڵایساوی خوایە، ئەو ئاگرەی لەنێو دڵ و دەرونەوە بڵێسە دەکاو سەرهەڵدەدا﴾ الهمزة:٤-٧.

موحەمەدی کوڕی کەعبی قورەظی دەڵێ: (ئاگر تا دەگاتـە دڵـی هەڵیدەلوشـێ، کـە گەیشتە دڵی سەرلەنوێ بنیاتی تازە دەکرێتەوە. لە ثابیتی بەنانیەوە هاتوە کە ئەم ئایەتەی وەخویندوەو، پاشان گوتی: ئاگر تا دڵان دەیانسوتێنێ و هێشتا زندون، جا بەراستی ئەشکەنجە دەستی لێ ستاندون، پاشان دەگریێ)[14].

## خوازگەی نۆیەم

## هەڵڕژاندنی ریخەڵۆکان لەدۆزەخدا

لەهەردو صەحیحاندا لەئوسامەی زەیدەوە لەپێغەمبەر ﷺ هاتوە کە فەرمویەتی:

((يجاء بالرجل يوم القيامة، فيلقى في النار، فتندلق أقتابه في النار، فيطحن فيها كطحن الحمـــار برحاه، فيجتمع أهل النار عليه فيقولون: أي فلان، ما شأنك؟ أليس كنت تأمرنا بالمعروف وتنـــهانا عن المنكر؟ قال: كنت آمركم بالمعروف ولا آتيه، وأنهاكم عن المنكـــر وآتيـــه: لەڕۆژی دوایـی پیاو هەیە دەهێنرێو، هەڵدەدرێتە نێو ئاگری دۆزەخ جا ریخۆڵەکانی هەڵدەڕژێنە ناو ئاگرو وەکو کەری ئاشگێڕ دەیهاڕێ، ئەوجا دۆزەخـی لێـی خڕ دەبنـەوەو، دەڵێـن: هـۆ فلان، ئەوە چتە؟ ئەدی ئەتو فـەرمانی چاکـەت پـێ نـەدەکردین و بـەری خراپـەت لێ نەدەگرتین؟ دەڵێ: من فەرمانی چاکەم پێ دەکردن و خۆم نەمدەکردو، بەری خراپەم لێ

[13] التخويف من النار، لابن رجب:ص١٤٦.

[14] التخويف من النار، لابن رجب ص١٤٦.

دەگرتن و خۆم ئەنجامم دەدا)).[15]

پاشان ئەو کەسە بەدەوریدا دەگەڕێ و دەسوڕێ وەکو ئەو کەرەی ئاش دەگێڕێ.

عەمری کوڕی لەحی کەیەکەمین کەسە دینی عارەبانی گۆڕیوە یەکێکە لەو کەسانەی لەدۆزەخدا ریخۆڵەکانیان لەدوای خۆ رادەکێشن، پێغەمبەریش ﷺ دیتی لەدۆزەخدا ریخوڵەی خۆی پەلکێش دەکرد، لەصەحیحی موسلیمدا لەجابیری کوڕی عەبدوڵلا هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((رأيت عمرو بن عامر الخزاعي يجرّ قصبه في النار، وكان اول من سيب السوائب[16]: عەمری کوڕی عامیری خوزاعیم دیت لەنێو دۆزەخدا ریخەڵۆکی خۆی رادەکێشا، هەر ئەویش یەکەم کەس بو حەڵاڵی حەرام کرد)).[17]

## خوازگەی دەیەم

## کۆت و پێوەندو زنجیرو کوتەکی دۆزەخنشینان

خودا لەدۆزەخدا زنجیرو پێوەندو کۆت و کوتەکی بۆ دۆزەخییان ئامادەکردوە:

﴿إِنَّا أَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ سَلَاسِلَا وَأَغْلَالًا وَسَعِيرًا: ئێمە کۆت و زنجیرو ئاگری سوتێنەرمان بۆ بێبڕوایان سازداوە﴾الانسان:٤.

﴿إِنَّ لَدَيْنَا أَنكَالًا وَجَحِيمًا، وَطَعَامًا ذَا غُصَّةٍ وَعَذَابًا أَلِيمًا: کۆت و زنجیرو ئاگری دۆزەخمان لایە، لەگەڵ خۆراکی گەروگر و ئەشکەنجەی پڕئێش﴾المزمل:١٢و١٣.

پێوەندەکانیش لەملان دەکرێن ﴿وَجَعَلْنَا الأَغْلَالَ فِي أَعْنَاقِ الَّذِينَ كَفَرُوا هَلْ يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ: کۆت و پێوەندیش لەملی ئەوانە دەکەین کە بێبڕوان،

---

[15] متفق عليه؛ مشكاة المصابيح: (٢/٦٤٢) حديث رقم ٥١٣٩.

[16] تسبيب السوائب: بریتیە لەیاساکەی کە عەمر بۆ عارەبانی دانابو، ئەو شتانەی تیدا حەڵاڵ کردبو خوا حەرامی کردوە، هەندێك ئاژەلی حەرام کردبون بەبێ فەرمانی خودا و نەیدەهێشت سەربڕین یا بدۆشرین یا پشت بکرێن.

[17] مشكاة المصابيح: (٣/٦٨٨)

ئایا لەپای کردەوەکانیان نەبێ چیدی سزا دەدرێن﴾سبأ:٣٣.

﴿إِذْ الأَغْلَالُ فِي أَعْنَاقِهِمْ وَالسَّلَاسِلُ يُسْحَبُونَ: ئەو دەمەی کۆتیان لەگەردنەو بەزنجیرەوە رادەکێشرێن﴾غافر:٧١.

﴿إِنَّ لَدَيْنَا أَنكَالاً : بەراستی کۆت و پێوەند لەلای ئێمە هەیە﴾ المزمل:١٢.

بۆیەش لێرە کۆتەکان بە (انکال) ناوبراون چونکە خودا بەو کۆتانە ئەشکەنجەیان دەداو دەیانکانە پەند. زنجیرەکانیش جۆرێکی دیکەی ئەشکەنجانن کە تاوانبارانی پێ کۆت دەکرێ وەکو کۆت کردنی تاوانباران لەدنیادا. دە چاو بدە ئەم وینەیەی قورئانی پیرۆز پێی نیشانداوین:

﴿خُذُوهُ فَغُلُّوهُ، ثُمَّ الْجَحِيمَ صَلُّوهُ، ثُمَّ فِي سِلْسِلَةٍ ذَرْعُهَا سَبْعُونَ ذِرَاعًا فَاسْلُكُوهُ: بیگرن، کۆت و زنجیری کەن، ئەوجا بەرەو دۆزەخ پەلکێشی کەن، پاشان بەزنجیریکی کە هەفتا گەزی شەتەك دەن و رەپێشیکەن﴾الحاقة:٣٠-٣٢.

هەروەها خودا کوتەکی ئاسنینی بۆ خەڵکی دۆزەخ ئامادە کردوەو بریتین لەو چەکوشانەی دەدرێن بەسەر تاوانکاراندا، کە هەوڵ دەدەن لەدۆزەخ بچنە دەرێ، جارێکی دی هەڵیان دەداتەوە بنکی دۆزەخ:

﴿وَلَهُمْ مَقَامِعُ مِنْ حَدِيدٍ، كُلَّمَا أَرَادُوا أَنْ يَخْرُجُوا مِنْهَا مِنْ غَمٍّ أُعِيدُوا فِيهَا وَذُوقُوا عَذَابَ الْحَرِيقِ: بۆ ئەوان گورزی ئاسنین هەیە، هەرکاتێك بیانەوێ لەخەم و خەفەتی دۆزەخ برۆنە دەرێ. دیسان دەگێردرێنەوە نێوی و پێیان دەگوترێ: ئەشکەنجەی سوتێنەر بچێژن﴾الحج:٢١-٢٢.

## خوزاگەی یازدەم

### کۆکردنەوەی دۆزەخییان لەگەڵ پەرستراوو شەیتانەکانیان لەدۆزەخدا

بێبڕواو هاوبەشکاران ئەو خواوەندانەیان بەمەزن دەگرت کە بێجگە لە خودا دەیانپەرستن، هەروەها داکۆکیان لێ دەکردن و، سەروماڵیان لەپێناودا دەبەخشین، لەرۆژی دواییشدا، خودای گەورە ئەو خواوەندانە لەدۆزەخی داوێ کە بێجگە لە خودا دەپەرستران، تا زێتر بەندەکانیان سوك وسەرشۆڕ بکا، تاکو بزانن کە گومڕا بوینەو، شتانێکیان پەرستوە نە سودیان پێ دەگەیەنن نە زیان:

﴿إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنْتُمْ لَهَا وَارِدُونَ، لَوْ كَانَ هَـؤُلاَءِ آلِهَةً مَا وَرَدُوهَا وَكُلٌّ فِيهَا خَالِدُونَ: ئێوه وئەوەی بێجگە لەخوا دەتانپەرست، دەبنە دەستەچیلەی دۆزەخ و ئێوە هەمو دەچنە نێوی. ئەگەر ئەوانە خوا بونایە قەت نەدەچونە نێو ئاگر، هەمو بت و بتپەرستان لەوێدا تاهەتایی دەمێننەوە﴾الانبیاء:٩٨-٩٩.

ئیبنی رەجەب دەڵێ: (کە بێبڕوایان بێجگە لە خودا خواوەندی دیکەیان پەرستوە، واشیان گومان بردوە لە لای خودا تکاو شەفاعەتیان بۆ دەکاو، لەخوایان وەنێزیك دەخا، بۆ سوك و زەلیل کردن بەوەی سزا دران کە ئەو خواوەندانەشیان لەگەڵ خرایە دۆزەخ، تا زێتر ریسوا بن پتر ئاخ و حەسرەتی پەشیمانی هەڵکێشن، چونکە ئەگەر مرۆڤ لە ئەشکەنجە دانێ کۆکراوە لەگەڵ ئەوەی هۆی ئەشکەنجەو ئازارەکانیانن ژان و حەسرەتی سەختتر دەبن)[١٨].

لەبەر هەمان هۆ لەرۆژی دوایی ڕۆژ و مانگ هەڵدەدرێنە دۆزەخ تا ببنە سوتەنیو مایەی جۆشی دۆزەخ و، بۆ لێدان و سەخت کردنی ئەو ستەمکارانەی بێجگە لەخوا دەیانپەرستن، لەفەرمودەشدا هاتوە: ((الشمس والقمر مكوران في النار:خۆرو مانگ

---

[١٨] التخويف من النار/ص١٠٥

لەدۆزەخدا پێچراو و گرمۆڵەن))[19].

قورطوبی دەڵێ: ( کە ڕۆژو مانگ لەئاگردا کۆدەکرێنەوە، لەبەر ئەوەیە بێجگە لەخوا پەرستراون، ئاگریش بۆ وان نابێتە ئەشکەنجە چونکە بێ‌گیانن، بەڵکو بۆ زێتر لێدان و پترکردنی ژان وحەسرەتی بێبڕوایانە، ئەمەش ڕای هەندێك زانایە)[20].

لەبەر هەمان واتاش بێبڕوایان لەگەل شەیتانەکانیان کۆدەکرێنەوە تا ئەو ئەشکەنجەیان سەختتر بێ:

﴿وَمَنْ يَعْشُ عَنْ ذِكْرِ الرَّحْمَانِ نُقَيِّضْ لَهُ شَيْطَانًا فَهُوَ لَهُ قَرِينٌ، وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنْ السَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ مُهْتَدُونَ، حَتَّى إِذَا جَاءَنَا قَالَ يَالَيْتَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ بُعْدَ الْمَشْرِقَيْنِ فَبِئْسَ الْقَرِينُ، وَلَنْ يَنفَعَكُمْ الْيَوْمَ إِذْ ظَلَمْتُمْ أَنَّكُمْ فِي الْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ: هەر کەسێکی ڕو لەیادی خوا وەرگێڕێ. شەیتانێکی بۆ دەنێرین کە هەمیشە لەگەڵی بن بەڕاستی شەیتانەکان ئەم دەستەیە لەرێگەی خوا دەگێڕنەوە، لەحاڵێکدا لایان وایە هەر ئەوان ڕێنوێن بون، تا ئەو کافرە دێتە لامان، دەڵێ: خۆزگە دوری نێوان من وتۆ ئەی شەیتان هێندەی نێوان خۆرهەلات و خۆرئاوا بوایە، تۆ چەند هاونشینێکی خراپی، هەرگیز ئەم خۆزیو پەشیمانیە لەوێ ڕۆژێ سودی نیە، چونکە ستەم و زۆرتان کرد، هەمو پێکەوە لەئەشکەنجەدا هاوبەشن﴾الزخرف:٣٦-٣٩.

---

[19] رواه البيهقي في (شعب الإيمان)، والبزار والإسماعيلي والخطابي؛ انظر سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٣٢/١).

[20] التذكرة للقرطبي/ص٣٩٢

## خوازگەی دوازدەهەم

## هەژمەت وپەشیمانی و نزایان

کاتێك بێبڕوایان چاویان بەدۆزەخ دەکەوێ، تا ئەوپەڕی پەشیمان دەبنەوە، دەمی پەشیمانیش بەسەرچوەو دادیان نادا:

﴿وَأَسَرُّوا النَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُا الْعَذَابَ وَقُضِيَ بَيْنَهُمْ بِالْقِسْطِ وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ: کاتێك ئەشکەنجە دەبینن پەشیمان بونەوەی خۆیان دەشارنەوە، وە لەنێوان ئەواندا بەدادگەری داوەری دەکرێ و ستەمیان لێ ناکرێ﴾یونس:٥٤.

ئەوجا کە بێبڕوا سەر بەسەرنامەی کردەوانی دادەگرێ‌و، بێبڕوایی و هاوبەشکاریەکەی تێدا دەبینی کە بۆ نەمری نێو دۆزەخی دەسازێنێ، دەست بەناڵەو هاوار و ڕۆڕۆیان دەکا:

﴿وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ وَرَاءَ ظَهْرِهِ، فَسَوْفَ يَدْعُو ثُبُوراً، وَيَصْلَى سَعِيراً: هەر کەسێکی لەپشتەوە نامەی کردەوەی دراوەتێ، زو هاواری لێ هەڵدەستێ‌و ئارەزوی تیاچون دەکا، وەلەنێو ئاگری هەڵایساو و تاوێنەر دەسوتێ﴾الانشقاق:١٠-١٢.

جا کە دەگەنە دۆزەخ و بڵێسەکان.داخیان دەکەن، زیاتر ناڵەیان بەرز دەبێتەوەو هاواری مردنی خۆدەکەن:

﴿وَإِذَا أُلْقُوا مِنْهَا مَكَاناً ضَيِّقاً مُقَرَّنِينَ دَعَوْا هُنَالِكَ ثُبُوراً، لاَ تَدْعُوا الْيَوْمَ ثُبُوراً وَاحِدًا وَادْعُوا ثُبُوراً كَثِيراً: هەرکاتێ ئەوانە بە کۆت و زنجیرەوە فڕێ دەدرێنە ناو شوێنێکی تەنگەبەری دۆزەخەوە کە پەلە بۆمردنێ دەکەن، ئەمڕۆ ئیتر هەر مردنێ داوا مەکەن؛ داوای گەلێ مردن بکەن.﴾الفرقان:١٣-١٤.

لەوێدا قیژەو هاوارو هەراو زەنایان توندتر دەبێ و، لەپەروەردگاریان دەپاڕێنەوە بەو ئاواتەی لەدۆزەخ دەریانبێنێ:

﴿وَهُمْ يَصْطَرِخُونَ فِيهَا رَبَّنَا أَخْرِجْنَا نَعْمَلْ صَالِحًا غَيْرَ الَّذِي كُنَّا نَعْمَلُ: ئەوانە لەدۆزەخدا هاواردەکەن، ئەی پەروەردگارمان بمان هێنە دەرێ تاکاری چاك

ئەنجام بدەین بێجگە لەوەی دەمانکرد﴾فاطر:٣٧. ئەوکاتە دان بەگومڕایی وبێبڕوایی و بێعەقلی خۆیان دادەنێن:

﴿وَقَالُوا لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ۞فَاعْتَرَفُوا بِذَنْبِهِمْ فَسُحْقًا لأَصْحَابِ السَّعِيرِ: دەڵێن: ئەگەر گوێمان دابانێ وەیا عەقڵمان وەکار خستبا لەریزی دۆزەخییان نەدەبوین، جا دانیان بەتاوانی خۆیان دانا، هەی لە ئارادا نەمێنن ئەم دۆزەخیانە﴾الملك:١٠-١١.

﴿قَالُوا رَبَّنَا أَمَتَّنَا اثْنَتَيْنِ وَأَحْيَيْتَنَا اثْنَتَيْنِ فَاعْتَرَفْنَا بِذُنُوبِنَا فَهَلْ إِلَى خُرُوجٍ مِنْ سَبِيلٍ: دەڵێن: ئەی پەروەردگاری ئێمە، دوجار ئێمەت مراندو، دوجار زندیت کردینەوە، ئێمەش دانمان بەگوناهی خۆمان دانا. جا چ رێگەی دەرچون هەیە﴾غافر:١١.

بەڵام داواکەیان زۆر بەتوندی رەت دەکرێتەوە، ماڵات شایستەی چیە وا وەڵامیان دەدرێتەوە:

﴿قَالُوا رَبَّنَا غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا وَكُنَّا قَوْمًا ضَالِّينَ، رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْهَا فَإِنْ عُدْنَا فَإِنَّا ظَالِمُونَ، قَالَ اخْسَئُوا فِيهَا وَلاَ تُكَلِّمُونِ: دەڵێن: ئەی پەروەردگاری ئێمە بێبەختی دایگرتبوین و ئێمە هۆزێکی گومڕابوین، ئەی پەروەردگاری ئێمە لەمە بمانبە دەرێ، جا ئەگەر جارێکی دی دوپاتمان کردەوە بەراستی ستەمکارین و شیاوی ئەشکەنجەین. دەفەرمێ: بێدەنگ، لاڵ بن هەر قسەم بۆ مەکەن﴾المؤمنون:١٠٦-١٠٨.

تازە بڕیاری خودایان لێ هاتۆتە دی، بەو چارەنوسی گەیشتون کە نەنزا دادیان دەدات و نەتکایان قبوڵ دەکرێ:

﴿وَلَوْ تَرَى إِذْ الْمُجْرِمُونَ نَاكِسُوا رُءُوسِهِمْ عِنْدَ رَبِّهِمْ رَبَّنَا أَبْصَرْنَا وَسَمِعْنَا فَارْجِعْنَا نَعْمَلْ صَالِحًا إِنَّا مُوقِنُونَ، وَلَوْ شِئْنَا لآتَيْنَا كُلَّ نَفْسٍ هُدَاهَا وَلَكِنْ حَقَّ الْقَوْلُ مِنِّي لأَمْلأَنَّ جَهَنَّمَ مِنْ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ، فَذُوقُوا بِمَا نَسِيتُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَذَا إِنَّا نَسِينَاكُمْ وَذُوقُوا عَذَابَ الْخُلْدِ بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ: کاتێ تۆ تاوانبارەکان بەسەرشۆڕی ببینیەوە کە لەلای پەروەردگاریانن: ئەی پەروەردگارمان! دیتمان و بیستمان و تەواو باوەڕمان هێناوە، سا تۆ بمانگەڕێنەوە؛

**ئەمجارە کاری چاك دەکەین. ئەگەر حەزمان بکردایە هەمو کەسمان بەرەو خۆ شارەزا دەکرد، بەلاّم من بەڵێنم داوە کە دۆزەخ-لەخێڵی جنۆکەو مرۆڤ- پڕ دەکەم. دە بچێژن! لەبیرتان چو کە توشی ئەم رۆژە دەبن، ئێمەش ئێوە لەبیردەکەین و لە سۆنگەی ئەو کارانەدا دەتانکرد، تاسەر ئازار بچێژن﴾**السجدة:١٢-١٤.

**پاش ئەوە دۆزەخییەکان هاواری ئاگرەوانان دەکەن، داواکارن تکایان بۆ بکەن تاکو خودا بڕێك لەو دەردو ئازارەیان سوك کا کە پێوەی دەناڵێنن:**

﴿وَقَالَ الَّذِينَ فِي النَّارِ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ ادْعُوا رَبَّكُمْ يُخَفِّفْ عَنَّا يَوْمًا مِنَ الْعَذَابِ، قَالُوا أَوَ لَمْ تَكُ تَأْتِيكُمْ رُسُلُكُمْ بِالْبَيِّنَاتِ قَالُوا بَلَى قَالُوا فَادْعُوا وَمَا دُعَاءُ الْكَافِرِينَ إِلاَّ فِي ضَلاَلٍ: **ئەوانەی لەناو ئاگری دۆزەخدان بە فریشتەکانی کارگێڕی دۆزەخ دەڵێن: داوا لە پەروەردگارتان بکەن تەنها رۆژێکمان لەو ئازارە بۆ کەم کاتەوە، ئێژن: ئاخۆ ئێوە پێغەمبەرەکانتان بە نیشانەی ئاشکراوە نەهاتۆتە لا؟ دەڵێن: بەڵێ. دەڵێن: دەی خۆتان وەپاڕێن؛ دیارە نزای خوانەناسان بەشی هەر بەفیڕۆ چونە﴾**غافر:٤٩-٥٠.

**ئەوجا داوای ئەو تکایە دەکەن کە پەروەردگاریان لەناویان ببا:**

﴿وَنَادَوْا يَامَالِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ قَالَ إِنَّكُمْ مَاكِثُونَ: **هاواریان کرد: هۆ مالیك، با پەروەردگارت لەنێومان ببا، گوتی: ئێوە هەر تێیدا دەمێنن﴾**الزخرف:٧٧.

**هەرچی داوای دەکەن رەت دەکرێتەوە، نە لەدۆزەخ دەردەهێنرێن و، نەئەشکەنجەیان سوك دەکرێ و نە لەنێو دەبرێن و تونا دەکرێن، بەڵکو ئازارو ئەشکەنجەیەکی تاهەتایە و سەرمەدی و بەردەوامە، ئەوکاتە پێیان دەگوترێ:**

﴿ فَاصْبِرُوا أَوْ لاَ تَصْبِرُوا سَوَاءٌ عَلَيْكُمْ إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ: **جا ئارام بگرن یا ئارام نەگرن بۆ ئێوە هەر یەکە، هەر لەپای کردەوەکانتان سزا دەدرێن.﴾**الطور:١٦.

**ئەوجا ناڵەیان سەختتر دەبێ و ئەسرین لەچاویان دەبارێ و شین و شەپۆڕ و گریانیان درێژە دەکێشێ:**

﴿فَلْيَضْحَكُوا قَلِيلاً وَلْيَبْكُوا كَثِيرًا جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ: **با کەم پێبکەنن و زۆر بگریەن لەسزای ئەو کردەوە بەدانەی ئەنجامیان دەدا﴾**التوبة:٨٢.

**هێنده دەگرین تا فرمێسکیان لەچاو وشك دەبێ، ئەوجا خوێن دەبارێنن، چۆن ئاوەڕۆ شون لەسەر بەردی جێ دێڵێ، فرمێسکەکان ئاوا سەر ڕویان قوڵ دەکەن، لەپێغەمبەرﷺ هاتوە دەفەرمێ:** ((إن اهل النار ليكون، حتى لو اجريت السفن في دموعهم، لجرت، وانهم ليبكون الدم –يعني– مكان الدمع: **دۆزەخنشین زۆر دەگرێن، تەنانەت ئەگەر کەشتیگەل لەناو ڕۆندکیان بڕوات، پێیدا دەچێ، ئەوان لەباتی فرمێسکان خوێن دەگرێن))**.[21]

**ئەنەسی کوڕی مالکیش بەم بێژەیە بەرزی دەکاتەوە** ((يرسل البكاء على اهل النارفيبكون حتى تنقطع الدموع، ثم يكون الدم حتى تصير في وجوههم كهيئة الأخدود، لو ارسلت فيه السفن لجرت: **گریان دەنێردریتە سەر دۆزەخنشینان تا ئەشکی چاویان وشك دەبی، پاشان خوێن دەگرێن هەتا سەر ڕویان وەك کەندڕی لێدێ، ئەگەر گەشتیگەلی بەنێودا ببردرێ، ڕێدەکا و دەڕوات))**.[22]

**ئەو ستەمکارانە خۆیان و خانەوادەیان لەدەستدا، کاتێك کوفریان لەئیمان خۆشترویست.**

**گوێ بدە ناڵەو هاواری کاتی چەشتنی ئازاریان:**

﴿يَوْمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمْ فِي النَّارِ يَقُولُونَ يَالَيْتَنَا أَطَعْنَا اللَّهَ وَأَطَعْنَا الرَّسُولاَ، وَقَالُوا رَبَّنَا إِنَّا أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَاءَنَا فَأَضَلُّونَا السَّبِيلاَ، رَبَّنَا آتِهِمْ ضِعْفَيْنِ مِنْ الْعَذَابِ وَالْعَنْهُمْ لَعْنًا كَبِيرًا: **ئەو ڕۆژەی ڕویان لەئاگردا ئەم دیو ئەو دیو دەکرێ، دەڵێن: خۆزی تاعەتی خواو تاعەتی پێغەمبەرمان بکردایە. وەدەڵێن: پەروەردگارمان، ئێمە پەیرەوی سەروەران و گەورەکانی خۆمان کرد و، گومرایان کردین، پەروەردگارمان دو هێندانە ئەشکەنجەیان بدەو بەنەفرینێکی گەورە نەفرەتیان لێبکە**﴾الاحزاب:٦٦.

---

[21] في مستدرك الحاكم عن عبدالله بن قيس.

[22] اورد الشيخ ناصر الحديثين في سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٢٤٥/٤) حديث رقم ١٦٧٩، وعزا الحديث الأول منهما الى الحاكم في مستدركه، وقد قال فيه الحاكم: (حديث صحيح الأسناد). و وافقه الذهبي، قال الشيخ ناصر: وحقه أن يزيد: على شرط الشيخين (فان رجاله كلهم من رجالهما، وذكر أن احد رجاله وهو ابو النعمان ويلقب (بعارم) كان قد اختلط، وساق الشيخ ناصر الحديث الثاني شاهداً للأول، وعزاه الى ابن ماجه وابن ابي الدنيا، ويزيد الرقاش احد رواته ضعيف، وباقي رجاله رجال الشيخين.

لەفەرمودەی خـودای بـەرزیش ڕامێنـە کەباسـی حاڵیـان دەکـا، خـوا لـەحاڵی وان پەنامان دا:

﴿ فَأَمَّا الَّذِينَ شَقُوا فَفِي النَّارِ لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَشَهِيقٌ۞خَالِدِينَ فِيـــهَا مَـــا دَامَـــتِ السَّمَاوَاتُ وَالأَرْضُ إِلاَّ مَا شَاءَ رَبُّكَ: جا ئەوانەی بەدبەخت بون لەئاگردان و لەوێدا هەناسە هەڵمژین و هەناسەدانەوەیان زۆر سەخت و دژوارە. تاسەر تێیدا دەمێننەوە، تا ئاسمان و زەوی هەبن، بێجگە لەودی پەروەردگارت دەیەوێ﴾هود:١٠٦-١٠٧.

زەجاج دەڵێ: زەفیر ئەو پشیەی لەتاو ناڵینەو گەلێك بەرزە، دەشڵێن زەفیر پەنگی پشییە لەسینگدا تا سییەکان دەماسێنی، ئەوەش ئەگەر لەترسان بێ، شەهیقیش پشی دانەوەی دورو درێژە، یاگێڕانەوەی هەناسەیە بۆ نێو سینگ، مەبەستیش بەو دو واژەیە، ئەو دژواری خەمانەیە کەتێی کەوتون، حاڵیان بەو کەس دەچوێنێ کە گەرمی دڵی داگرتوەو تەنگی بەگیانی هەڵچنیوە. لەیث یەژێ: زەفیر ئەوەیە کە پیاو لەکاتی غەمێکی گەورە سینەی پڕی هەناسە کا و بەتاڵی کا، شەهیقیش دانەوەی ئەو پشییەیە[٢٣].

---

[٢٣] يقظة اولي الأعتبار، لصديق حسن خان ص٧٢.

## بەندی دەیەم

### چۆن مرۆڤ خۆی لەئاگری خوا دەپارێزێ ؟

**لەبەر ئەوەی کوفرو بێبڕوایی هۆکاری تاسەر مانەوەیە لەدۆزەخدا کەواتە، ئیمان و کردەوەی چاك دەبنە هۆی لێرزگاربونی. بۆیە موسڵمانان بەئیمانەکەیان هانا وەبەر پەروەردگاریان دەبەن تا لەدۆزەخ رزگاریان کا:**

﴿الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا إِنَّنَا آمَنَّا فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ: **ئەو کەسانەی دەڵێن؛ پەروەردگارمان، بڕوامان هێنا، جا گوناهانی ئێمە ببەخشەو لەئەشکەنجەی دۆزەخ بمانپارێزە**﴾آل عمران:١٦.

﴿رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذَا بَاطِلاً سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ، رَبَّنَا إِنَّكَ مَنْ تُدْخِلِ النَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنْصَارٍ، رَبَّنَا إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِي لِلْإِيمَانِ أَنْ آمِنُوا بِرَبِّكُمْ فَآمَنَّا رَبَّنَا فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّئَاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ الأَبْرَارِ، رَبَّنَا وَآتِنَا مَا وَعَدْتَنَا عَلَى رُسُلِكَ وَلاَ تُخْزِنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّكَ لاَ تُخْلِفُ الْمِيعَادَ: **ئەی پەروەردگاری ئێمە! ئەم جیهانەت بەبێ هۆ بەدی نەهێناوە، پاکی بۆ تۆیە، جا ئێمە لەئەشکەنجەی ئاگر بپارێزە، ئەی پەروەردگاری ئێمە! هەر کەسێکی تۆ بیخەیە نێو دۆزەخ بەراستی ریسوات کردوەو، بۆ ستەمکاران یارمەتیدەرێك نیە، ئەی پەروەردگاری ئێمە! بەراستی ئێمە بانگی بانگوێژێکمان بیست کە خەڵکی بۆ بڕواهێنان بانگ دەکرد؛ بە پەروەردگارتان بڕوا بێنن، جا ئێمەش بڕوامان هێنا، ئەی پەروەردگاری ئێمە! لەگوناهمان خۆشبەو کردەوەی دزێو و ناشرینمان داپۆشەو، ئێمە لەگەڵ چاکان بمرێنە. ئەوەی لەسۆنگەی پەیامبەرانەوە بەڵێنت پێداوین، پێمان ببەخشەو لەڕۆژی دوایی زەبونمان مەکە، بەڕاستی تۆ لە بەڵێنی خۆت لانادەی**﴾آل عمران:١٩١-١٩٤.

**دەقەکانیش زۆر بەوردی لەم بابەتە دواون وئەو کردەوانەیان رون کردۆتەوە کە مرۆ لەدۆزەخ دەپارێزن، لەو کردەوانە خۆشویستنی خوایە. پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ:**

((والله لا يلقي الله حبيبه في النار: والله، خودا خۆشەویستی خۆی ناخاتە دۆزەخ))[1].

هەروەها ڕۆژو قەڵغانە بۆ دۆزەخ، هەروەك لە پێغەمبەر ﷺ هاتوە، دەفەرمێ:

((قال الله تعالى: الصيام جنة يستجن بها من النار: خودای بەرز فەرموی: ڕۆژو قەڵغانێکە خۆی پێ لەدۆزەخ دەپارێزی))[2].

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ: ((الصوم جنة من عذاب الله: ڕۆژو قەڵغانێکە بۆ ئەشکەنجەی خودا))[3]، بەڵام ئەگەر ڕۆژو لەحاڵەتی غەزای دوژمندا بێ ئەوە سەرکەوتنی هەرە مەزنە وەك لە پێغەمبەر ﷺ هاتوە دەفەرمێ:

((من صام يوما في سبيل الله بعد الله وجهه عن النار سبعين خريفا: هەر کەسێك ڕۆژێك لەپێناو خودا بەڕۆژو بو، خودا هەفتا پایزان ڕوی لەدۆزەخ وەدور دەخاتەوە))[4].

هەروەها لەخواترسان وجیهاد لەڕێی خوادا دەبنە مایەی ڕزگاربون لەدۆزەخ:

﴿وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ جَنَّتَانِ: هەرکەسێ لە ڕوبەڕوبونەوەی خوا بترسێ و مەبەستیانە لێیان نەڕەنجێ، دو باخی بۆ هەیە﴾الرحمن:٤٦.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ: ((لا يلج النار من بكى من خشية الله حتى يعود اللبن في الضرع، ولا يجتمع على عبد غبار في سبيل الله ودخان جهنم: ئەو کەسی لەترسی خودا گریابێ ناچێتە دۆزەخ هەتا شیر دەگەڕێتەوە گوانان، تۆزێکی ڕێی خوداو دوکەڵی دۆزەخیش لەسەر بەندەیەك کۆنابنەوە))[5].

هەروەها پێغەمبەر ﷺدەفەرمێ: ((ما اغبرت قدما عبد في سبيل الله، فتمسه النار: هەر بەندەیەك پێیەکانی لەپێناو خوادا تۆزیان گرتبێ، ئاگری دۆزەخی بەرناکەوێ))[6].

---

[1] في مستدرك الحاكم ومسند احمد عن انس بن مالك؛ حديث صحيح؛ انظر الجامع ١٠٤/٦.

[2] في مسند احمد، والبيهقي في شعب الايمان باسناد حسن عن جابر بن عبدالله؛ صحيح الجامع: ١١٤/٤.

[3] عند البيهقي في الشعب من حديث عثمان بن ابي العاص؛رواه احمد والنسائي وابن ماجة وابن خزيمة واسناده صحيح؛صحيح الجامع(٢٦٤/٣).

[4] عن ابي سعيد الخدري؛ رواه احمد، والبخاري ومسلم والترمذي والنسائي: صحيح الجامع: (٣١٠/٥).

[5] رواه الترمذي والنسائي في سننهما عن ابي هريرة؛ مشكاة المصابيح: (٣٥٦/٢)، حديث رقم: ٣٨٢٨، وقال المحقق: في اسناده: صحيح.

[6] في صحيح البخاري عن ابي عبس؛ مشكاة المصابيح: (٣٤٩/٢) ورقمه ٣٧٩٤.

**دیسان دەفەرمێ:** ((لا يجتمع الكافر وقاتله في النار ابـــداً: **هەرگیز بێبڕواو بکوژەکەی لەدۆزەخدا کۆنابنەوە)).**[7]

**هەروەها داڵدە خوازتن لەخودا مایەی پارێزراو بونە لەئاگری دۆزەخ:**

﴿وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا اصْرِفْ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَ إِنَّ عَذَابَهَا كَـــانَ غَرَامًــا، إِنَّـــهَا سَــاءَتْ مُسْـتَقَرًّا وَمُقَامًـــا: **ئەوانەی دەڵێن؛ ئەی پەروەردگاری ئێمە: ئەشکەنجەی دۆزەخمان لێلادە، چونکە ئەشکەنجەکەی سەخت و بەردەوامە بەراستی دۆزەخ جێ و شوێنێکی خراپە**﴾الفرقان:٦٥-٦٦.

**پێغەمبەرﷺیش دەفەرمێ:** ((ما سأل احد الله الجنة ثلاثا، إلا قالت الجنة؛ اللـــهم أدخلـــه الجنة، ولا استجار رجل مسلم الله من النار ثلاثا، إلا قالت النار؛ اللهم أجره مـــني: **هەر کەسێك سێ جاران داوای بەهەشت لەخوا بکا، بەهەشت دەڵێ؛ خودایە بیبەیە بەهەشت، هەر پیاوێکی موسڵمانیش سێ جاران لەخوا بپاڕێتەوە لەدۆزەخی رزگار بکا، دۆزەخ دەڵێ: خودایە لەمنی بپارێزە)).**[8]

**هەروەها لەهەردو صەحیحاندا لە ئەبو هورەیرەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ لە باسی ئەو فریشتانەی لەدوای کۆڕەکانی زیکر دەگەڕێن فەرمویەتی:**

((ان اللهﷻ يسألهم وهو أعلم بهم، فيقول فمم يتعوذون؟ فيقولون؛ من النار، فيقـــول؛ وهـــل رأوها؟ فيقولون؛ لا والله يا رب ما رأوها، فيقول؛ كيف لو رأوها؟ فيقولون؛ لو رأوها كانوا أشـــدّ منها فرارا، وأشدّ مخافة، فيقول فأشهدكم أني قد غفرت لهم: **خودای بەرزو بەدەسەڵات لەگەڵ ئەوەی کە بەخۆی ئاگاترە، لێیان دەپرسیو دەفەرمێ: ئەوان خۆ لەچی پەنادەگرن؟ دەڵێن: لەئاگری دۆزەخ، دەفەرمێ: بۆ دۆزەخییان دیوە؟ دەڵێن: نەخێر خودای پەروەردگار نەیاندیتیە، دەفەرمێ: ئەدی ئەگەر بیبینن چۆنە؟ دەڵێن: ئەگەر بیاندیتبا توندتر لەبەری هەڵدەهاتن و زیاتر دەترسان، دەفەرمێ؛ ئێوە دەکەمە شاهێد من وا لێیان خۆش بوم)).**[9]

---

[7] في صحيح مسلم عن ابي هريرة؛ مشكاة المصابيح: (٣٤٩/٢) ورقمه: ٣٧٩٥.

[8] في مسند احمد وسنن ابن ماجه وصحيح ابن حبان ومستدرك الحاكم باسناد صحيح عن انس: صحيح الجامع: (١٤٥/٥) ورقمه ٥٥٠٦.

[9] صحيح الجامع: (٢٣٣/٢) ورقمه ٢١٦٩، وعزاه الى البخاري ومسلم واحمد.

# دەروازەی دووەم

# بەهەشت

**ڕێخۆشکردن : پێناس و ڕونکردنەوە**

بەهەشت پاداشت و ڕێزانەی هەرە مەزنە، خودا بۆ دۆست و تاعەتکارانی خۆی ئامادە کردوە، بەهرەیەکی تەواوەو چ کەموکورتی تێدا نیە، هێند بێگەردە چ پەڵەو ماکی پێوە نیە، ئەوی خودا لەبارەی بەهەشتێ باسی بۆ فەرموین و، پێغەمبەرەکەی ﷺ پێی ڕاگەیاندوین، عەقڵان دەتاسێنن وسەران گێژ دەکەن، چونکە عەقڵ دەستەوسانەو ناتوانێ پەی بەو بەهرە مەزنە بباو وە خۆی بگرێ.

. دەفەرمو گوێ بدە ئەم فەرمودە قودسیەی خوای بەرز و کاربەجێ:

((أعددت لعبادي الصالحين مالا عين رأت ولا أذن سمعت ولا خطـر علـى قلـب بشـر: بەهەشتێکی وام بۆ بەندە صاڵحەکانی خۆم سازداوە، نە چاوێك دیتیتیو، نە گوێیەك بیستیتی و، نەبەدڵی مرۆڤێکدا ڕەت بوە)).

پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((اقرأوا ان شئتم :﴿ فَلاَ تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا أُخْفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ﴾السجدة:١٧ : گەر حەز دەکەن ئەم ئایەتە بخوێننەوە: -ماناکەی- هیچ کەس نازانێ چی بۆ حەشاردراوە (لەنازونیعمەتی جۆراوجۆر) کە چاوان پێی ڕۆشن دەبنەوە)).[1]

---

[1] رواه البخاري في صحيحه عن ابي هريرة في كتاب: بدء الخلق، باب: ما جاء في صفة النار؛ فتح البـاري: (٣١٨/٦) ورقم الحديث: ٣٢٤٤.

مەزنێتی بەهرەی بەهەشتێ ئەوکاتە وەدیار دەکەوێ کە بەخۆشی دنیا بەراورد کرا، چونکە خۆشی دنیا لەچاو خۆشی بەهەشتێ گەلێك هیچ و بێبەهایە هیچ شتێ ناهێنێ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ:

((موضع سوط في الجنة خير من الدنيا وما فيها: جێی قامچیەك لەبەهەشتێ چاترە لەدنیا و هەمو ئەو شتانەی تێیدان))[1].

بۆیەشە لەحوکم و خەملاندنی خوا چونە بەهەشت و رزگاربون لەدۆزەخ، سەرکەوتن و بەرکەوتن ودەربازبونی هەرەمەزنە، خوای بەرز دەفەرمێ:

﴿فَمَنْ زُحْزِحَ عَنْ النَّارِ وَأُدْخِلَ الْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ: هەر کەسێکی لەدۆزەخ وەلانراو بردرا بەهەشتێ، سەرکەوتوە﴾آل عمران:١٨٥

هەروەها دەفەرمێ ﴿وَعَدَ اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ وَرِضْوَانٌ مِنْ اللَّهِ أَكْبَرُ ذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ: خودا بەڵێنی باخگەلێکی بەهەشتی بەپیاوان و ژنانی بڕوادار داوە کە چۆمە ئاوی بەخوڕ بەبن دارەکانیدا رەت دەبن، بۆ هەمیشە لەوێدا دەمێننەوەو نشینگەی چاکی و خۆشی لەبەهەشتی عەدەن پێداون، لەگەڵ رەزامەندی خوداش کەلە هەمو ئەوانە باشترو گەورەترە. سەرکەوتنی هەرەمەزنیش هەر ئەوەیە﴾التوبة:٧٢.

وە دەفەرمێ: ﴿وَمَنْ يُطِعْ اللَّهَ وَرَسُولَهُ يُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ: هەر کەسێکی تاعەتی خواو پێغەمبەرکەی بکا، خودا دەیباتە باخانی بەهەشت کە روبارگەلێکیان بەبندا رەت دەبێ، ئەوەش سەرکەوتنی هەرە مەزنە﴾النساء:١٣.

---

[1] في صحيح البخاري عن سهل بن سعد الساعدي؛ فتح الباري: (٣١٩/٦) والنووي على مسلم: (١٦٦/١٧).

## بەندی یەکەم

## چون بۆ بەهەشت

گومـان لـەوەی دا نیـە چ ئاسـودەبونێك ناگاتـە ئاسـودەیی بـرواداران لـەو كاتـەی بەوپـەڕی ڕێزو شكۆوە پۆل پۆل بۆ بەهەشتی وەڕێ دەخرێن، جا كـە دەگەنـە جـێ دەروازەكانیان بۆ ئاوەلا دەكرێ‌و، فریشتە بەڕێزەكان پێشوازی‌و بەخێرهاتنیان دەكەن و پیرۆزباییـان لێ دەكـەن كـە بەسـەلامەتی گەیشـتنە جـێ، پـاش ئـەو ناخۆشـییانەی چەشتیان و ئەو نارەحەتی وپەرژەنگانەی دیتیان:

﴿وَسِيقَ الَّذِينَ اتَّقَوْا رَبَّهُمْ إِلَى الْجَنَّةِ زُمَرًا حَتَّى إِذَا جَاءُوهَا وَفُتِحَتْ أَبْوَابُهَا وَقَـالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا سَلَامٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُـمْ فَادْخُلُوهَـا خَـالِدِينَ: ئەو كەسانەی پارێزكاربون و لەپـەروەردگاریان ترسـاون پـۆل پـۆل دەبردرێنـە بەهەشـت. كاتـێ دەگەنـە ئـەوێ و دەرگەكانی بەهەشـتیان بۆ ئاوەلا دەكـرێ و دەروازەوانـەكان پێیـان دەڵێـن: سـلاوتان لێبی، كردەو گۆتەو باوەڕتـان پـاك بـو، بـوە مایـەی پـاكی دەرونتـان وبێگـەردی دڵتـان، بۆیە شایستەی بەهەشت بون، دە بڕۆنە نێوی ویەكجاری تێیدا بمێننەوە﴾الزمر: ٧٣

## جێباسی یەكەم

## تكاكاری بۆ چونە بەهەشتێ

لەفەرمودە صەحیحـەكاندا هـاتوە، كاتێك هەڵوەسـتەی بـرواداران لـەڕۆژی دواییـدا درێـژە دەكێشـێ، داوا لەپێغەمبـەران دەكـەن تكـای كردنـەوەی دەرگـەی بەهەشـتیان بـۆ بكەن، بەلام كەسیان كارەكە ناكەن و هەریەكە دەڵێ: ئەمە كاری من نیە، تا مەسـەلەكە دەگاتە موحەممەدی پێغەمبەری پایـەدارمانﷺ، جا تكاكـە دەكـاو لێـی قبـوڵ دەكـرێ. هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ:

((يجمع الله تبارك وتعالى الناس، فيقوم المؤمنون، حتى تزلف لهم الجنة، فيأتون آدم فيقولون: يـا أبانا، استفتح لنا الجنة، فيقول: وهل أخرجكم من الجنة إلا خطيئـة أبيكـم، لسـت بصـاحب ذلـك...: خوداى بـەرزو پـيرۆز خـەڵكى كۆدەكاتـەوە، جـا بـڕواداران هەڵدەسـتن، تـا بەهەشتيان لێ وەنێزێك دەكەوێ. ئەوجا دەچنـە لاى ئادەم و دەڵێن: هۆ باوكە، داواى كردنـەوەى بەهەشـتمان بۆ بكـە، دەڵـێ: بۆ لـە هەڵـەى بابتـان بـترازێ چـى دى ئێـوەى لەبەهەشتێ وەدەر نا، ئەمە ئيشى من نيە،...)).[1]

ئەوجا هەر لەو فەرمودەيەدا باسى ئەوە هاتوە كە هـەر پێغەمبـەرێك كارەكە لـەخۆ دور دەخاتەوە وپێى ناكرێ، تا دەچنە لاى موحەمەد ﷺ و مۆڵەتيان دەدرێ.

## جێباسى دوەم

## مشتومالْ و پالْفتەكردنى بڕواداران بەر لەچونيان بۆ بەهەشت

پاش ئەوەى بڕواداران لەسيراتێ دەپەڕنەوە، لـەنێوان بەهەشـت و دۆزەخدا لەسـەر پردێك رادەگيرێن، پاشان مشتومالْو پالاْوتە دەكرێن، بەوەى ئەگەر لەدنيادا شتێكيان لەنێواندا هەبێ تۆڵەيان لێكدى دەكرێتەوە، تاكو كە دەچنە بەهەشتێ بەپاكىو چاكى بچن وكەس چى لەسەر ئەوى دى نەمينێو كەس داواى شتێك لەوى دى نەكا.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ: ((يخلص المؤمنون من النار، فيحبسون على قنطرة بين الجنة والنـار، فيقص لبعضهم من بعض مظالم كانت بينهم في الدنيا، حتى إذا هُذّبوا ونقوا أذن لهـم في دخـول الجنة، فوالذي نفس محمد بيده لأحدهم أهدى بمنزله في الجنة منه بمنزله كان في الدنيـا: بـڕواداران لـەدۆزەخ دەربـاز دەكرێـن، ئـەوجا لەسـەر پردێكـى نێـوان بەهەشـت و دۆزەخ بـەند دەكرێن. تا تۆڵەى ئەو زوڵمانـەيان بۆ لەيـەكتر بكرێتـەوە كە لـەدنيا كردويانـە، جا كە

[1] في صحيح مسلم عن حذيفة بن اليمان وابي هريرة؛ رواه مسلم في كتاب الإيمان، باب ادنى اهل الجنة منزلـة: (١٨٦/٤) ورقمه: ١٩٥.

مشتومالّ دران وپالفتەکران مۆڵەتی چونە بەهەشتیان دەدریێ، جا سوێند بەو خودایەی گیانی موحەممەدی بەدەستە هەریەکەیان لەماڵەکەی بەهەشتی شارەزاترە و چاکتری دەناسێتەوە لەو ماڵەی لەدنیا هەیبو))[1].

پێشتریش لەفەرمودەکانی (تکاکاری) و (قیامەت)دا ئەوەمان باسکرد کە پێغەمبەری ئێمە ﷺ یەکەم کەسە داوای کردنەوەی دەرگەی بەهەشت دەکا، پاش ئەوەی ئادەمی باوکی مرۆڤ و پێغەمبەرە خاوەن عەزمەکان خۆ لەو ئەرکە گرنگە نادەن.

## جێباسی سێیەم

## یەکەمینەکان لەچونە بەهەشت

یەکەم مرۆڤ کە پێش هەر هەمو مرۆڤان دەچێتە بەهەشت پێغەمبەری پایەدارمان موحەممەدە ﷺ ، یەکەم ئوممەتیش ئوممەتەکەی ویەو، یەکەم کەسیش لەم ئوممەتە بچێتە بەهەشت ئەبو بەکری صیدیقە (رەزای خوای لێبێ).

ئیبنی کەثیر ئەو فەرمودانەی هاوردون کەلەم بارەیەن[2]، هەروەك موسلیم لەصەحیحەکەیدا لەئەنەس دەگێڕێتەوە، دەڵێ پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((انا اول من يقرع باب الجنة: من یەکەمین کەسم لەدەرگای بەهەشت دەدەم)).

دیسان موسلیم لەئەنەسەوە دەگێڕێتەوە ، دەڵی: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((آتي باب الجنة يوم القيامة فأستفتح فيقول الخازن: من أنت؟ فأقول: محمد، فيقول: بك أمرت أن لا أفتح لأحد قبلك: دێمە بەر دەروازەی بەهەشتێ و داوادەکەم بیکەنەوە، دەروازەوان دەڵێ: تۆ کێی؟ دەڵێم : من موحەممەدم، دەڵێ : فەرمانم بە تۆ پێکراوە پێش تۆ لەکەس نەکەمەوە)).

---

[1] روى البخاري في صحيحه عن ابي سعيد الخدري: صحيح البخاري، كتاب الرقاق، باب القصاص يوم القيامة؛ فتح الباري: (١١/٣٩٥).

[2] النهاية لابن كثير: ٢/٢١٣

هەروەها دەفەرمێ: ((نحن الآخرون الأولون يوم القيامة، نحن اول الناس دخولا الجنة: ئێمە کە دوایین ئوممەتین یەکەمینین لە ڕۆژی قیامەتیدا، ئێمە یەکەمینی خەڵکین لەچونە بەهەشت))[1].

وە دەفەرمێ[2]: ((أتاني جبريل، فأراني باب الجنة الذي تدخل منه امتي: جبریل هاتە لام و، ئەو دەروازەی بەهەشتی نیشاندام کە ئوممەتەکەمی پێدا دەچنە ژور))، جا ئەبوبکر گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! حەزم دەکرد منیش لەگەڵتابام تا تەماشام کردبا، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((اما انك يا ابابكر اول من يدخل الجنة من امتي: هەرچی تۆی ئەبو بەکر، یەکەم کەسی لەئوممەتی من دەچیتە بەهەشت)).

## جێباسی چارەم

### ئەوانەی بێ لێپرسینەوە دەچنە بەهەشت

یەکەم پێڕ لەم ئەممەتە کە دەچنە بەهەشتێ ترۆپکی هەرە باڵای باوەڕو خۆپارێزیو کردەوەی چاك و سەقامگیربونن لەسەر دینی خودا، پێکڕا یەك پۆل دەچنە بەهەشتێ، ئەوی سەرەتایان وەژوڕناکەوێ تا دوامینیان دەگا، هێند جوانن، دەڵێی مانگی تابانن.

ئەبو هورەیرە دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرموی: ((أول زمرة تلج الجنة صورهم على صورة القمر ليلة البدر، لا يبصقون فيها، ولا يمتخطون، ولا يتغوطون، آنيتهم فيها الذهب، أمشاطهم من الذهب والفضة، ومجامرهم الألوة، ورشحهم المسك، ولكل واحد منهم زوجتان يرى مخ سوقهما من وراء اللحم من الحسن، لا اختلاف بينهم ولا تباغض، قلوبهم قلب رجل واحد، يسبحون الله بكرة وعشيا: یەکەم پێڕ لەبەهەشت دەچنە ژور وێنەیان وەك مانگی تابانە، نەتفی تێدەکەن ونەچڵمی تێدا دەسڕن و، نە دەچنە سەر پێشاوێ، لەوێ دەفرەکانیان

---

[1] في الصحيحين وسنن النسائي عن ابي هريرة
[2] في سنن ابي داود عن ابي هريرة

زێڕە، شانەکانیان زێڕو زیوە، عودی هیندی لەبخوردانیان دەسوتێ و ئارەقەیان میسکەو. هەریەکەیان دو ژنی هەنە لەجوانیان لەپشت گۆشتی مۆخی ئێسکانیان دیارە، نە جیاواران لەنێوەخودا، نە کینە لێکدی هەڵدەگرن، دڵانیان دڵی یەك پیاوە، بەسبەینان و ئێواران بەردەوام پاکی خوا دەکەن))[1].

لەسەهلی کوڕی سەعدەوە(ڕەزای‌خوای لێبێ) هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((لیدخلن الجنة من أمتي سبعون ألفا أو سبعمائة ألف لا يدخل أولهم حتى يدخل آخرهم وجوههم على صورة القمر ليلة البدر: هەفتا هەزار یا هەفسەد هەزار لەئوممەتی من دەچنە بەهەشتێ یەکەمینیان ناچێتە ژور هەتا دوامینیان دەگا، ڕویان بەوێنەی مانگی چاردەیە))[2].

بەدروستیش هاتوە، کە خودای مەزن لەگەڵ هەریەك لەو هەفتا هەزارەی هەفتا هەزاری دیکەی بە پێغەمبەر ﷺ بەخشیوە، هەروەك لەموسنەدی ئەحمەد بەسەنەدیکی صەحیح هاتوە، لە ئەبو بەکر (ڕەزای خوای لێبێ) کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((اعطيت سبعين الفا من امتي يدخلون الجنة بغير حساب، وجوههم كالقمر ليلة البدر، قلوبهم على قلب رجل واحد، فأستزدت ربي ﷻ فزادني مع كل واحد سبعين الفاً: هەفتا هەزارم لەئوممەتی خۆم پێ‌بەخشرا کە بێ‌لێپرسینەوە دەچنە بەهەشتێ، ڕوەکانیان هەروەکو مانگی تابانە، دڵەکانیان وەك دڵی تاکە پیاوێکە، جا ئەمن داوای زێترم لەپەروەردگاری خۆم کرد، جا لەگەڵ هەریەکە لەوانە هەفتا هەزاری زێدەکرد))[3]، هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ: ((وعدني ربي أن يدخل الجنة من امتي سبعين الفا بلا حساب عليهم ولا عذاب، مع كل الف سبعون، وثلاث حثيات من حثيات ربي: پەروەردگارم بەڵێنی دامێ هەفتا هەزار لە ئوممەتم بەبێ‌پرسینەوەو ئازار بەرێ دەکرێن بۆ بەهەشتێ، لەتەك هەر هەزاری هەفتا، لەگەڵ سێ گۆڵمان لەگۆڵمی پەروەردگارم))[4]، جا لێرەدا

---

[1] رواه البخاري في صحيحه، كتاب بدء الخلق، باب ما جاء في صفة الجنة؛ فتح الباري: (٣١٨/٦) ورواه مسلم والترمذي وغيرهما.

[2] هەمان سەرچاوە؛ فتح الباري: (٣١٩/٦).

[3] صحيح الجامع: (٣٥٠/١) رقمه ١٠٦٨.

[4] في مسند احمد وسنن الترمذي وصحيح ابن حبان عن ابي امامة باسناد صحيح؛ صحيح الجامع: (١٠٨/٦) ورقمه ٦٩٨٨.

باسیزێدەبونی سێ گوڵمانی فەرموە.

پێغەمبەری پایەدارمان ﷺ باسی ئەو هەفتا هەزاری یەکەمینەی بۆ کردوین ونیشانەکانی ڕون کردونەوە، ئیبنی عەبباس دەڵێ : پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((عرضت علي الأمم، فأخذ النبي يمر معه الأمة، والنبي يمر معه النفر، والنبي يمر معه العشرة، والنبي يمر معه الخمسة، والنبي يمر وحده، فنظرت فإذا سواد كثير، قلت: يا جبريل! هؤلاء أمتي؟ قال: لا ولكن انظر إلى الأفق، فنظرت فإذا سواد كثير، قال: هؤلاء أمتك، وهؤلاء سبعون ألفا قدامهم لا حساب عليهم ولا عذاب، قلت: ولم؟ قال: كانوا لا يكتوون ولا يسترقون ولا يتطيرون وعلى ربهم يتوكلون: ئوممەتەکانم پێ نیشان دران، پێغەمبەر هەبو بەخۆ بە ئوممەتێك تێپەڕ دەبو، پێغەمبەر هەبو کە ڕەت دەبو چەند کەسێکی لەگەڵدا بو، پێغەمبەری وا هەبو هەر دە کەسی لەگەڵدا دەبو، پێغەمبەری وا هەبو پێنج، هی واش هەبو هەر بەتەنێ تێدەپەڕی، تەماشام کرد ڕەشاییەکی گەورەم دی، گوتم : جبریل ، ئەوانە ئوممەتی منن؟ گوتی: نەخێر، بەڵام تەماشای ئاسۆ کە، کە تێڕامام ڕەشاییەکی مەزنم دی، گوتی: ئەوانە ئوممەتی تۆن، ئەوانیش هەفتا هەزارن پێش کەوتون نە لێپرسینەوەیان هەیە نە ئەشکەنجە. گوتم: لەبەرچی؟ گوتی: ئەوانەی بۆ چارەسەری نەخۆشی شوێنە نەخۆشەکە داغ نەدەکرد و، داوای نوشتەیان نەدەکرد و، ڕەشبینییان نەدەکرد و، پشتیان بەپەروەردگاری خۆیان دەبەست)).

جا عوکاشەی کوڕی موحصەن هەستاوەو گوتی: نزام بۆ لەخودا بکە تا ڕەگەل ئەوانم بدەی، فەرموی ((اللهم اجعله منهم: خوایە ڕەگەڵ ئەوانی دەی))، پیاوێکی دیکەش هەستاوەو گوتی: داوا لەخوا بکە تامنیش بەگەڵ ئەوان دا. فەرموی: ((سبقك بها عكاشة: عوکاشە وەپێشت کەوت)) [1].

ڕەنگە هەر ئەوانیش بن خوا بەهەرەنێزیکانی ناو بردون، ئەوانشن وەپێش کەوتون:

﴿وَالسَّابِقُونَ السَّابِقُونَ، أُولَئِكَ الْمُقَرَّبُونَ، فِي جَنَّاتِ النَّعِيمِ: دەستەیەکیش لە پێشەوەن، وەپێش کەوتون، ئەوانە لە ئێمەوە نزیك کەوتون، لە باغاتی پڕ لە خۆشیدا

---

[1] صحيح البخاري، كتاب الرقاق، باب يدخل الجنة سبعون الفاً بغير حساب، فتح الباري: (١١/٤٠٥).

دەژین﴾الواقعة:١٠-١٢.

**وە ئەوانەش دەستەیەکی یەکەمینان و کەمێکن لەوانی دواییین:**

﴿ثُلَّةٌ مِنْ الأَوَّلِينَ، وَقَلِيلٌ مِنْ الآخِرِينَ: **بەشێك لەوانی پێشینە، کەمێکیش لەوانی پاشین**﴾ الواقعة:١٣-١٤.

## جێباسی پێنجەم

### هەژاران بۆ بەهەشتی بە پێش دەوڵەمەندان دەکەون

**پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ:** ((إن فقراء المهاجرين يسبقون الأغنياء يوم القيامة الى الجنة بأربعين خريفاً: **لەڕۆژی قیامەتدا هەژارانی کۆچەرەکان بۆ بەهەشتی چل پایزان بەپێش دەوڵەمەندەکان دەکەون**))[1].

**هەروەها دەفەرمێ:** ((فقراء المهاجرين يدخلون الجنة قبل أغنيائهم بخمسمائة عام: **هەژارانی کۆچەرەکان پێنجسەد ساڵ پێش دەوڵەمەندانیان دەچنە بەهەشت**))[2].

**پێغەمبەر ﷺ لەشوێنێکی دیکەدا ڕونی کردۆتەوە کە ئەوانە هیچیان نەبو تا لەسەری توشی لێپرسینەوە بێن، ئەمەش لەگەڵ جیهادو کردو کۆشش و چاکەکاریاندا، حاکیم لەموستەدرەکەکەیدا لەعەبدوڵڵای کوڕی عەمری هێناوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:**

((أتعلم أول زمرة تدخل الجنة من امتي؟: **ئەزانی یەکەمین پێڕ کێن لەئوممەتی من کە دەچنە بەهەشت؟)) گوتم: خواو پێغەمبەری زاناترن، فەرموی:**

((فقراء المهاجرين، يأتون يوم القيامة الى باب الجنة، ويستفتحون، فيقول لهم الخزنة؛ أوقد حوسبتم؟ فيقولون؛ بأي شيء نحاسب؟، وانما كانت اسيافنا على عواتقنا في سبيل الله حتى متنا

---

[1] رواه مسلم في صحيحه عن عبدالله بن عمرو؛ مشكاة المصابيح: (٢/٦٦٣) ورقمه ٥٢٣٥.

[2] رواه الترمذي عن ابي سعيد، والترمذي واحمد وابن حبان عن ابي هريرة؛ صحيح الجامع: (٤/٩٠) ورقمه ٤١٤٠.

على ذلك؟ قال؛ فيفتح لهم، فيقيلون فيه اربعين عاما قبل أن يدخلها الناس: هەژارانی کۆچەرانن، لەرۆژی قیامەتێدا دێنە بەر دەروازەی بەهەشت و، داوای والاکردنی دەکەن، دەروازەوانان پێیان دەڵێن؛ ئایا لێپرسینەوەتان لەگەڵدا کرا؟ دەڵێن؛ لەچیمان بپرسرێتەوە، شمشێرەکانمان هەمیشە لەپێناو خوا لەسەر مل بو، هەر لەسەر ئەو حاڵەش مردین؟ فەرموی؛ جا بۆیان ئاوەلا دەکرێ‌و، چل ساڵان سەرخەوی تێدا دەکەن پێش ئەوەی خەڵکی تێ بچێ)) [1].

لەئوسامەی زەید هاتوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((قمت على باب الجنة فكان عامة من دخلها المساكين، وأصحاب الجد محبوسون غير ان اصحاب النار قد امر بهم الى النار: لەبەر دەروازەی بەهەشت راوەستام، زۆربەی ئەوانەی چونە ناوی هەژاران بون، موسڵمانە دەوڵەمەندەکانیش بەندکرابون، بەلام یاوەرانی دۆزەخ بۆ دۆزەخ بەڕێ کرابون)) [2]

لەفەرمودەکانی پێشو؛ لەیەکێکیاندا هاتوە کە هەژاران چل پایز بەپێش دەوڵەمەندان دەکەون، لەفەرمودەکەی دیکەدا بە پێنجەسەد ساڵان هاتوە، ڕوی کۆك کردنی هەردو فەرمودان ئەوەیە کە هەژاران هەریەك حاڵیان جودایە، دەوڵەمەندەکانیش هەروان، ئەمەش بەقەولی قورطوبی [3]، چونکە هەژاران لەهێزی بڕواو پێشکەوتنیان لێکدی جودان، دەوڵەمەندانیش هەر ئاوان، جا ئەگەر لێکدانەوەکە بەگوێرەی یەکەم هەژار بێ لەبەهەشت وەژور دەکەوێ لەگەڵ دوایین دەوڵەمەندی کەتێی دەچێ، ماوەکە پێنجسەد ساڵ دەبێ، بەلام ئەگەر چاو بدەینە دوایین هەژار کە دەچێتێ بۆ بەهەشتێ لەگەڵ یەکەمین دەوڵەمەندێکی بۆی دەچێ، ماوەکە دەبێتە چل پایز، لەچاو یەکەمی هەژاران و دواییني دەوڵەمەندان، خوداش زاناترە [4].

---

[1] انظر سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٥٣٢/٢)، ورقمه: ٨٥٣، وقد قال الشيخ ناصر فيه: اخرجه الحاكم؛ وقال: صحيح على شرط الشيخين، و وافقه الذهبي، اقول(الشيخ ناصر): انما هو على شرط مسلم فقط.

[2] صحيح البخاري، كتاب الرقاق، باب صفة الجنة والنار، فتح الباري: (٣٤٥/٢).

[3] التذكرة للقرطبي: ص٤٧٠.

[4] النهاية لأبن كثير: (٣٤٥/٢).

## جێباسی شەشەم

## یەکەم سێ کەسی دەچنە بەهەشتێ

لەئەبو هورەیرە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((عرض علي اول ثلاثة يدخلون الجنة؛ شهيد، وعفيف متعفف، وعبد احسن عبادة الله ونصح مواليه: یەکەمین سێ کەسم پیشاندران کە دەچنە بەهەشتێ؛ شەهید و، هەمو داوێن پاکێك کە داوێنی خۆی پاك رادەگرێ، لەگەڵ بەندەیەکی بەچاکی خودای پەرستوەو، ئامۆژگاری بەردەستانی خۆی کردوە))[١].

---

[١] رواه الترمذي باسناد حسن عن ابي هريرة؛ جامع الأصول: (١٠/٥٣٥)، وعزاه محقق الجامع الى احمد في مسنده، والحاكم في مستدركه، والبيهقي في السنن.

## جێباسی هەفتەم

## چونە بەهەشتی بڕوادارە گوناهبارەکان

### خوازگەی یەکەم

### لەدۆزەخ دەرهێنانیان و بۆ بەهەشت بردنیان بەهۆی تکاکاری

**موسلیم لەصەحیحەکەیدا لەئەبو سەعید دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:**

((أما أهل النار الذين هم أهلها، فإنهم لا يموتون فيها ولا يحيون، ولكن ناس أصابتهم نار بذنوبهم (أو قال بخطاياهم) فأماتهم إماتة، حتى إذا كانوا فحما، أذن بالشفاعة، فجيء بهم ضبائر ضبائر، فبثوا على أنهار الجنة، ثم قيل؛ يا أهل الجنة أفيضوا عليهم، فينبتون نبات الحبة تكون في حميل السيل: **هەرچی دۆزەخنشینی وان کە هەر بۆ دۆزەخ شایستەن، نە تێیدا دەمرن نەدەژین، بەڵام خەڵکانێك کە لەبەر گوناهیان دۆزەخ دایگرتون، جا مردنێك مرداندونی هەتا کردونی بەڕەژو، ئیزنی تکاکاری دەدرێ، کۆمەڵ کۆمەڵ دەهێنرێن و، بەسەر روبارەکانی بەهەشتێ وەردەکرێن، ئەوجا دەگوترێ: هۆ خەڵکی بەهەشت بەهرەیان پێ بگەیەنن. ئینجا وەکو دانی بەراوێ چەکەرە دەکەن))**[1].

**فەرمودەیەکیش لەلای موسلیم هەیە کە جابیری عەبدوڵڵا بۆ پێغەمبەر ﷺ بەرزی دەکاتەوە:**

((ان قوما يخرجون من النار يحترقون فيها، الا دارات وجوههم، حتى يدخلون الجنة: **کۆمەڵێك هەن تەواو لەناو ئاگر دەسوتێن، لەرۆخی ڕویان بترازێ، تا لەدۆزەخ دەردەهێنرێن، ئەوجا بەرەو بەهەشت دەبرێن))**[2].

---

1. رواه مسلم، كتاب الإيمان، باب اثبات الشفاعة واخراج الموحدين من النار، (١٧٢/١).
2. رواه مسلم. كتاب الإيمان، باب ادنى اهل الجنة مترلة، (١٧٨/١).

ئەو کەسانەش کە لەدۆزەخ دەرداوێژرێن و بۆ بەهەشت دەبردرێن، خەڵکی بەهەشت پێیان دەڵێن دۆزەخییەکان، هەروەك لەعیمرانی حوصەینەوە(رەزای خوایان لێبێ) هاتوە کەپێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((يخرج قوم من النار بشفاعة محمدﷺ،فيدخلون الجنة يسمون الجهنميين: کۆمەڵێك هەن بە تکاکاری موحەممەد ﷺ لەدۆزەخی دەردەهێنرێن، ئەوجا دەچن بۆ بەهەشت و بەدۆزەخییەکان ناودەبرێن))[1].

دیسان لەجابیر (رەزای خوای لێبێ) کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ:

((يخرج من النار بالشفاعة كأنهم الثعارير، قلت: وما الثعارير؟ قال: الضغابيس: بەتکاکاری لەبەهەشت دێنە دەرو دەڵێی وردە ترۆزین واتە هێندە وردیلەو سپیلکەن))[2].

ئەنەسی مالکیش دەڵێ : پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((يخرج قوم من النار بعدما مسهم منها سفع، فيدخلون الجنة، فيسميهم اهل الجنة؛ الجهنميين: خەڵکێك لەدۆزەخ دەردەچن پاش ئەوەی ئاگر داخی کردون، ئەوجا دەچن بۆ بەهەشتێو خەڵکی بەهەشت ناویان دەنێن: دۆزەخییەکان))[3].

لەفەرمودە درێژەکەی ئەبوهورەیرەش کەباسی دواییێ دەکا، وا هاتوە: ((حتى إذا فرغ الله من القضاء بين العباد، وأراد أن يخرج برحمته من أراد من أهل النار، أمر الملائكة أن يخرجوا من النار من كان لا يشرك بالله شيئا، ممن أراد الله تعالى أن يرحمه، ممن يقول: لا إله إلا الله، فيعرفونهم في النار، يعرفونهم بأثر السجود، تأكل النار من ابن آدم إلا أثر السجود، حرم الله على النار أن تأكل أثر السجود، فيخرجون من النار وقد امتحشوا، فيصب عليهم ماء الحياة، فينبتون منه، كما تنبت الحبة في حميل السيل: جا کە خودا لەداوەری نێوان بەندەکانی بۆوەو، ویستی هەرکەسی بەمیهری خۆی ویستی لێبو لەنێو دۆزەخیان دەرێنی، فەرمان دەداتە فریشتان، هەمو ئەوانە بێننە دەر کە هاوبەشیان بۆ خودا بڕیار نەداوە،

---

[1] صحيح البخاري، كتاب الرقاق، باب صفة الجنة والنار، فتح الباري: (٤١٨/١١) وهم ذكر في حديث جابر عند مسلم: (١٧٩/١).

[2] رواه البخاري، كتاب الرقاق، باب صفة الجنة والنار، فتح الباري: (٤١٦/١١).

[3] رواه البخاري، كتاب الرقاق، باب صفة الجنة والنار، فتح الباري: (٤١٦/١١).

لەوانەی خوا ویستی وایە کە بەزەییان پێ ببەخشێ، لەوان کەسانی کە دەڵێن: لا الــه الا الله، لـەدۆزەخدا فریشـتەکان ئـەو جـۆرە خەڵکـە دەناسـنەوە، بەشـونی سـوژدان دەیانناسنەوە، ئاگر هـەموی ئادەمیزاد هەڵدەلوشێ بێجگە لـە جێو شونی سـوژدان، خودا لەدۆزەخی حەرام کردوە کە شوێنی سوژدان لرف کا، ئەوجا ئەوکاتە بەسوتاوی لەنێو دۆزەخ دەردەهێنرێن ئاوی ژینیان پێدا دەکرێ و پێی دەڕوێن، وەك ئەو دانەی لەبەراوێ دەڕوێ))[1].

لەزیاتر لەفەرمودەیەك واهاتوە هەر کەسێکی بە بارستایی دینارێك یا نیو دینار یا بارتەقای گەردیلەیەك بڕوای لەدڵیدا هەبێ، خوا لـەدۆزەخی دەردێنـێ، تەنانـەت جۆرە کەسـانێك دەردەهێنــێ هــەرگیز خـێرو چاکەیـەکیان نـەکردوە.. لەفـەرمودەی ئـەبو سەعیدی خودریدا هاتوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((یدخل الله اهل الجنة الجنة، یدخل من یشاء برحمته، ویدخل اهل النـــار النـــار، ثم یقـــول: (انظروا من وجدتم في قلبه مثقال حبة من خـــــردل مـــن ایمـــان فـــأخرجوه..): خـودای بـەرز بەهەشتییان دەباتـە بەهەشـت، هـەر کەسێکی ویستی لێبی بەمیهری خـۆی بـۆ وێـی دەبا، دۆزەخییانیش دەنێرتە دۆزەخ، جا دەفەرمێ (سەیرکەن کێ بەبارتـەقای دەنکێك خەردەل بڕوای لەنێو دڵی دایە، دەری بێنن..) ))[2].

لەفەرمودەی جابیری کوڕی عەبدوڵلاش لەبارەی چونە دۆزەخی واهاتوە:

((ثم تحل الشفاعة، ویشفعون حتى یخرج من النار من قال لا إله إلا الله وکان في قلبه من الخـــیر مثقال شعیرة، فیجعلون بفناء الجنة، ویجعل أهل الجنة یرشون علیهم الماء، حتى ینبتوا نبات الشـــيء في حمیل السیل، ویذهب حراقه، ثم یسأل له حتى یجعل له الدنیا وعشرة أمثالهـــا معـــها: پاشـان شەفاعەت ڕێدەدەرێ، تکاکار هێند تکا دەکەن، تا هەر کەسێکی گوتبی: لا الـه الا الله و بە بارتەقای دەنکە جۆیـەك چاکـەی لـەدڵیدا هـەبێ، لـەدۆزەخی دێتە دەرێ، جا لـەنێو حەوشـی بەهەشـت دادەنرێـن ، خـەڵکی بەهەشـت ورد ورد ئاوپرژێنیـان دەکـەن، هـەتا وەك شـتی بـەراوێ دەڕوێـن و چەکـەرە دەکـەن، هـەرچی جێو شـونی سـوتانە هـەموی

---

[1] صحیح مسلم، کتاب الإیمان، باب الرؤیة: (١/٢٩٩) حدیث رقم ١٨٢.

[2] صحیح مسلم، کتاب الإیمان، باب اثبات الشفاعة واخراج الموحدین: (١/١٧٢).

ده‌روا، پاشان هه‌ر ده‌پاڕێته‌وه‌و داوا ده‌كا هه‌تا دنیاو ده‌هێنده‌ی دنیای پێ ده‌درێ)) [1].

له‌فه‌رموده‌ی ئه‌نه‌سی مالیك هاتوه‌، پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رموی:

((يخرج من النار من قال لا إله إلا الله وكان في قلبه من الخير ما يزن شعيرة، ثم يخرج من النـار من قال لا إله إلا الله وكان في قلبه ما يزن بره، ثم يخرج من النار من قال لا إله إلا الله وكـان في قلبه من الخير ما يـزن ذرة: هـه‌ر كه‌سێكی گوتبی: لا الـه الا الله، و به‌بارسته‌ی ده‌نكه جۆیه‌ك چاكه‌ی له‌نێو دڵیدا هه‌بێ له‌دۆزه‌خی ده‌رده‌هێنرێ، پاشان هه‌ر كه‌سێكی گوتبی لا الـه الا الله و به‌بارسته‌ی ده‌نكه گه‌نمێك چاكه‌ی له‌دڵیدا هه‌بێ له‌دۆزه‌خ ده‌رده‌هێنرێ، پاشان هه‌ر كه‌سێكی گوتبی لا الـه الا الله و به‌بارسته‌ی گه‌ردیله‌یه‌ك چاكه‌ی له‌دڵدا هه‌بێ له‌دۆزه‌خ ده‌رده‌هێنرێ)) [2] فه‌رموده‌ش له‌م بابه‌ته زۆرن.

## خوازگه‌ی دووه‌م

## هه‌ڵوێستی كۆمه‌ڵه‌كان له‌ئاست تكاكاری

خه‌واریج و موعته‌زیله [3] نكوڵی له‌تكای تكاكاران ده‌كه‌ن، بۆ ئه‌وانه‌ی گوناهو تاوانی گه‌وره ئه‌نجام ده‌ده‌ن و، ئه‌وانه‌ی فه‌رمانی دۆزه‌خیان بۆ ده‌رچوه تێی نه‌چن، یا ئه‌وانی له‌دۆزه‌خدان ده‌ربهێنرێن، قورطوبی ده‌ڵێ :(ئه‌و شه‌فاعه‌ت وتكایه له‌لای خه‌واریج و موعته‌زیله بیدعه‌چیه‌كان نكوڵی لێكراوه بنچینه گه‌نده‌ڵه‌كانیان ڕێی نه‌داوه كه‌بریتیه له شایسته‌دانانی ئاوه‌ز(عقل) و له‌سه‌ر جوان و ناشیرین كردن

---

[1] صحيح مسلم، باب ادنى اهل الجنة منزلة: (١/١٧٨).

[2] صحيح مسلم، كتاب الإيمان، باب ادنى اهل الجنة منزلة: (١/١٨٢).

[3] خه‌واریج ئه‌و كۆمه‌ڵه بون، ئه‌پاش جه‌نگی صوفه‌ین ده‌ركه‌وتن، عه‌لی و موعاویه‌یان به‌كافر دانا، له‌گه‌ڵ هه‌مو ئه‌وانی له‌گه‌ڵیاندا بون، وایان دانا گوناهباران تا سه‌ر له‌دۆزه‌خدا ده‌بن، موعته‌زیله‌ش شوێنكه‌وته‌ی واصیلی كوڕی عه‌طائن، هه‌مان ڕای خه‌واریجانیان هه‌بو كه خاوه‌ن تاوانی گه‌وره تاهه‌تایێ له‌دۆزه‌خدان، به‌لام له‌باره‌ی حاڵی دنیایان چییان نه‌گوت.

دامەزراوە).

جا کاتێ ئەو گوتە بۆجێیە لەدژ فەرمودەی صەحیح و موتەواتیر سەری هەڵدا یاوەران هێشتا زندو بون، موسلیم لەصەحیحەکەیدا لەیەزیدی فەقیر دەگێڕتەوە: (بۆچونێکی خەواریجان دڵی گرتم، کۆمەڵێکی بەهەژمار بوین، بۆ حەج دەرچوین، پاشان بۆ سەر خەڵك دەرچین، بەمەدینەدا تێپەڕین، جابیری عەبدوڵلامان دیت پشتی وەکۆڵەگەك دابو، فەرمودەی لە پێغەمبەرﷺەوە بۆ خەڵکی دەگێڕایەوە، دەڵێ: جا هاتە سەر باسی دۆزەخییان، منیش پێم گوت: هۆ یاوەری پەیکی خودا، ئەوە ئێوە چی باس دەکەن، لەکاتێکدا خوا فەرمویە:

﴿إِنَّكَ مَنْ تُدْخِلِ النَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُ: بەڕاستی ئەو کەسی تۆ بیبەیە دۆزەخ ریسوات کردوە﴾آل عمران:١٩٢.

دەفەرمێ:﴿كُلَّمَا أَرَادُوا أَنْ يَخْرُجُوا مِنْهَا أُعِيدُوا فِيهَا: هەر دەمی بیانەوێ لێی دەربچن، جارێکیدی دەیانگێڕنەوە﴾السجدة:٢٠.

جا ئەمە چیە ئێوە دەیڵێن؟ ئەویش پرسی: ئایا تۆ قورئان دەخوێنی؟ گوتم: بەڵێ. گوتی: ئەدی گوێت لەباسی ئەو پایەبەرزەی موحەممەد ﷺ بوە کە خوا تێیدا زندی دەکاتەوە؟ گوتم: بەڵێ. گوتی: جا ئەوە ئەو پایەبەرزەی موحەممەدە، هەر کەسێکی خوا بیەوێ بەو هۆیەوە لەدۆزەخی دەردێنێ، دەڵێ: ئەوجا هاتە سەر باسی سیراط و بەسەردا رەت بونی خەڵکی، ترسم هەیە چاك ئەوەم ئەزبەر نەکردبی. دەڵێ: بەلام گوتی گوایە کۆمەڵێك پاش ئەوەی دەچنە دۆزەخ لێوەی دێنەدەر، گوتی: واتە وەکو داروچکەی کونجی دێنە دەرێ، گوتی: جا دەچنە سەر یەکێك لەروبارەکانی بەهەشت و خۆی تێدا دەشۆن، دێنە دەر وەك پەڕاوان پاك دەبنەوە.. کە گەڕاینەوە گوتمان: ئەو چیتانە، ئایا وا دەزانن ئەو پیرە درۆ بە پێغەمبەر ﷺ هەڵدەبەستێ؟ جا گەڕاینەوەو سوێند بەخوا لەیەك پیاو بترازێ کەسمان لێنەبوە خەواریج)[2].

خەواریج و موعتەزیلەکان لەم مەسەلەیەدا توندڕەو بون، رایان وابو گوایە

---

[1] التذكرة للقرطبي:ص٢٤٩

[2] صحيح مسلم، كتاب الإيمان، باب ادنى اهل الجنة مترلة، (١٧٩/١) ورقمه ١٩١.

تاوانبـاره گـەورەكان لـەدۆزەخي نايەنـە دەر و، تكـاى تكاكـارانيش سـوديان پـێ ناگەيـەنێ. مورجيئـەكانيش لەسـەرەكەى ديكـەوە توندڕۆ بـون، واتـە بـەگردەبڕى بڕياريـان نـەدەدا كە هيـچ يـەكێك لـەخاوەن تاوانـە گـەورەكان دەچنـە دۆزەخ ؛ وايـان هەڵدەبەستا هـەمو تاوانبارە گەورەكانيش بـەبێ ئەشكەنجە دەچنـە بەهەشـت، ديـارە هەردو كومەڵيش پێچەوانـەى فـەرمودەى موتـەواتيرن لـە پێغەمبـەرﷺـەوە، هـەروەك پێچەوانەى كۆڕابونى پێشين و پێشەواكانى ئوممەتن، خوداى بەرزيش بەئيزنى خۆى لەنێو ئەو جياڕابونەدا ، ئەهلى سوننەت وجەماعەتى بۆ هەق هيدايەت داوە، واى بۆ چون كە گوناهكارە گەورەكان دەكەونە بەرويستى خودا، گەر بيەوێ بەميهرى خۆى لێيان خۆش دەبێ و، ئەگەر بشيەوێ بەهۆى تاوانەكانيان ئەشكەنجەيان دەدا، پاشـان بەميهرى خۆى دەيانباتە بەهەشت:

﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ: بەراستى خوا لـەوە خۆش نابێ هاوبەشى بۆ دابنرێ و لەگوناهانى خوارترى هەر كەسێكى بيەوێ خۆش دەبێ﴾النساء:٤٨.

هەروەها دەفەرمێ: ﴿قُلْ يَاعِبَادِي الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنفُسِهِمْ لاَ تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُـــورُ الرَّحِيـــمُ: بلَـێ: ئـەى بەندەكانى مـن ئەوانەى بە لادان لە ئەندازە ناهەقيو لەخۆ كردوە! نابێ ئێوە لە بەزەيى خوا نائومێد بـن، چونكـە خـودا لەهـەمو گونـاهێك خـۆش دەبـێ و هـەر ئـەو لێبـوردە و ميهرەبانە﴾الزمر:٥٣.

چونكـە خـوا لەهاوبـەش دانـان خـۆش نابـێ، گوناهـەكانى خـوار شـيركيش لەبەرويستى خودان، هەر كەسێك لە گوناهان پەشيمان بێتەوە وەك ئەو كەسـەيە كە چ گوناهێكى نەبێ، بيانوى خەواريجانيش لـە نـەرێكردن لـەو شـەفاعەتە، ئـەو ئايـەتانەن كە نەرێ لەو شەفاعەتانە دەكەن كە موشريكان دەيانسەلمێنن، چونكە هاوبەشدانەران بيروبڕوايان وايە تكاكاران لەلاى خودا وەك تكاكارى دنيا وايـە، تكاكـار بـەبێ مۆڵـەت تكـاى خۆى لـەلاى غـەيرى وى دەكـا، ئەگـەرچى لەشـەفاعەت بۆكراويـش رازى نـەبێ، بەڵام ئەمە لەلاى خوداى پەروەدگار نابێ و ناكرێ، دەقەكانيش ئەم جۆرە تكايـە ڕەت

**دەکەنەوە، هەروەکو خوای گەورە دەفەرمێ:**

﴿وَاتَّقُوا يَوْمًا لاَ تَجْزِي نَفْسٌ عَنْ نَفْسٍ شَيْئًا وَلاَ يُقْبَلُ مِنْهَا شَفَاعَةٌ وَلاَ يُؤْخَذُ مِنْـهَا عَدْلٌ: **خۆ بپارێزن لەو ڕۆژەی کە کەس تاوانی ناچێتە سەر کەسیتر؛ نە بارمتەی تێدا هەیە و نە هیچ خۆ کڕینەوەیەك؛ کەسیش دەهانای کەس نایە**﴾البقرة:٤٨.

**وە دەفەرمێ:** ﴿فَمَا تَنْفَعُهُمْ شَفَاعَةُ الشَّافِعِينَ: **جا تکای تکاکاران چ سودێکیان پێ ناگەیەنێ**﴾المدثر:٤٨.

**وە دەفەرمێ:** ﴿ مَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ حَمِيمٍ وَلاَ شَفِيعٍ يُطَاعُ: **ستەمکاران هیچ دۆستێك و تکاکارێکیان نیە قسەی ببیسترێ**﴾غافر:١٨.

**دەقەکانیش ئەوە ڕون دەکەنەوە کە تکاکاری لەلای خودا هەر دەبێ بە ئیزنی وی بێ، ناشبێ هەتا لەتکاکار.و تکابۆکراو خۆشنودو ڕازی نەبێ:**

﴿مَنْ ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلاَّ بِإِذْنِهِ: **کێیە لەوێ ڕۆژی بتوانێ لەلای ئەو شەفاعەت بکا مەگەر بەئیزنی ئەو**﴾البقرة:٢٥٥. **وە دەفەرمێ:**

﴿وَلاَ يَشْفَعُونَ إِلاَّ لِمَـنْ ارْتَضَـى: **تکا ناکەن مەگەر بۆ ئەو کەسەی خودا لێی ڕازیە**﴾الانبياء:٢٨.

**وەدەفەرمێ:** ﴿وَكَمْ مِنْ مَلَكٍ فِي السَّمَاوَاتِ لاَ تُغْنِي شَفَاعَتُهُمْ شَيْئًا إِلاَّ مِنْ بَعْـدِ أَنْ يَأْذَنَ اللَّهُ لِمَنْ يَشَاءُ وَيَرْضَـى: **زۆر فریشتە لەئاسمانەکاندا هەن تکاکاریان سودێك نادا، مەگەر دوای ئەوەی خوا ڕێگە دەداو بۆ ئەو کەسی کە دەیەوێ لێی ڕازی بێ**﴾النجم:٢٦.

**لەبارەی فریشتەکانیش دەفەرمێ:** ﴿يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلاَ يَشْـفَعُونَ إِلاَّ لِمَنْ ارْتَضَى وَهُمْ مِنْ خَشْيَتِهِ مُشْفِقُونَ: **خودا کردەوەی ئەمڕۆو داهاتویان دەزانێ. هەروەها ڕابوردویانیش ، وە ئەوانە تکا ناکەن مەگەر بۆ ئەو کەسەی خودا لێی ڕازیە تکای بۆ بکەن، ئەو فریشتانە وای لێ دەترسن، دەلەرزن**﴾الانبياء:٢٨.

**وەدەفەرمێ:** ﴿وَلاَ تَنفَعُ الشَّفَاعَةُ عِنْدَهُ إِلاَّ لِمَنْ أَذِنَ لَهُ: **تکاکاری لای خودا سودی**

**نیە مەگەر ئەوەی خودا ئیزنی پێ بدا﴾سبأ:٢٣.**

**جا ئەم دەقانە هەموی نەرێ لەو شەفاعەت وتکایە دەکەن کە موشریکەکان بۆ فریشتەکان و پێغەمبەران و صاڵحان دەیسەلمێنن و بەتاڵیان دەکەنەوەو، تەنها ئەو تکاکاریە دەسەلمێنن کە بەئیزنی خوداو رەزامەندی لەتکاکارو تکابۆکراو دەبێ، خوداش لەبێبڕواو هاوبەشدانەران نابورێ و رازی نابێ ، هەرچی یەکخواپەرستە گوناهبار ویاخیەکانن، ئەوانەن تکاکاران تکایان بۆ دەکەن، هەرگیز تکا بۆ بێبڕواو هاوبەشدانەرانیش ناکەن.**

**لەئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێبێ) هاتوە دەڵێ: گوتم ئەی پێغەمبەری خوا، کێ لەرۆژی قیامەتدا لەهەمو خەڵکی ئاسودەترە بەتکاو شەفاعەتی تۆ؟ فەرموی:**

((لقد ظننت يا أبا هريرة أن لا يسألني عن هذا الحديث أحد أول منك، لما رأيت من حرصك على الحديث، أسعد الناس بشفاعتي يوم القيامة من قال لا إله إلا الله خالصا من قبل نفسه: **ئەی ئەبو هورەیرە وا گومانم دەبرد کەس لەپێش تۆ ئەو پرسیارەم لێ نەکا، لەبەر ئەو مکوڕیەی بۆ فەرمودەخوازی هەتە، ئاسودەترین کەس بەشەفاعەتی من لەرۆژی قیامەتدا ئەو کەسەیە لەناخی دەرون و بەدڵڕاستیەوە دەڵێ: لا اله الا الله))**[1]

[1] رواه البخاري في صحيحه، كتاب الرقاق، باب صفة الجنة والنار، فيتح الباري: (١١/٤١٨).

## جێباسی هەشتەم

### دوایەمین کەس دەچێتە بەهەشت

پێغەمبەر ﷺ سەربوردەی دوا پیاومان بۆ دەفەرمێ، کە لەدۆزەخ دێتە دەر و دەچێتە بەهەشتێ، لەگەڵ ئەو وتوێژەی لەنێوان ئەو پیاوەو پەروەردگاری ڕویداوەو ئەو هەمو بەهرەو ڕێزە مەزنەی خودا پێیداوەو لەبەر گەورەییان باوەڕی نەکردوە خودا پێی ببەخشێ، ئیبنی ئەثیر لە (جامع الاصول)دا هەمو گێڕانەوەکانی ئەم فەرمودەیەی کۆ کردوەو، ئێمەش ئەم فەرمودانە لەوێرا ڕادەگوێزین:

١- لەعەبدوڵڵای مەسعودەوە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((إني لأعلم آخر أهل النار خروجا منها، وآخر أهل الجنة دخولا الجنة؛ رجل يخرج من النار حبوا، فيقول الله له: اذهب فادخل الجنة، فيأتيها، فيخيل إليه أنها ملأى، فيرجع فيقول: يا رب، وجدتها ملأى، فيقول الله ﷻ: اذهب فادخل الجنة، فإن لك مثل الدنيا وعشرة أمثالها؛ أو إن لك مثل عشرة أمثال الدنيا، فيقول: أتسخر بي -أو أتضحك بي- وأنت الملك؟ قال: فلقد رأيت رسول الله ﷺ ضحك حتى بدت نواجذه، فكان يقال: ذلك أدنى أهل الجنة منزلة: من وەئاگام لەدوایین کەسی دۆزەخ کە جێی دێڵێو، دوایین کەسی بەهەشتیش کەتێی دەچێ: پیاوێکە بەخشکە لەدۆزەخ دێتە دەرێ، جا خودای گەورە پێی دەفەرمێ: بچۆ لەبەهەشت بڕۆ ژور، کە بۆ لای بەهەشتێ دەچێ وا دەزانێ تەژی و پڕە، دەگەڕێتەوەو دەڵێ: پەروەردگارم ، دیتم بەهەشت پڕە، خودای بەرز دەفەرمێ: بچۆ لەبەهەشت بڕۆ ژور، بۆ تۆ هێندەی دنیای تێدا ، لەگەڵ دە هێندانی تریش، یا لەبۆ تۆ دە هێندەی دنیای تێدایە، دەڵێ: ئایا گاڵتەم پێ دەکەی، یا پێم پێ دەکەنی، وتۆ پادشای؟ عەبدوڵڵا دەڵێ: دیتم پێغەمبەر ﷺ هێند پێکەنی تا دانەکانی دەرکەوتن ، جا دەگوترا ئەوە خاوەن نزمترین پایەی بەهەشتییە))[1].

لەلای موسلیم هاتوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی : ((إني لأعرف آخر أهل النار خروجا من

[1] أخرجه البخاري ومسلم.

النار؛ رجل يخرج منها زحفا، فيقال له: انطلق فادخل الجنة، قال: فيذهب فيدخل الجنة، فيجد الناس قد أخذوا المنازل، فيقال له: أتذكر الزمان الذي كنت فيه؟ فيقول: نعم، فيقال له: تمن، فيتمنى، فيقال له: لك الذي تمنيت، وعشرة أضعاف الدنيا، فيقول: أتسخر بي وأنت الملك؟ قال: فلقد رأيت رسول الله ﷺ يضحك حتى بدت نواجذه: من دوا کەسی دەناسم کە لەدۆزەخ دێتە دەر؛ پیاوێك بە خشین لێی دێتە دەرێ، جا پێی دەگوترێ؛ برۆ لەبەهەشت هەروە ژور، فەرموی؛ جا دەڕواو دەچێتە بەهەشت، دەبینێ خەڵك نشینگەكانیان گرتوه، جا پێی دەگوترێ؛ ئەو كاتانەت دێتەوە یاد كە تێی دابوی؟ دەڵێ؛ بەڵێ، جا پێی دەگوترێ؛ بخوازە، جا بەهومێدی چیە دەیخوازێ، پێی دەگوترێ؛ چیت خواست بۆ تۆ ، لەگەڵ دە هێندەی دنیایێ، دەڵێ؛ ئایا گاڵتەم پێدەكەی و تۆش پادشای؟ دەڵێ؛ جا دیتم پێغەمبەر ﷺ پێكەنی هەتا ددانەكانی لای خڕێی دەركەوتن))[1].

٢- لەعەبدوڵڵای كوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێبێ) هاتوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((آخر من يدخل الجنة رجل، فهو يمشي مرة ويكبو مرة وتسفعه النار مرة، فإذا ما جاوزها التفت إليها فقال: تبارك الذي نجاني منك، لقد أعطاني الله شيئا ما أعطاه أحدا من الأولين والآخرين، فترفع له شجرة فيقول: يا رب، أدنني من هذه الشجرة فلأستظل بظلها وأشرب من مائها، فيقول الله ﷻ: يا ابن آدم لعلي إن أعطيتكها سألتني غيرها؟ فيقول: لا يا رب، ويعاهده أن لا يسأله غيرها، قال: وربه ﷻ يعذره، لأنه يرى ما لا صبر له عليه، فيدنيه منها، فيستظل بظلها، ويشرب من مائها، ثم ترفع له شجرة هي أحسن من الأولى، فيقول: أي رب، أدنني من هذه لأشرب من مائها، وأستظل بظلها، لا أسألك غيرها، فيقول: يا ابن آدم، ألم تعاهدني أن لا تسألني غيرها؟ فيقول: لعلي إن أدنيتك منها تسألني غيرها؟ فيعاهده أن لا يسأله غيرها، وربه تعالى يعذره لأنه يرى ما لا صبر له عليه، فيدنيه منها، فيستظل بظلها، ويشرب من مائها، ثم ترفع له شجرة عند باب الجنة وهي أحسن من الأولين، فيقول: أي رب أدنني من هذه لأستظل بظلها وأشرب من مائها، لا أسألك غيرها، فيقول: يا ابن آدم ألم تعاهدني أن لا تسألني غيرها؟ قال: بلى يا رب لا أسألك غيرها، وربه ﷻ يعذره لأنه يرى ما لا صبر له عليه فيدنيه منها فإذا أدناه منها، سمع

[1] رواه البخاري: (٣٨٦/١١) في الرقاق، باب في صفة الجنة والنار، وفي التوحيد، باب كلام الرب ﷻ يوم القيامة مع الأنبياء وغيرهم، ومسلم رقم: ١٨٦ في الإيمان، باب آخر اهل النار خروجا والترمذي رقم ٢٥٩٨ في صفة جهنم، باب رقم ١٠.

أصوات أهل الجنة فيقول: أي رب أدخلنيها، فيقول: يا ابن آدم ما يصريني منــــك أيرضيــــك أن أعطيك الدنيا ومثلها معها؟ قال: يا رب أتستهزئ مني وأنت رب العـلمين؟: دوا كەسی دەچێتە بەهەشت پیاوێکە ، جارێك دەڕوا و، جارێك بەردەبتەوەو، جارێك ئاگر داغی دەکات، جا کە لێی تێدەپەڕی ئاوڕی لێ دەداتەوەو دەڵێ: پاکی و پیرۆزی بۆ ئەو خودایەی لەتۆ رزگاری کردم، خودا شتێکی پێ بەخشیم لەپێشین و پاشینان بەهیچ کەسێکی نەبەخشیوە، جا دارێکی بۆ بەرز دەکرێتەوە، دەڵێ: ئەی پەروەردگارم ، لەو دارەم نێزیك بکەوە، تا لەسایەیدا ڕۆنیشم و، لەئاوەکەی بخۆمەوە، جا خودای بەرز دەفەرمێ: ئەی بەنیادەم، رەنگە ئەگەر ئەوەت بدەمێ داوای شتی دیکەم لێ بکەی؟ دەڵێ: نا ئەی پەروەردگارم ، جا پەیمان بەخوا بەدا چیدی لێ داوا نەکا، فەرموی: جا پەروەردگاری تەوازۆی دەداتێ، چونکە ئارامی بۆ نەماوە، جا لێی نێزیك دەخاو دەچێتە سێبەرەکەی‌و، لەئاوەکەی دەخواتەوە، پاشان درەختێکی لەوی پێشو جوانتری بۆ بەرز دەکرێتەوە، دەڵێ: ئەی پەروەردگارم، لەوێم نێزیك بخەوە تا لە ئاوەکەی وەخۆم و، لەسێبەری دانیشم، جا چی دیت لێ داوا ناکەم. دەفەرمێ: ئەی ئادەمیزاد ، ئەدی پەیمانت نەدامێ چیدیکەم لێداوا نەکەی؟ دەفەرمێ: رەنگە لەوەشت نزیك کەمەوە هی دیکەم لێ داواکەی؟ دیسان پەیمان دەدا چی دی لێداوا نەکا. پەروەردگاریش بیانوی دەداتێ، چونکە دەبینێ ئارامی بۆ نەماوە، جا لێی نیزیکی دەخاتەوە، دەچێتە سێبەرەکەی‌و لەئاوەکەی دەخواتەوە، ئەوجا درەختێکی بۆ لەبەردەرکی بەهەشتێ دەڕوێ لە هەردوکی پێشو جوانتر، دەڵێ: پەروەردگارا لەوەی نێزیکم بکەوە تا لەسایەی دانیشم و لە ئاوەکەی بخۆمەوە، چی ترت لێ داواناکەم ، دەفەرمێ: ئەی بەنیادەم ، ئەدی پەیمانت نەدامێ کەچی دیم لێ داوا نەکەی؟ دەڵێ: بەڵێ، ئەی پەروەردگارم چی ترت لێ داوا ناکەم. پەروەردگاری بەرزیشی بیانوی دەداتێ. چونکە دەبینی کە ئارامی بۆ نەماوە، جا لێی وەنێزیك دەخا، کە نیزیکی دەکاتەوە گوێی لەدەنگی بەهەشتنشینان دەبێ، دەڵێ: پەروەردگارم لەبەهەشتێم ببەژور، دەفەرمێ: ئەی ئادەمیزاد، چی چاوت تێر دەکاو رازیت دەکا. بەوەی رازی دەبی دنیات بدەمێ و هێندەی دیکەشی لەگەڵدا بێ. دەڵێ: پەروەردگارم ، گاڵتەم پێ دەکەی وتۆ پەروەردگاری جیهانیانی؟)).

جا ئیبنی مەسعود پێکەنی، گوتی: لێم ناپرسن بەچی پێدەکەنم؟ گوتیان: بەچی پێدەکەنی؟ گوتی: پێغەمبەرﷺ ئاوا پێکەنی، گوتیان: بەچی پێدەکەنی، ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرموی:

((من ضحك رب العالمين، حين قال؛ أتستهزئ مني وأنت رب العالمين؟ فيقول؛ إني لا أستهزئ منك، ولكني على ما أشاء قادر: بەپێکەنینی پەروەردگاری جیهانیان، کە دەڵێ؛ ئایا گاڵتەم پێ دەکەی و تۆش پەروەردگاری جیهانیانی؟ جا دەفەرمێ؛ من گاڵتەت پێ ناکەم، بەڵام چی ویستم لێبێ توانستم هەیە بیکەم))[1].

لەئەبو سەعیدی خودری (رەزای خوای لێبێ) کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((إن ادنى اهل الجنة منزلة؛ رجل صرف الله وجهه عن النار قبل الجنة، ومثل له شجرة ذات ظل، فقال؛ أي رب، قربني من هذه الشجرة لأكون من ظلها: پایەنزمترین خەڵکی بەهەشت؛ پیاوێکە خودا روی لەئاگری وەلا ناوە بەرەو لای بەهەشت، درەختێکی سێبەرداریشی بۆ رواندوە، دەڵێ؛ پەروەردگارم لەو درەختەم وەنێزیک خە تا بچمە سێبەرەکەی..)).

جا فەرمودەکەی وەکو هی ئیبنی مەسعود هێناوەتەوە، بەڵام ئەوەی تێدا نەهاتوە کە دەفەرمێ: ئەی ئادەمیزاد چی رازیت دەکاو چاوت تێر دەکا ئەمەشی بۆ زیدەکردوە:

((ويذكره الله، سل كذا وكذا، فإذا انقطعت به الأماني، قال الله؛ هو لك وعشرة أمثاله، قال؛ ثم يدخل بيته، فتدخل عليه زوجتاه من الحور العين، فيقولان؛ الحمد لله الذي أحياك لنا، وأحيانا لك، قال؛ فيقول؛ ما أعطي أحد مثل ما أعطيت: جا خودا وەبیری دەخاتەوە داوای ئەوە بکەو داوای ئەمە مەکە، کە هیچ مرازێکی دیکەی نامێنی‌خوا دەفەرمێ؛ ئەمانە هەمو بۆ تۆ لەگەڵ دە هێندەی دیکە، فەرموی؛ پاشان دەچێتە ماڵی خۆی، هەردو ژنە پەریە چاوبەڵەکەکانی لێی وەژور دەکەون، دەڵێن؛ ستایش بۆ خوا کە تۆی بۆ ئێمە ژیاندو ئێمەش بۆ تۆ، فەرموی جا دەڵێ: هیچ یەکێك وەك منی پێ نەبەخشراوە)).

موسلیم پاش فەرمودەکەی ئیبنی مەسعود ئەمەی تەخریج کردوە[2].

---

[1] اخرجه مسلم، رقم١٨٧ في الايمان، باب آخر اهل النار خروجاً؛ وهذا الحديث هكذا اخرجه الحميدي وحده في افراد مسلم، والذي قبله في المتفق عليه وقال: انما افردناه للزيادة التي فيه.

[2] رواه مسلم رقم ١٨٨؛ في الإيمان، باب ادنى اهل الجنة منزلة فيها.

## جێباسی نۆیەم

### ئەوانی پێش ڕۆژی دوایی چونەتە بەهەشت

**یەکەمین مرۆڤ چوبێتە بەهەشت ئادەمی باوکی مرۆڤان بوە:**

﴿وَقُلْنَا يَاآدَمُ اسْكُنْ أَنْتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ وَكُلاَ مِنْهَا رَغَدًا حَيْثُ شِئْتُمَا: **گوتمان؛ ئەی ئادەم تۆو خێزانت لەبەهەشتێ نیشتەجێ بن و هەرچی دەتانەوێ بەخۆشی بیخۆن**﴾البقرة: ٣٥.

**هەروا دەفەرمێ:** ﴿وَيَاآدَمُ اسْكُنْ أَنْتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ فَكُلاَ مِنْ حَيْثُ شِئْتُمَا وَلاَ تَقْرَبَا هَذِهِ الشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ الظَّالِمِينَ: **ئەی ئادەم تۆو خێزانت لەبەهەشتدا نیشتەجێ بن و لەهەرچی دەتانەوێ بیخۆن ولەم دارە نێزیك مەكەون، نەوەك لەستەمكاران دەبن**﴾الأعراف: ١٩.

**بەڵام ئادەم بەخواردنی ئەو درەختەی خودا نەهی لێكردبو، لەپەروەردگاری خۆی یاخی بو، بۆیە خودا لەبەهەشتی دابەزاندو هەڵی دایە خانەی ناشادی:**

﴿وَلَقَدْ عَهِدْنَا إِلَى آدَمَ مِنْ قَبْلُ فَنَسِيَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُ عَزْمًا، وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلاَئِكَةِ اسْجُدُوا لآدَمَ فَسَجَدُوا إِلاَّ إِبْلِيسَ أَبَى، فَقُلْنَا يَاآدَمُ إِنَّ هَذَا عَدُوٌّ لَكَ وَلِزَوْجِكَ فَلاَ يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ الْجَنَّةِ فَتَشْقَى، إِنَّ لَكَ أَلاَّ تَجُوعَ فِيهَا وَلاَ تَعْرَى، وَأَنَّكَ لاَ تَظْمَأُ فِيهَا وَلاَ تَضْحَى، فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ الشَّيْطَانُ قَالَ يَاآدَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَى شَجَرَةِ الْخُلْدِ وَمُلْكٍ لاَ يَبْلَى، فَأَكَلاَ مِنْهَا فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْآتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِنْ وَرَقِ الْجَنَّةِ وَعَصَى آدَمُ رَبَّهُ فَغَوَى، ثُمَّ اجْتَبَاهُ رَبُّهُ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَى، قَالَ اهْبِطَا مِنْهَا جَمِيعًا بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ: **بەڕاستی ئێمە پێشتر پەیمانمان لەئادەم وەرگرت، جا ئەو لەبیری چو نەمان بینی خاوەنی ویستێكی بەهێز بێت. وە ئەو دەمەی كە بە فریشتەكانمان گوت: سوژدە بۆ ئادەم ببەن. جا هەمو سوژدەیان برد بێجگە لە ئیبلیس كە ملی باداو سوژدەی نەبرد، ئەوجا گوتمان؛ ئەی ئادەم ، بەڕاستی ئەمە دوژمنی تۆو خێزانتە، نەكا ئێوە**

لەبەهەشت وەدەر بنێ، چونکە دەکەویتە نێو دەردو ناخۆشی، دڵنیابە لەبەهەشتدا نەبرسی دەبیو نەڕوت وقوتیش دەمێنیەوە، لەوێدا تینوت نابێ و گەرمای ڕۆژیش ئازارت نادا، جا شەیتان خستیە دودڵی، گوتی : ئایا دەتەوێ بۆ لای داری هەمیشەییو موڵکی بێ بڕانەوە ڕێنوێنیت بکەم، تا سەرەنجام هەردوك لەو درەختەیان خواردو جلکی بەهەشتیان لەبەر دڕاندراو شەرمگەیان دەرکەوت ودەستیان پێکرد بەگەڵای دارانی بەهەشتێ ئەوانە داپۆشن، بەم شێوەیە ئادەم بێ قسەی خوای خۆی کردو لەپاداشی ئەو بێبەش بو، ئەوجا پەروەردگاری هەڵیبژاردو تۆبەی قبول کردو ڕێنوێنیشی کرد. خودا فەرموی؛ هەردوکتان لەوێ دابەزنە خوار لەماڵێکدا دەبنە دژمنی یەکتر﴾طه:١١٥-١٢٣.

پێغەمبەری نازداری ئێمەش ﷺ بەهەشتی دیوە، هەروەك لەصەحیحی بوخاری لەعیمرانی کوڕی حوصەین لە پێغەمبەر ﷺ هاتوە، فەرموی:

((اطلعت في الجنة فرأيت اهلها الفقراء، واطلعت في النار فرأيت اهلها النساء: سەرم بەبەهەشتێ داگرت دیتم خەڵکەکەی لەهەژارانن، سەرم بەدۆزەخیش داگرت دیتم خەڵکەکەی لەئافرەتانن))[1].

هەر لەوانی لەپێش هاتنی قیامەت دەچنە بەهەشت، شەهیدانن، لەصەحیحی موسلیمدا هاتوە، مەسروق دەڵی : لەعەبدوڵلای کوڕی مەسعودمان پرسیار کرد؛ ئەم ئایەتە مانای چیە؟

﴿وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتًا بَلْ أَحْيَاءٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ﴾آل عمران:١٦٩.

گوتی: ئێمەش هەمان پرسیارمان کردو فەرموی: ((أرواحهم في أجواف طير خضر، لها قناديل معلقة بالعرش، تسرح من الجنة حيث شاءت، ثم تأوي إلى تلك القناديل، فاطلع إليهم ربهم اطلاعة، فقال؛ هل تشتهون شيئا؟ قالوا؛ أي شيء نشتهي ونحن نسرح من الجنة حيث شئنا، ففعل بهم ثلاث مرات، فلما رأوا أنهم لن يتركوا من أن يسألوا، قالوا: يا رب، نريد أن ترد أرواحنا في

[1] صحيح البخاري؛ كتاب بدء الخلق، باب ما جاء في صفة الجنة، فتح الباري: (٣١٨/٦).

أجسادنا حتى نقتل في سبيلك مرة أخرى، فلما رأى أن ليس لهم حاجة تركوا: گيانەکانيان لەهەناوی تەيری کەسکن، چرای تايبەتيان بۆ بەعەرش هەڵواسراوە، کوێيان بوێ لەبەهەشتێ بۆوێ دەچن، جا لەنێو ئەو چرايانە ئارام دەگرن، جا خودا سەرنجێکی دان و فەرموی؛ ئارەزوی هيچ شتێ دەکەن؟ گوتيان؛ ئارەزوی چی بکەين، لەکاتێکدا لەبەهەشتێ کوێمان بوێ بۆ وێ دەچين، جا سێ جاران وای لێ پرسين، کە زانيان هەتا شتێك داوا نەکەن وازيان لێناهێنرێ، گوتيان؛ پەروەردگارا، دەمانەوێ گيانەکانمان بۆ جەستان بگەڕێتەوە، تا ئەو جارەش لەپێناو تۆدا بکوژرێين، کە دەبينێ چيبان ناوێ وازيان لێ دەهێنرێ))[1].

هەر کەسێکی کە بمرێ بەسبەينان و ئێواران نشينگەی خۆی لەبەهەشت و لەدۆزەخ پێ نيشان دەدرێ، لەئيبنی عومەر(رەزای خوای لێبێ) هاتوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((إن أحدكم إذا مات عرض عليه مقعده بالغداة والعشي إن كان من أهل الجنة فمن أهل الجنة وإن كان من أهل النار فمن أهل النار يقال هذا مقعدك حتى يبعثك الله إليه يوم القيامة: ئەگەر يەکێك لەئێوە مرد هەمو سبەينەو ئێواران جێگەی خۆی پێ نيشان دەدرێ، گەر بەهەشتی بو لەبەهەشت، کە دۆزەخييش بێ لەدۆزەخ. دەڵێن ئەمە جێ و شوێنتە هەتا لە ڕۆژی دواييدا خودا زندوت دەکاتەوە))[2].

---

[1] مشكاة المصابيح: (٣٥١/٢) ورقمه ٣٨٠٤.

[2] رواه مسلم في صحيحه، انظر صحيح مسلم بشرح النووي: (٣٠٠/١٧).

## بەندی دووەم

## بەهەشت هەمیشەییەو بەهەشتنشینان نەمرن

### جێباسی یەکەم

### ئەو دەقانەی بەڵگەی ئەمەن

بەهەشتی خوا یەکجاریەو هەتاهەتایە، تونا نابێ و لەنێو ناچێ، خەڵکەکەشی بۆ هەمیشە تێیدا زیندون، نەجێی دێڵن نە جێ دەگۆڕنەوە، نە لەنێو دەچن نە دەمرن:

﴿لاَ يَذُوقُونَ فِيهَا الْمَوْتَ إِلاَّ الْمَوْتَةَ الأُولَى وقَاهُمْ عَذَابَ الْجَحِيمِ: بێجگە لە مردنی یەکەم کە لەدنیا چێشتوتانە، چ مەرگی دیکە ناچێژن و خودا لەئەشکەنجەی دۆزەخ دەیانپارێزێ﴾الدخان:٥٦.

﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَانَتْ لَهُمْ جَنَّاتُ الْفِرْدَوْسِ نُزُلاً، خَالِدِينَ فِيهَا لاَ يَبْغُونَ عَنْهَا حِوَلاً: بەڕاستی کەسانێکی بڕوایان هێناوەو کاری چاکیان ئەنجام داوە، باخەکانی فیردەوس جێگەیانە، هەمیشە لەوێدا دەمێننەوەو داوای جێ گۆستنەوە ناکەن﴾ الکهف:١٠٧-١٠٨.

پێشتر لەباسی هەمیشەیی دۆزەخ، ئەوان فەرمودانمان هێنا کە پێغەمبەرﷺ سەربڕینی مردنی لەنێوان بەهەشت و دۆزەخ تێدا ڕاگەیاندبون، ئەوجا بەخەڵکی بەهەشت و خەڵکی دۆزەخ دەگوترێ:

((یاأهل الجنة خلود فلا موت، ویاأهل النار خلود فلا موت: هۆ خەڵکی بەهەشت جاویدانیەو مردن نەما، هۆ خەڵکی دۆزەخ جاویدانیەو مردن نەما)).

دەقەکان وا دەگەیەنن بەهەشتی خوا هەر لە پێشدا وەها بەدیدەهێنرێ، هەرگیز تونانەبێ، خەڵکەکەشی بەهەمان شێوە، لەفەرمودەی ئەبو هورەیرە هاتوە، پێغەمبەرﷺ فەرموی:

((من يدخل الجنة ينعم، لا يباس، ولا تبلى ثيابه، ولا يفـــنى شـــبابه: هـەر کەسێکی بچێتە بەهەشت دەنازو نیعمەت دەکەوێ، هەرگیز ناخۆشی نابینێ. جل و بەرگەکەی ناڕزێن و کۆن نابن و ، لاوینیەکەی بەسەر ناچێ))[1].

پاش ئـەوەی بەهەشتیەکان دەچنە بەهەشت گوێ بدە بـانگی بـاڵای پـەروەردگار بۆیان:

((إن لكم أن تصحوا فلا تسقموا أبدا، وإن لكم أن تحيوا فلا تموتوا أبدا، وإن لكم أن تشـــبوا فلا تهرموا أبدا، وإن لكم أن تنعموا فلا تبتئسوا أبدا، فذلك قوله ﷻ: ﴿وَنُودُوا أَنْ تِلْكُمُ الْجَنَّـــةُ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾الأعراف: ٤٣: ئێوە هـەر تەندروست باش دەبن و هـەرگیز نەخۆش ناکەون، هەر زندی دەبن و قەت نامرن، هەر لاو دەبن و هەرگیز پیر نـابن، هـەر لەنازو خۆشی دەبن و، هەرگیز غـەمگین نـابن، ئەمەیـە کـە خـوا دەفـەرمێ: -واتاکـەی- ئـەوجا بانگیـان لێ دەکرێـت، ئـەو بەهەشـتەی ئێـوە بـون بـە مـیراتگر و خـاوەنی، لــە پاداشتی کارو کردەوەی خۆتانە))[2].

---

[1] رواه مسلم في صحيحه، كتاب الجنة، باب في دوام نعيم الجنة، (٢١٨١/٤)، ورقمه: ٢٨٣٦.
[2] صحيح مسلم، كتاب الجنة، باب دوام نعيم الجنة: (٢١٨٢/٤)، ورقمه ٢٨٣٧.

## جێباسی دوەم

### ئەوانی دەڵێن بەهەشت لەناو دەچێ

جوهمی کوڕی صەفوانی پێشەوای جوهمیەکان، وای بۆ چوە کەبەهەشت لەناو دەچێت و، دۆزەخیش هەر لەناو دەچێ، هەرگیز هیچ پێشیەکیشی نەبوە، نەلەنێو هاوەڵان و نەشوێنکەوتە چاکەکانیان و، نەلە نێو پێشەوایانی موسڵمانان و، لەنێو ئەهلی سوننەت، تێکرای ئەهلی سوننەتیش نکوڵیان لەو ڕایەی کردوە، ئەبولهوذەیلی عەللافی شێخی موعتەزیلان وای بۆ چوە جولەو بزاوتی بەهەشتی و دۆزەخییان لەناو دەچێو، دەکەونە دامرکان وداکاسانێکی بەردەوام. هیچ یەکیکیان توانستی جولەی نامێنێ[1]، ئەمەش هەموی پوچ وبەتاڵە، ڕاڤەکاری طەحاوی دەڵێ: (بەهەشت هەمیشەییەو، نە تونا دەبێ و نەلەنێو دەچێ، ئەمەش هەر بەزەرورەت دەزانرێ کە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێداوە، خوای بەرز دەفەرمێ:

﴿وَأَمَّا الَّذِينَ سُعِدُوا فَفِي الْجَنَّةِ خَالِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتْ السَّمَاوَاتُ وَالأَرْضُ إِلاَّ مَا شَاءَ رَبُّكَ عَطَاءً غَيْرَ مَجْذُوذٍ: ئەوانەی کە بەختەوەر بون، بۆ هەمیشە لەبەهەشتدا دەمێننەوە، تا ئاسمان و زەوی هەبن، بێجگە لەوەی پەروەردگارت بیەوێ، بەخششێکە نابڕێتەوە﴾هود:١٠٨.

ئەمەش پێچەوانە نیە، دەگەل ئەو ئایەتەی دەفەرمێ:

﴿إِلاَّ مَا شَاءَ رَبُّكَ: بێجگە لەوەی پەروەردگارت دەیەوێ﴾)[2].

هەروەها ڕاڤەکاری طەحاوی جیاڕایی پێشینانی لەبارەی ئەم هەڵاوێرد(استثناء)انە باسکردوەو دەڵێ: ( پێشینەکانیش لەم هەڵاوێردانە جیاڕان، گوترا: واتای وایە تەنیا بێجگە لە ماوەی مانەوەیان لەدۆزەخ، ئەمە بۆ ئەوانە دەبێ کە

---

[1] بگەڕێوە بۆ : شرح الطحاوية :ص٤٨٠

[2] شرح الطحاوية :ص٤٨١

چونەتە دۆزەخ و پاشان لێی هاتونە دەرێ، نەك بۆ هەموویان، وەگوترا: بێجگە لە ماوەی ڕاوەستانیان لە ویستگەی قیامەتێ، وەگوترا: بێجگە لە ماوەی مانەوەیان لە گۆڕەکان و لە ویستگەی قیامەتێ. گوترا: ئەوە هەڵاویردانی پەروەردگارە و ئەنجامی نادا، هەروەك تۆ دەڵێی: سوێند بی بەخوا لێت دەدەم مەگەر رام بگۆڕێ، تۆش رات ناگۆڕێ و بڕیار دەدەی لێیدەی؛ گوترا: (الاّ) بەمانای ( واو) دێ ئەمەش بەپێی بۆچونی و رای هەندێك زمانەوانان، کە بۆچونێکی لاوازە، سیبەوی دەڵێ: (إلاّ) مانای (لكن) دەگەیەنێو دەرهاویشتنەکە گردەبڕە، ئیبنی جەریریش ئەمە پەسەند دەکاو دەڵێ: خودای بەرز لەبەڵێنی خۆی لانادا، هەڵاویردانەکەشی گەیاندوە کە دەفەرمێ: ﴿عَطَاءً غَيْرَ مَجْذُوذٍ: بەخششێکە نابڕێتەوە﴾ دەڵێن: هاوشێوەی ئەوەیە کە بڵێی: ساڵێك لە ماڵی خۆم نیشتەجێ کردی، بێجگە لەو ماوەیەی خۆم دەمەوێ، بەلاّم ( ئەوەی دەمەوێ) لێرە زیادەیە لەسەری، وەگوتراوە: ئەم هەڵاوێردانە بۆ ئەوەی تا پێیان رابگەیەنرێ لەگەڵ نەمری و هەمیشەییان. دەکەونە بەرویستی خودا، چونکە کەس لەویستی خودا دەرناچێ، ئەمەش تێك ناگیرێ لەگەڵ بڕیاری نەمری و هەمیشەیی بونیان لەلایەن خوداوە، هەروەك خودا دەفەرمێ:

﴿وَلَئِنْ شِئْنَا لَنَذْهَبَنَّ بِالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ ثُمَّ لاَ تَجِدُ لَكَ بِهِ عَلَيْنَا وَكِيلاً: ئەگەر بمانەوێ، بەراستی ئەوەی بۆ تۆمان نیگا کردوە، لێتی وەردەگرینەوە، لەپاشان کەست دەسناکەوێ کە بەرگریت لێ بکا﴾الاسراء:٨٦. هەروەها دەفەرمێ:

﴿فَإِنْ يَشَأِ اللَّهُ يَخْتِمْ عَلَى قَلْبِكَ: جا ئەگەر خوا بیەوێ مۆر لەسەر دڵت دەدا﴾الشورى:٢٤، دەفەرمێ:

﴿قُلْ لَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا تَلَوْتُهُ عَلَيْكُمْ وَلاَ أَدْرَاكُمْ بِهِ: بڵێ: ئەگەر خوا بیویستایە من ئەم قورئانەم بەسەرتاندا نەدەخوێندەوەو لەسەر زمانی من فێری نەدەکردن﴾یونس:١٦.

هاوکوفی ئەمەش زۆرە، خودای بەرز بەبەندەکانی رادەگەیەنێ کە هەمو کاروبارێك لەبەر ویستی ویدایە؛ ئەوەی بیەوێ دەبێو، هەرچی نەیەوێ نابێ.

گوتراوە: (ما) بەواتای ( من) دێ واتە؛ بێجگە لەوانەی خودا دەیەوێ بەهۆی

تاوانەکانیان بچنە دۆزەخ، لەبەختەوەران، شتی دیکەش گوتراوە.

هەرچۆنێك بێ، ئەم هەڵاوێردانە موتەشابیهە، کە دەفەرمێ:

﴿عَطَاءً غَيْرَ مَجْذُوذٍ: بەخششێکی لەبن نەهاتو و نەبڕاوەیە﴾هود:١٠٨.

هەروەها دەفەرمێ: ﴿إِنَّ هَذَا لَرِزْقُنَا مَا لَهُ مِنْ نَفَادٍ: بەڕاستی ئەمە ڕۆزی ئێمەیەو دوابڕانی بۆ نیە﴾ص:٥٤.

وەدەفەرمێ: ﴿أُكُلُهَا دَائِمٌ وَظِلُّهَا: میوەو سیبەری ئەو درەخت و باخانە هەمیشەییە﴾الرعد:٣٥.

خودای مەزنیش لەچەند شوێنێکی قورئاندا بەهەمیشەیی جەختی لەسەر نەمری خەڵکی بەهەشتێ کردوە، رایگەیاندوە کە ئەوان:

﴿لاَ يَذُوقُونَ فِيهَا الْمَوْتَ إِلاَّ الْمَوْتَةَ الأُولَى: بێجگە لە مردنی یەکەمی دنیا چ مەرگی دی ناچێژن﴾الدخان:٥٦.

ئەم هەڵاویردانەش گردەبڕ(منقطع)ەو، ئەگەر بیدەینە پاڵ ئەو هەڵاویردانەی کە خوا دەفەرمێ:

﴿إِلاَّ مَا شَاءَ رَبُّكَ: بێجگە لەوەی پەروەردگارت دەیەوێ﴾ هود:١٠٨.

دەردەکەوێ کە مەبەست لەهەردو ئایەتەکان هەڵاویردانی ئەو کاتەیە کە تێیدا لەبەهەشت نەبون لەتێکڕای ماوەی نەمری و جاویدانیدا. وەك هەڵاویردانی مردنی یەکەم لەتیکڕای مردن، چونکە ئەویان مردنێکەو پێش ژیانی هەمیشەییان دەکەوێ، ئەمەش جوداییەکە لەبەهەشت وەپێش نەمریان تێیدا دەکەوێ)[1].

---

[1] شرح العقيدة الطحاوية/ ٤٨١.

## بەندی سێیەم

## سیفەتی بەهەشت

### جێباسی یەکەم

### بەهەشت هاوشێوەی نیە

بەهەرەو نازی بەهەشت لەسەروی هەمو وەسفێکەو، خەیاڵ لەئاستی دەستەوەستانەو، هاوشیوەیەکی نیە خەڵکی دنیا پێی بزانن، هەرچەند پێشکەون و باڵاش بن، ئەو بەهرانەی کە دەیگەنێ چ نیە لەچاو بەهرەو نازی قیامەتێ، بەهەشتی خوا بێ وێنەیە. لەهەندێك فەرمودان هاتوە: (بەهەشتی خوا روناهیەکە پرشنگ دەداو، رێحانێکە دەشنێتەوەو، کۆشکێکی دامەزراوەو، روبارێکی ژاوەڕۆیەو، میوەیەکی پێگەییوەو، ژنێکی جوان و نازدارەو، خشڵێکی زۆرو زەبەندە، لەنێو ئارامگایەکی هەمیشەییدا، لە نێو بەهرەو بریقەو نازو ئاسودەییەکی بەردەوام، لەتەلاری باڵاو دروست وڕازاوە)[1].

هاوەڵان (ڕەزای خوایان لێبێ) لەبارەی بنیاتی بەهەشت، پرسیاریان لە پێغەمبەرﷺ کرد، لەوەرامدا وەسفێکی بەرگوێچکە خستین واق وڕمێن وسەرسوڕهێنە، لەبارەی بنیاتی بەهەشت فەرموی:

((لبنة من ذهب، ولبنة من فضة، وملاطها المسك الأذفر، وحصباؤها اللؤلؤ والياقوت، وتربتها الزعفران، من يدخلها ينعم ولا يبأس، ويخلد ولا يموت، ولا يبلى ثيابهم، ولا يفنى شبابهم: خشتێکی لەزێڕەو، خشتێکی لەزیوەو، لەنێوان هەر دو خشتانیش میسکی هەرە بۆن

---

[1] ئەمە دەقی فەرمودەیەکە ئیبنو ماجە لە سونەنەکەیدا: کتاب التوحيد، باب صفة الجنة؛ (٢/١٤٤٨) ژمارە ٤٣٣٢ هێناویەتەوە. بەڵام ئێمە نەماندا پاڵ پێغەمبەر ﷺ چونکە قسەیەك لەسەنەدەکەیدا هەیە، هەرچەندە ئیبنی حیبان لەصەحیحەکەیدا هاوردویە، ماناکەشی جوانە پاڵپشتی لە دەقەکانی قورئان و فەرمودەدا هەن.

خۆشـه، ورده بەردەکانیشـی مـرواری و دوڕن و، خۆڵەکـەی زەعفەرانـە، هــەر کەســی بچێتە ناوی لەخۆشییەو ناخۆشـی نابینـێو غـەمگین نابـێ و، هـەر زینـدوەو نـامرێ و، پۆشـاکیان نـاڕزێ و کـۆن نابـێ و، جحێلیـان بەسـەر ناچـێ))[1]، خـوای بـەرز راسـتـی فەرموە:

﴿وَإِذَا رَأَيْتَ ثَمَّ رَأَيْتَ نَعِيمًا وَمُلْكًا كَبِيرًا: کاتێك تەماشـاکەی لـەوێ خۆشـیو موڵکیکی گەورە دەبینی﴾الانسان: ٢٠.

ئەوی خودای کاربـەجێش لەئێمـەی وەشـاردوە لەنیعمەتـەکانی بەهەشـت شـتێکی مەزنەو عەقڵ پەی پێنـاباو، بیرناگاتە راستەقانیەکەی:

﴿فَلاَ تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا أُخْفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ: جا هیچ کەس نازانێ چ پاداشتێکی مـەزنیان بـۆ شـاردراوەتەوە کەمایـەی رونـاکی چـاو و دڵـە، ئەمە پاداشتی ئەو کردەوانەیە کە ئەنجامیان داوە﴾السجدة: ١٧.

ئەبو هورەیرە دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرموی: ((قال الله أعددت لعبادي الصالحين ما لا عين رأت ولا أذن سمعت ولا خطر على قلب بشر، فاقرؤوا إن شئتم ﴿فَلاَ تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا أُخْفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ﴾: خـوای گـەورە دەفـەرموێ: شـتی وام بـۆ بـەندە چاکەکانی خـۆم ئامادەکردوە، کە نەچاوێك دیتبیو ، نەگوێیـەك بیستبیو، نەبەدڵی کەسێکدا هاتوە، ئەگەر حەز دەکەن ئەم ئایەتە پیرۆزە وەخوێنن ﴿فَلاَ تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا أُخْفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ﴾السجدة: ١٧))[2].

هەروەها لەهەندێك رێگەوە لەلای موسلیم لەئەبو هورەیرە هاتوە:

((أعددت لعبادي الصالحين ما لا عين رأت ولا أذن سمعت ولا خطر على قلب بشر ذخـرا، بله ما أطلعكم الله عليه ثم قرأ ﴿فَلاَ تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا أُخْفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ﴾: شتی وام بـۆ بـەندە چاکەکانی خـۆم ئامادە کـردوە و حەشـارداوە نـە چـاوێك دیتیتـیو، نەگوێیـەك بیستیتیو، نەبەسەر دڵی مرۆڤێك داهاتوە. جا لـەوەی گـەڕێ کە بۆ بـەندەکانی خـۆی

---

[1] رواه احمد والترمذي والدارمي، انظر مشكاة المصابيح: (٣/٨٩) وهو صحيح بطرقه كما أشار الى ذلك محقق المشكاة.
[2] رواه البخاري في صحيحه، كتاب بدء الخلق، باب ما جاء في صفة الجنة، فتح الباري: (٦/٣١٨).

**باسکردوە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە** ﴿فَلاَ تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا أُخْفِيَ لَـــهُمْ مِـــنْ قُـــرَّةِ أَعْيُنٍ﴾))[1].

**هەروەها سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی دەڵێ: لەکۆڕێکی پێغەمبەرﷺ دانیشتم کەباسی بەهەشتی تێدا دەفەرمو، هەتا تەواو بو، ئەوجا لەکۆتایی فەرمودەکەی، فەرموی:**

((فيها ما لا عين رأت، ولا اذن سمعت، ولا خطر على قلب بشر: **خۆشی وا لە بەهەشتێ هەیە، نەچاوێك دیتیتی،و نەگوێیەك بیستیتی،و ، نەبەسەر دڵی کەسێکدا هاتوە)).**

**ئەوجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە:** ﴿تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنْ الْمَضَاجِعِ يَدْعُـــونَ رَبَّـــهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ، فَلاَ تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا أُخْفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَـزَاءً بِمَـا كَـانُوا يَعْمَلُـونَ: **کەلەکەیان لەنوینەکانیان بەردەدەن ورادەپەڕن و ڕو دەکەنە دەرگای خواو شەونوێژ دەکەن. بەترس و تەماوە داوا لە خوای پەروەردگاریان دەکەن و لەو ڕۆزیەی کە پێمان داون دەیبەخشن. هیچ کەسێکیش نازانێ چ پاداشیکی مەزنیان بۆ حەشاردراوە کە مایەی ڕوناهی چاو و دڵە لەپای ئەو کردەوانەی ئەنجامیان داوە**﴾السجدة:١٦-١٧.[2]

---

[1] رواه مسلم في صحيحه في كتاب الجنة و صفة نعيم اهلها: (٢/٢١٧٤) ورقم الحديث: ٢٨٢٤.

[2] رواه مسلم حديث رقم : ٢٨٢٤

## جیباسی دووەم

### دەروازەکانی بەهەشت

**بەهەشت چەند دەروازەیەکی هەن، بڕواداران و فریشتانی پێدا دەچنە ژور** ﴿جَنَّاتِ عَدْنٍ مُفَتَّحَةً لَهُمُ الأَبْـوَابُ: **باخەکانی بەهەشتی بەرین کە دەروازەکانیان بۆ ئەوان ئاوەڵایە**﴾ص: ٥٠.

﴿وَالْمَلائِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِمْ مِنْ كُلِّ بَابٍ، سَلاَمٌ عَلَيْكُمْ بِمَا صَـبَرْتُمْ فَنِعْـمَ عُقْبَـى الـدَّارِ: **فریشتەکان لەهەمو دەروازەکانەوە دێنە لایان. پێیان دەڵێن: سڵاوتان لێبێ بەوەی کە ئارامتان گرت. جا چەند جوانە سەرەنجامی چاکی ئەودنیا**﴾ الرعد:٢٣-٢٤.

**خودای بەرزو کاربەجێ پێی راگەیاندوین کە ئەو دەروازانە ئەو دەمی ئاوەڵا دەکرێن کە بڕواداران دەگەنە جێ‌و، فریشتەکان سڵاوی بەسەلامەتی گەیشتنیان لێ دەکەن:**

﴿حَتَّى إِذَا جَاءُوهَا وَفُتِحَتْ أَبْوَابُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا سَلاَمٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ فَادْخُلُوهَـا خَـالِدِينَ: **تا کاتێك دەگەنە ئەوێ دەروازەکانی بەهەشتیان بۆ ئاوەڵادەکرێ و دەروازەوانان بەوان دەڵێن: سڵاوتان لێبێ کە پاك بون، جا بڕۆنە نێو بەهەشت و بەنەمری بۆ هەمیشە تێیدا بمێننەوە**﴾ الزمر:٧٣.

**ژمارەی دەروازەکانی بەهەشت هەشتە، یەکێکیان نێوی (ڕەییان-تێراو)ـە کە تایبەتە بەڕۆژوەوان. هەروەك لەهەردو صەحیحان لەسەهلی سەعد هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:**

((في الجنة ثمانية ابواب، باب منها يسمى الريان، لا يدخله الاّ الصائمون، فإذا دخلوا أغلـق فلـم يدخـل غـيرهم: **بەهەشت هەشت دەروازەی هەن، یەکێکیان نێوی ڕەییانە، لەڕۆژوەوان بترازێ کەسی پێدا ناچێتە ژور، کە ئەوان هەمو چونە ژور، بەسەریاندا**

دادەخرێو کەسی دی پێدا ڕەت نابێ))[1].

دەروازەیەکی دیش هەیە تایبەت بەوانەی زۆر نوێژان دەکەن، دەروازەیەکی خێرومەندان، دەروازەیەکی موجاهیدانیش دەرگای دیکەن لەبەهەشت جیا لەدەرگای بەڕۆژوان، کەنێوی نراوە ڕەییان، ئەبو هورەیرە دەڵێ : پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((من أنفق زوجين في سبيل الله من ماله، دعي من ابواب الجنة، وللجنة ثمانية أبواب، فمن كان من أهل الصلاة دعي من باب الصلاة، ومن كان من أهل الصدقة دعي من باب الصدقة، ومـــــن كان من أهل الجهاد دعي من باب الجهاد، ومن كان من أهل الصيام دعي من باب الصيـــام: هەر کەسێکی جوتێکی لەماڵی خۆی لەڕێی خودا بەخشی، لەدەروازەکانی بەهەشتێرا بانگی دەکرێ، بەهەشتیش هەشت دەروازەی هەن، جا ئەوی ئەهلی نوێژان بێ لەدەروازەی نوێژێرا بانگی دەکرێ. خێرومەند لەدەرگای خێری بانگی دەکرێ، موجاهید لەدەرگای جیهاد بانگی دەکرێ، ڕۆژوەوانیش لەدەروازەی ڕۆژوییانەوە بانگی دەکرێ)).

ئەبو بەکر گوتی: سوێند بەخوا چ زیانێکی بۆ کەسی نیە لەهەر دەروازەیەکەوە بانگی بکرێ، ئایا کەس هەیە لە هەموانڕا بانگی بکرێ، ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرموی: (نعم، وارجو ان تكون منهم: بەڵێ، تکام وایە ئەتۆش یەکێك لەوان بی)[2].

پرسیارەکەی ئەبوبکر کەسێکی گەرەك بوە هەمو چاکەکاریەکانی تێدا کۆبوبێتەوە، لەنوێژو، ڕۆژیو، خێرو، جیهادو، ئەم بابەتە، بەشێوەیەك لەتێکڕای دەروازەکانەوە بانگی بکرێ، پێغەمبەری پایەداریش ﷺ ڕایگەیاندوە، هەر کەسێکی جوتێك لەپێناو خوا ببەخشی لەهەر هەشت دەرگەی بەهەشتێ بانگی دەکرێ، ئەو هەواڵەشی پێداوین ، هەر کەسێکی دەسنوێژێکی چاك هەڵگرێ لەپاشاندا چاوەکانی بەرەو ئاسمان هەڵبڕێ و بڵێ: اشهد ان لا اله الا الله وحده لا شريك له، واشهد ان محمـــــداً عبـــده ورسوله، هەر هەشت دەروازەی بەهەشتی بۆ دەکرێنەوە کێهەی بوێ لەویانڕا دەچێتە ژور.

---

[1] النهاية لابن كثير: (٢/٢١٤).

[2] متفق عليه. النهاية لابن كثير : (٢/٢١٤).

لە عومەری خەطابەوە هاتوە دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرموی: ((مـــن توضـــأ فأحســـن الوضوء ثم رفع بصره إلى السماء، فقال؛ أشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأشــــهد أن محمدا عبده ورسوله، فتحت له أبواب الجنة الثمانية، يدخل مـــن أيـــها شـــاء: هەر کەسێکی بەپوختی دەسنوێژ هەڵگرێ، جا چاوانی بەرەو ئاسمانێ هەڵبڕێ و بڵێ: اشهد ان لا اله الا الله وحده لا شريك له، واشهد ان محمداً عبده ورسوله، هـەر هەشت دەروازەی بەهەشتی بۆ دەکرێنەوە، کامەی بوێ لەویانەوە دەچێتە ژور))[1].

هـەروەها پێغەمبـەر ﷺ پێـی راگـەیاندوین، ئـەو کەسـانەی بـەبێ حسێب دەچنـە بەهەشــت بەتــەنێ بەدەروازەیــەك تایبــەت کــراون، کـــە دەروازەی دەستەڕاســتی بەهەشتێیە، بـەڵام ئـەوانی دەمێننـەوە، لەگـەڵ ئوممـەتانی دیکـە لـەدەروازەکانی دی هاوبەشن. لەفەرمودەی شەفاعەتیشدا لە ئەبوهورەیرەوە هاتوە:

((فيقول الله: يا محمد! ادخل من لا حساب عليه من امتك من الباب الأيمن، وهـــم شـــركاء النـــاس في الأبـــواب الأخـــر: ئەوجا خـودا دەفـەرمێ: ئـەی موحەممـەد! هـەر کەسێك لەئوممەتی تۆ کە حیسابی لەسەر نیە، لـەدەروازەی دەستەڕاستی بەهەشـتی بهێنـە ژورەوە، ئەوانی دی هاوبەشی خەڵکن لە دەروازەکانی دیکە)).

ئـەوجا هـەر لـەم فـەرمودەدا باسـی فراوانـی دەروازەکـانی بەهەشتی کـردوە، ئــەوی رونکردۆتەوە کە نێوان هەردو لای هەر دەروازەیەك وەکو بەینی مەککەو هوجەرە، یا نێوان مەککەو بوصرایە، هەر لەفەرمودەکەی پێشودا هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ:

((والذي نفس محمد بيده! إن بين المصراعين من مصاريع الجنة، أو ما بين عضادتي الباب، كمـا بين مكة وهجر، او كما بـــين مكـــة وبصـــرى: سوێند بەو خوایـەی گیانی موحەممـەدی وەدەستە، نێوان هەردو کۆڵەگەی دەروازەی بەهەشت وەکو نێوان مەککەو هوجەر یا نێوان مەککەو بوصرا وایە))[2].

هــەروەها پێغەمبــەرﷺ هــەواڵی ئەوەشــی پێداویــن کــە دەروازەکـانی بەهەشــت لەڕەمــەزاندا دەکرێنــەوە، وەك لەئـەبو هورەیـرە (ڕەزای خـوای لێبـێ) هــاتوە، دەڵــێ:

---

[1] رواه مسلم في صحيحه واحمد في مسنده واهل السنن؛ النهاية لابن كثير (٢/٢١٩).
[2] المتفق عليه؛ النهاية لابن كثير: (٢/٢٢١)

**پێغەمبەرﷺ فەرموی:**

((إذا دخل شهر رمضان فتحت ابواب السماء -وفي رواية- فتحت ابواب الجنة، وغلقت ابواب النار: **کە مانگی رەمەزان داهات دەروازەکانی ئاسمان دەکرێنەوە. - لەریوایەتێکی دیکەشدا- دەروازەکانی بەهەشت ئاوەلا دەکرێن و، دەروازەکانی دۆزەخ دادەخرێن**))[1].

**لەهەندێك فەرمودانیش هاتوە کە نێوانی هەردو کۆلەگەی دەروازەکانی بەهەشت چل ساڵە ڕێیە. پێغەمبەر ﷺ فەرموی:**

((إن مابين المصراعين في الجنة مسيرة اربعين سنة، وليأتين عليه يوم، وإنه لكظيظ: **نێوان هەردو کۆڵەگەی دەروازەی بەهەشت چل ساڵە ڕێیە، ڕۆژێکیشی بەسەردادێ کە زۆر قەرەباڵغ دەبێ**))[2].

**هەروەها موسلیم و ئەحمەد لەعوقبەی کوڕی غەزوانەوە دەگێڕنەوە، دەڵێ: (باسی ئەوەی بۆ فەرموین کە نێوان هەردو کۆڵەگەی دەروازەی بەهەشت چل ساڵە ڕێیەو، ڕۆژێکی بەسەردادێ لەبەر تێکچڕژانی خەڵکی قەرەباڵغ دەبێ).**

**طەبەرانی لەموعجەمە گەورەکەیدا لەعەبدوڵلای کوڕی سەلام دەگێڕتەوە:**

((إن ما بين المصراعين في الجنة مسيرة اربعين سنة، يزاحم عليه كأزدحام الإبل وردت لخمس ظما: **نێوان دو کۆڵەگەی هەر دەروازەیەك لە بەهەشتێ چل ساڵە ڕێیە، زۆر قەرەباڵغ دەبن خەڵکیان تێدا تێك دەچرژێ وەك قەرەباڵغی ئەو حوشترانەی لەتێنوێتیان دەچنە سەر ئاوێ**))[3].

---

[1] في صحيحين ومسند احمد؛ مشكاة المصابيح: (٦١٢/١)

[2] رواه احمد في مسنده وابو نعيم في الحلية عن حكيم بن معاوية عن ابيه معاوية؛ واسناده صحيح.

[3] ئەم توێژینەوەیە کەمێك بەکورتکراوەیی لە (سلسلة الاحاديث الصحيحة للشيخ ناصر الدين الالباني): (٢٧٣/٤) ، ورقم الحديث: ١٦٩٨) وەرگیراوە.

## جیباسی سێیەم

## پایەکانی بەهەشت

### خوازگەی یەکەم

### بەڵگەکانی پایە پایەیی بەهەشت و، لێك جودایی بەهەشتنشینان لە پایەداریدا

بەهەشتی خوا پایەپایە وچین لەسەر چینە، خەڵکەکەشی بەپێی نشینگەی بەهەشتیان یەك لەیەکێ بەرزترن، خوا دەفەرمێ:

﴿وَمَنْ يَأْتِهِ مُؤْمِنًا قَدْ عَمِلَ الصَّالِحَاتِ فَأُولَئِكَ لَهُمُ الدَّرَجَاتُ الْعُلَا: هەر کەسێك بەئیمانەوە بێتە لای پەروەردگاری و کردەوەی چاکیشی ئەنجام دابی ، ئەو کەسانە پلەو پایەی زۆر بەرزیان پی دەبرێ﴾ طه:٧٥.

یەك لەوانەی ئەو باسەی رونکردۆتەوە، ئیبنی تەیمیەی شێخی ئیسلامە کە دەڵێ: (بەهەشت پلەو پایەیە و هەر یەکێکی گەلێك زۆری بەسەر ئەوی دیدا هەیە، دۆستانی بڕوادار و پاریزکاری خودای گەورەش بەگوێرەی بڕواو پارێزیان لەو چینانەدا دابەش بون. خودای بەرز دەفەرمێ:

﴿مَنْ كَانَ يُرِيدُ الْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُ فِيهَا مَا نَشَاءُ لِمَنْ نُرِيدُ ثُمَّ جَعَلْنَا لَهُ جَهَنَّمَ يَصْلَاهَا مَذْمُومًا مَدْحُورًا، وَمَنْ أَرَادَ الْآخِرَةَ وَسَعَى لَهَا سَعْيَهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُولَئِكَ كَانَ سَعْيُهُمْ مَشْكُورًا، كُلًّا نُمِدُّ هَؤُلَاءِ وَهَؤُلَاءِ مِنْ عَطَاءِ رَبِّكَ وَمَا كَانَ عَطَاءُ رَبِّكَ مَحْظُورًا، انْظُرْ كَيْفَ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَلَلْآخِرَةُ أَكْبَرُ دَرَجَاتٍ وَأَكْبَرُ تَفْضِيلًا: ئەو کەسەی تەنیا ژیانی دنیای بوێ، بەو ئەندازەی ویستمان لێبێ و هەر کەسێکی بمانەوێ پێی دەبەخشین. پاشان دەیخەینە دۆزەخ وبەسەرزەنشت کراوی بۆ وێی رادەکێشین، هەر کەسێکیش دوایینی بوێ و وەکو پێویست بۆی بکۆشێو ،

بڕواداریش بێ، ئەوان کەسـانێ پاداشـی سوپاسـکراوی تێکۆشـانیان دەدرێتـەوە، بەهەریـەك لـەو دو پێڕانـە کـە دنیـاو دوایـین خـوازن بەخشـش دەدەیـن، بەخششـی پـەروەردگارت بـۆ کـەس ڕێـی لێ نـەگیراوە، بڕوانـە چـۆن لـەدنیادا هـەندێکمان بەسـەر هـەندێکدا سەرخستوەو پایەمان بەرزکردوە. پایـەو پلـەی ڕۆژی دوایـی گـەلێك لەمـە گەورەترو بەرزترە﴾الاسراء:١٨-٢١.

جا خوای گەورە ئەوەی بۆ ئاشکرا کردوین، بەخشی خۆی بەهەردو کۆمەڵان دەدا؛ چ ئەوانی دنیاخوازن، چ ئەوانی قیامەتخواز، هەرگیز ڕێگەی بەخششی خواش نە لە چاکەکار گیراوە نە لە خراپەکار، پاشان خوای بەرز دەفەرمێ:

﴿انظُرْ كَيْفَ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَلَلآخِرَةُ أَكْبَرُ دَرَجَاتٍ وَأَكْبَرُ تَفْضِيـــلاً: دە چاو بدێ چۆن لـەدنیا هـەندێکمان بەسەر هـەندێکدا سەرخستون و پایـەو پلـەیان بـەرز کـردون، لـەدواییینیش پلـەو پایـە گـەلێك لـەوە گـەورەترەو جیـاوازی گەلـەك زۆرترە﴾الاسراء:٢١.

خـوای گـەورە ڕونـی کردۆتـەوە کـە خـەڵکی لـەئاخیرەت زیاتر لەوانی دنیایـێ لێـك جـودان و پلـەو پایـەی دوایـین لـەهی دنیـا گـەورەترە. پلـەو پایـەو لێـك جودایـی پێغەمبەرەکانیشی (سڵاوی خوایان لێبێ) وەکـو جیـاوازی نێـوان بـەندە بڕوادارەکـانی تری وایە، وەك دەفەرمێ:

﴿تِلْكَ الرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ مِنْهُمْ مَنْ كَلَّمَ اللَّهُ وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَاتٍ وَآتَيْنَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ الْبَيِّنَاتِ وَأَيَّدْنَاهُ بِرُوحِ الْقُدُسِ: ئەوانە پێغەمبەرانن پلـەو پایـەی هـەندێکیانمان لەهـەندێکیان بـەرزتر کـرد، خـودا لەگـەڵ هـەندێك لـەوان قسـەی کـردو، پایـەی هــەندێکی بـاڵاکردو، نیشـانەی ڕونمـان بەعیسـای کـوڕی مەریـەم داو، بـە ڕوحولقودس پشتیوانیمان لێکرد﴾البقرة:٢٥٣.

هەروەها دەفەرمێ: ﴿وَلَقَدْ فَضَّلْنَا بَعْضَ النَّبِيِّينَ عَلَى بَعْضٍ وَآتَيْنَـا دَاوُدَ زَبُــوراً: بەڕاستی هەندێك لەپێغەمبەرانمان بەسەر هەندێکی دیکە بەرز کردۆتـەوەو، زەبورمان بەداود بەخشی﴾الاسراء:٥٥.

لەصەحیحی موسلیم لەئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێ) لەپێغەمبەرﷺ کە فەرموی: ((المؤمن القوي خير وأحب إلى الله من المؤمن الضعيف وفي كل خير، احرص على ما ينفعك واستعن بالله ولا تعجز وإن أصابك شيء فلا تقل: لو أني فعلت لكان كذا وكذا، ولكن قل: قدر الله وما شاء فعل، فإن لو تفتح عمل الشيطان: بڕواداری بەهێز لەلای خوا چاتر و خۆشەویستترە لەبڕواداری لاواز، هەموش هەر چاکن، مکوڕبە لەسەر ئەو کارانەی سودت پێ دەگەیەنن و کۆمەکخوازی لەخوا بکەو کەنەفت مەبە، ئەگەر شتێکیشت بەسەر هات مەڵێ ئەگەر وام بکردبا ئاواو ئاوا دەبو، بەڵکو بڵێ: تەقدیری خودایەو ویستی چۆن بێ ئاوا دەکا، چونکە ئەگەر دەرگەی کاری شەیتان دەکاتەوە)).

لەهەردو صەحیحانیشدا لە ئەبو هورەیرەو عەمری عاصەوە(ڕەزای خوایان لێبێ) هاتوە لەپێغەمبەرﷺ کە فەرمویە:

((إذا اجتهد الحاكم فأصاب فله اجران، وإذا اجتهد فأخطأ فله اجر: گەر فەرمانڕەوا بکۆشی و بپێکێ دو پاداش و ڕێزانەی هەیە، خۆ ئەگەر هاتو نەیپێکا هەر پاداشێکی هەیە))، خودای بەرزیش دەفەرمێ:

﴿ لاَ يَسْتَوِي مِنكُمْ مَنْ أَنْفَقَ مِنْ قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ أُولَئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِنْ الَّذِينَ أَنْفَقُوا مِنْ بَعْدُ وَقَاتَلُوا وَكُلاً وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَى: ئەو کەسانەی لە پێش گرتنی مەککەدا ماڵی خۆیان بەخت کرد و دەگژ نەیارەکان ڕاچون، پایەی هەرەبەرزیان هەیە؛ دەگەڵ ئەو کەسە وەك یەك نین کە لە پاشان ماڵی خۆی بەخت کردوەو دەگژ دوژمنان ڕاچوە. کە هەموشیان خودا بەڵێنی پێداون چاکەیان دەربارەی دەکا﴾الحديد: ١٠.

دەفەرمێ: ﴿لاَ يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُوْلِي الضَّرَرِ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ عَلَى الْقَاعِدِينَ دَرَجَةً وَكُلاً وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَى وَفَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا، دَرَجَاتٍ مِنْهُ وَمَغْفِرَةً وَرَحْمَةً وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَحِيمًا: کەسانێك لەبڕواداران کەبێ نەخۆشی و نارەحەتی دەستیان لەجیهاد هەڵگرتوەو دانیشتون، یەکسان و وەك یەك نین لەگەڵ موجاهیدانێك کە بەماڵ و گیانی خۆیان لەڕێگەی خوادا دەکۆشن، بەڵکو

خوا پایەو پلەی کەسانێکی کە بەماڵ و گیان تێدەکۆشن، بەرزکردۆتەوە بەسەر ئەوانەی لەماڵێ خزیون و دانیشتون، وەخودا بەڵێنی چاکی بەهەموان داوە، بەڵام بەپاداشتی مەزن پلەو پایەی موجاهیدانی بەسەر دانیشتوان بەرزکردۆتەوە. پلەو پایەو لێخۆشبون وبەرزیی لای خۆیەتیو خودا لێبوردە و میهرەبانە﴾النساء:٩٥-٩٦.

دیسان خوای بەرز دەفەرمێ: ﴿أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ الْحَاجِّ وَعِمَارَةَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ كَمَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَجَاهَدَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ لاَ يَسْتَوُونَ عِنْدَ اللَّهِ وَاللَّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ، الَّذِينَ آمَنُوا وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ أَعْظَمُ دَرَجَةً عِنْدَ اللَّهِ وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْفَائِزُونَ، يُبَشِّرُهُمْ رَبُّهُمْ بِرَحْمَةٍ مِنْهُ وَرِضْوَانٍ وَجَنَّاتٍ لَهُمْ فِيهَا نَعِيمٌ مُقِيمٌ، خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا إِنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ أَجْرٌ عَظِيمٌ: ئایا ئاودانی حاجییان و ئاوەدانکردنەوەی مەسجیدولحەرامیان وەکو کەسێك داناوە کە بڕوای بەخواو ڕۆژی قیامەتێ هێناوەو لەرێگای خوادا جیهادی کردوە، ئەم دوانە لای خودا بەرابەر نین، و خودا تاقمی ستەمکاران هیدایەت نادا. ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کوچیان کردوەو بەماڵ و گیانیان لەرێگەی خوادا جیهادیان کردوە، لای خوا پلەیان بەرزترەو، سەرکەوتوان هەر ئەوانن. پەروەردگاریان بەرەحمەتێکی لای خۆیو بەڕازی بون و بەهەشتێك کە خۆشی و بەهرەی بێ بڕانەوەی تێدا، مزگێنیان دەداتێ، هەمیشە تێیدا دەمێننەوە، بەراستی پاداشی مەزن لای خودا هەیە﴾ التوبة:١٩-٢٢.

هەروەها دەفەرموێ : ﴿أَمَّنْ هُوَ قَانِتٌ آنَاءَ اللَّيْلِ سَاجِدًا وَقَائِمًا يَحْذَرُ الآخِرَةَ وَيَرْجُو رَحْمَةَ رَبِّهِ قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لاَ يَعْلَمُونَ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُوا الأَلْبَابِ: ئایا کەسێك کە شەوگاران ڕو بەخودا ڕاوەستاوەو سوژدە دەبا و بەرفەرمانەو لە ڕۆژی قیامەتی دەترسێ و هیوای وایە بەر بەزەیی پەروەردگاری خۆی بکەوێ، وەکو یەکە؟ بڵێ: ئاخۆ زاناو نەزان بەرانبەرن؟ هەر ئەوانەی بە دڵ زیندون دەتوانن بیر بکەنەوە﴾الزمر:٩.

دیسان دەفەرمێ: ﴿ يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ: ئەوانەی بڕوایان هێناوەو ئەو کەسانەی زانستیان پێ دراوە، خودا

پلەیان دەباتە سەرێ. و خودا بە کردەوەکانتان زاناو ئاگایە﴾المجادلة: ١١)[1].

ئەبو هورەیرە(رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((من آمن بالله وبرسوله وأقام الصلاة وصام رمضان كان حقا على الله أن يدخله الجنة جاهد في سبيل الله أو جلس في أرضه التي ولد فيها، فقالوا: يا رسول الله أفلا نبشر الناس؟ قال: إن في الجنة مائة درجة أعدها الله للمجاهدين في سبيل الله ما بين الدرجتين كما بين السماء والأرض، فإذا سألتم الله فاسألوه الفردوس فإنه أوسط الجنة وأعلى الجنة وفوقه عرش الرحمن ومنه تفجر أنهار الجنة: هەر کەسێکی بڕوای بەخوداو بەپێغەمبەرەکەی هێنابێ و نوێژی کردبێ و ڕۆژی رەمەزانی گرتبێ، مافێکە لەسەر خوا بیباتە بەهەشت، جا لەرێی خوا جیهادی کردبێ، یا هەر لەو خاکە دانیشتبێ کە تێیدا لەدایك بوە. گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەدی موژدە نەدەینە خەڵکی؟ فەرموی: سەد پایە لەبەهەشت هەیە خودا بۆ موجاهیدانی رێی خودای ئامادە کردوە، نێوان هەر دو لەو چینانە وەك نێوان زەویو عاسمانە، جا کە داوا لەخوا دەکەن، داوای فیردەوسی لێ بکەن، چونکە ئەوێ ناوەندی بەهەشت و بەرزترین جێی بەهەشتەو، عەرشی خوای بەرزی لەسەرەو، ڕوبارەکانی بەهەشتیش هەر لەوێوە هەڵدەقوڵێن))[2].

لەئەنەسەوە هاتوە کە رۆژێك دایکی حاریثە هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، حاریثەیش لەرۆژی بەدر بەتیرێك پێکرابو کە کەس نەیزانی کێ هاویشتویەتی، شەهید ببو، گوتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ، تۆ دەزانی کە حاریثە لەدڵمدا کوێی گرتبو، جا ئەگەر لەبەهەشتێ بێ، بۆی ناگریم، ئەگەریش نا، دەبینی من چی بۆ دەکەم، پێغەمبەرﷺ پێی فەرمو:

((أجنة واحدة هي؟ إنها جنان كثيرة، وإنه في الفردوس الأعلى: بۆ تەنها هەر بەهەشتێکە؟ بەڵکو بەهەشتگەلێکی زۆرەو، حاریثە لەفیردەوسی هەرە بەرزو بالآیە))[3].

پێغەمبەرﷺ ئەوەشی رونکردۆتەوە کە بەهەشتیەکانی لەپلەو پایەدا بەپێی جێ

---

[1] مجموع فتاوي شيخ الاسلام: (١٨٨/١١)

[2] رواه البخاري في صحيحه؛ كتاب الجهاد، باب درجات المجاهدين في سبيل الله؛ فتح الباري: (١١/٦).

[3] صحيح البخاري، كتاب الرقاق، باب صفة الجنة والنار؛ فتح الباري: (٤١٨/١١).

وشوێنیان لەبەهەشت لێکدی جودان، هەروەك لەئەبوسەعیدی خودری هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((إن أهل الجنة يتراءون أهل الغرف من فوقهم كما يتراءون الكوكب الدري الغابر في الأفق من المشرق أو المغرب، لتفاضل ما بينهم: بەهەشتیەکان کۆشك نشینەکانی سەرو خۆیان وەکو ئەستێرەیەکی پڕشنگداری تازە هەڵاتو لەئاسۆی ڕۆژهەڵات یا ئاوابو لە ڕۆژئاوا دەبینن، لەبەر جودایی پلەو پایەیان)).

گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوە نشینگەی پێغەمبەرانە کەسی دیان ناگاتێ؟

فەرموی: ((بلى والذي نفسي بيده رجال آمنوا بالله وصدقوا المرسلين: بەڵێ، سوێند بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە، پیاوانێك دەگەنە وێ بڕوایان بەخودا هێنابێ و پێغەمبەرانیان بەڕاست دانابێ)).[1]

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ: ((إن أهل الدرجات العلى يراهم من هو أسفل منهم كما ترون الكوكب الطالع في أفق السماء، وإن أبا بكر وعمر منهم وأنعما: چۆن ئێوە ئەستێرەی هەڵاتو لەئاسۆی ئاسماندا دەبینن، دانیشتوی پایەبەرزی بەهەشت بەو شێوەیە لەلایەن ئەوانی خوار خۆیان دەبینرێن، بێگومان ئەبوبەکر و عومەریش لەوانن و خۆشی لەخۆیان)).[2]

قورطوبی دەڵێ: (ئەو هۆدانە لەبەرزی و لەشێوەیاندا بەپێی جیاوازی کردەوەی خاوەنانیان لێکدی جودان، جا هەندێکیان لەهەندێکی بەرزتر و باڵاترن).

هەروەها کە پێغەمبەرﷺ دەفەرمێ: (سوێند بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە پیاوانێك دەگەنە وێ بڕوایان بەخوا هێنابێ و پێغەمبەرانیان بەڕاست دانابێ) و باسی کردەوەی نەفەرموە بێجگە لەبڕواهێنان و بەڕاست دانانی پێغەمبەران. دەبێ بزانرێ مەبەستی بڕوای کامڵ و بەڕاست دانانی پێغەمبەرانە بێ داواکردنی موجیزەو بێ

---

[1] صحيح البخاري، كتاب بدء الخلق، باب صفة الجنة والنار؛ فتح الباري: (٦/٢٢٠) وصحيح مسلم، كتاب الجنة، باب ترائي اهل الجنة اهل الغرف؛ (٤/٢١٧٧) ورقمه ٢٨٣١.

[2] في مسند احمد وسنن الترمذي وسنن ابن ماجه وصحيح ابن حبان عن ابي سعيد؛ صحيح جامع الصغير؛ (٢/١٨٧) ورقمه ٢٠٢٦.

دودڵیکردن، دەنا چۆن هۆدەکان بەبڕواو بەراست زانینی ڕەشۆکی وەدەست دێ، ئەگەر بەم جۆرەش بوایە ئەوا تێکڕای تاکپەرستان لەهۆدە هەرە بەرزەکان و پایە هەرە باڵاکاندا دەبون، ئەمەش مەحاڵە، خودای بەرزیش فەرمویەتی:

﴿أُولَئِكَ يُجْزَوْنَ الْغُرْفَةَ بِمَا صَبَرُوا: ئەوانەن بەهۆی ئارام گرتنیان هۆدە هەرە بەرزەکانی بەهەشتیان پێ دەدرێ﴾ الفرقان:٧٥.

ئارامیش خۆبەخشین و چەسپان و ڕاوەستانە لەبەر دەستی پەروەردگار بەدڵی بەندەکارانەوە. ئەمەش سیفەتی نێزیکانە. لەئایەتێکی تریشدا دەفەرمێ:

﴿وَمَا أَمْوَالُكُمْ وَلاَ أَوْلاَدُكُمْ بِالَّتِي تُقَرِّبُكُمْ عِنْدَنَا زُلْفَى إِلاَّ مَنْ آمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا فَأُوْلَئِكَ لَهُمْ جَزَاءُ الضِّعْفِ بِمَا عَمِلُوا وَهُمْ فِي الْغُرُفَاتِ آمِنُونَ: ماڵو منداڵی ئێوە قەت نابنە هۆی نێزیك بونەوەتان لەئێمە. مەگەر ئەوانەی بڕوا بێنن و کاری چاك ئەنجام بدەن، ئەوانەش پاداش و ڕێزانەی دو چەندانەیان هەیە، لەپای ئەو کارانەی کردویانەو، ئەوانە لەهۆدەگەلێکی بەهەشتێ لەهێمنایی دان﴾ سبأ:٣٧. لێرەدا باسی هۆدە هاتوە کە بەهۆی ماڵ و منداڵانەوە دەس ناکەوێ، بەڵکو بەبڕواو کردەی چاك دێتە دەست. پاشان ئەوەی ڕونکردۆتەوە کە پاداشتیان دو چەندانەیەو شوێنیان هۆدە بەرزەکانە، ئەمەش وا دەگەیەنێ کە ئەو بڕوایە دەڕون ئارامیەو دڵی پێوە پەیوەستە. لەهەمو بەسەرهاتێك و هەمو کارو حوکمێکدا دڵارامی دایدەگرێ. جا ئەگەر کردەوەیەکی چاکی ئەنجام دا، بە دژێك تێکەڵی ناکا کە کردەوەیەکی گەندە. جا ئەو کردەوە چاکەی پاکە لەماك و پەڵەی گەندی هەر دەگەڵ بڕوایەکی تەواودا دەبێ کە خاوەنەکەی دڵی ئارام بێ بەوەی باوەڕی پێ هێناوە لەگەڵ فەرمان و داوەریەکانی، ئەوەی تێکەڵ و پێکەڵیش دەکا نەبڕوای نە کردەوەی وانیە، بۆیەشە نشینگەی لەخوار ئەوانی دیە)[١].

خاوەنی پایەبەرزەکان لەخۆشیەکی باڵاتردا دەبن لەوانی خوارە خۆیان، خودای بەرز ڕایگەیاندوە دو بەهەشتی بۆ ئەوانە حازر کردوە کەلێی دەترسێن:

---

[١] التذكرة للقرطبي/ ص٤٦٤

﴿وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ جَنَّتَانِ: بۆ هەر کەسیش لە پەروەردگاری ترساوە، دو باغ هەیە﴾ الرحمن:٤٦.

جا وەسفی ئەو دو بەهەشتەشی فەرموە، پاشان دەفەرمێ:

﴿وَمِنْ دُونِهِمَا جَنَّتَانِ: دو بەهەشتی تریش لە خوار ئەواندا هەن﴾ الرحمن:٦٢.

کە لەپلەو پایە لەژێرترن، هەر کەسێکی لەباس و خواسی ئەو دو بەهەشتەی رامێنێ کە خودا لەدوایی باسی کردون، دەزانێ لەژێرترن لەچاو ئەوانی یەکەمین، دو بەهەشتەکەی یەکەمین بۆ نێزیکخراوەکانن، دوەکەی تر لەبۆ دەستەی دەستەڕاستەکانن.

هەروەکو ئیبنی عەبباس و ئەبو موسای ئەشعەریش هەروەها دەڵێن[1]. قورطوبی دەڵێ: (کاتێك قورئان وەسفی هەردو بەهەشتانی فەرموە، ئاماژەی بە جیاوازی نێوانیان کردوە، لەبارەی دوی یەکەم دەفەرمێ:

﴿فِيهِمَا عَيْنَانِ تَجْرِيَانِ: دو سەرچاوەی ڕەوانی تێدایە﴾الرحمن:٥٠.

لەبارەی ئەوانی دوامینیش دەفەرمێ:

﴿فِيهِمَا عَيْنَانِ نَضَّاخَتَانِ: دو کانیاویان تێدا ئاویان لێ هەڵدەقوڵێ﴾ الرحمن:٦٦.

بەڵام وەك دو سەرچاوە ڕەوانەکان نین چونکە هەڵقوڵان وەك ڕۆیشتنێ نیە، هەروەها لەبارەی دوی یەکەم دەفەرمێ:

﴿فِيهِمَا مِنْ كُلِّ فَاكِهَةٍ زَوْجَانِ: لەهەر جۆرە میوەیەك جوتێکی تێدا﴾الرحمن:٥٢.

واتە: ناسراو و نامۆ و، تەڕو وشك، بە گشتی باسی فەرمون و، شتێکی تایبەت نەکردوە، بۆ دوەکەی دیکەش دەفەرمێ:

﴿فِيهِمَا فَاكِهَةٌ وَنَخْلٌ وَرُمَّانٌ: میوەو خورماو هەناریان تێدایە﴾الرحمن:٦٨

نەیفەرموە لەهەر جۆرە میوەیەك جوتێکی تێدایە، هەروەك لەبارەی ئەوانی یەکەم دەفەرمێ:

---

[1] التذكرة للقرطبي / ٤٤٠

﴿مُتَّكِئِينَ عَلَى فُرُشٍ بَطَائِنُهَا مِنْ إِسْتَبْرَقٍ: لەسەر فەرشگەلێك پاڵیان داوەتەوە، ناواخنەکانیان پارچە ئاوریشمی ئەستور (دیباج)ە﴾الرحمن:٥٤.

کەچی لەبارەی دوانەی دی دەفەرمێ:

﴿مُتَّكِئِينَ عَلَى رَفْرَفٍ خُضْرٍ وَعَبْقَرِيٍّ حِسَانٍ: پاڵیان بەسەرینگەلێکی سەوز داوەتەوە، بەباشترین پارچەی رەنگین و نەخشین پۆشراون﴾الرحمن:٧٦.

ئاشکرایە پارچەی ئاوریشم لە پارچەی گوڵدارو رەنگین بالاترەو، فەرشی ئامادەکراو بۆ پاڵکەوتنیش لە سەرین و بالیفی ئاسایی چاترە. دیسان لەبارەی پەریە چاو بەلەکەکانی ئەوانی یەکەم دەفەرمێ:

﴿كَأَنَّهُنَّ الْيَاقُوتُ وَالْمَرْجَانُ: هەروەکو یاقوت و مەرجانن﴾ الرحمن:٥٨.

لەوانی دواییش ﴿فِيهِنَّ خَيْرَاتٌ حِسَانٌ: ژنانی خوچاك و جوان چاك لەوێ هەن﴾الرحمن:٧٠.

بەلام هەمو جوانیەك ناگاتە جوانی دوڕو مەرجان. لەبارەی ئەوانی یەکەم دەفەرمێ:

﴿ذَوَاتَا أَفْنَانٍ: دوباخی چڕو پڕ لەهەمو جۆرە دارێك﴾الرحمن:٤٨.

بۆ ئەوانی دی: ﴿مُدْهَامَّتَانِ: دو باخی هێند سەوزن، رەش دەنوێنن﴾الرحمن:٦٤.

جا یەکەم بەچڕوپڕی باسکراون و ئەوانی دیکە تەنها بەسەوزی)[1].

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ: ((جنتان من فضة، آنيتهما وما فيهما وجنتان من ذهب آنيتهما وما فيهما، وما بين القوم وبين أن ينظروا إلى ربهم إلا رداء الكبرياء على وجهه في جنة عدن: دو بەهەشت لەزیون، دەفرەکانیان و ئەوانی تێیاندایە، دو بەهەشتیش لەزێڕن. دەفرەکانیان و ئەوانی تێیاندایە، لەنێوان خەڵکەکەو پەروەردگاریان تەنیا پۆشاکی مەزنێتی هەیە کە ببینن لەبەهەشتەکانی عەدن دا))[2].

---

[1] التذكرة للقرطبي / ص٤٤٠

[2] في صحيحي البخارى ومسلم عن ابي موسى الاشعري؛ جامع الاصول: (٤٩٨/١٠) ورقمه: ٨٠٢٩.

لەگێڕانەوەیەکی تیرمیذیش هاتوە: ((ان في الجنة جنتين من فضــــة...: لە بەهەشت دو بەهەشتی زیو هەیە))، جا فەرمودەکەی تەواو کردوە[1].

هەروەها خودای بەرز باسی فەرموە کە چاکەکاران پەداخێکی تێکەڵ بەکافور نۆش دەکەن:

﴿إِنَّ الأَبْرَارَ يَشْرَبُونَ مِنْ كَأْسٍ كَـــانَ مِزَاجُـــهَا كَـــافُورًا: چاکان لە پەداخێکدا شەرابی تایبەت دەنۆشن کە کافوری تێکەڵاوە﴾الانسان:٥.

لە شوێنێکی تریشدا دەفەرموێ: ﴿وَيُسْقَوْنَ فِيهَا كَأْسًا كَانَ مِزَاجُـــــهَا زَنجَبِيــــلاً: لەوێدا بەکاسەیەك تێراو دەکرێن کە زەنجەفیلی تێکەڵ کراوە﴾الانسان:١٧.

وا پێدەچێ -خوداش زاناترە- لەبۆ دەستەی دەستەڕاستەکانن. لەجێیەکی دیکە دەفەرمێ:

﴿وَمِزَاجُهُ مِنْ تَسْنِيمٍ، عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا الْمُقَرَّبُـــونَ: خواردنەوەیان لەگەڵ تەسنیم تێکەڵ کراوە، ئەو کانیاوەی نێزیکانی خودا لێی دەخۆنەوە﴾المطففين:٢٧.

جا دەستەی دەستەڕاستەکان خواردنەوەیەك نۆش دەکەن لەگەڵ تەسنیم تێکەڵ کراوە کە کانیەکی بەهەشتە نێزیکانیش راستەوخۆ لەتەسنیمی پاك بێ تێکەڵ کردن دەنۆشن.

---

[1] هەمان سەرچاوە.

## خوازگەی دووەم

## پایە بەرزترین و پایەنزمترین خەڵکی بەهەشت

لەموغیرەی کوڕی شوعبەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ:

((سأل موسى ربه: ما أدنى أهل الجنة مترلة؟ قال: هو رجل يجيء بعد ما أدخل أهل الجنة الجنة، فيقال له: ادخل الجنة، فيقول: أي رب، وكيف؟ وقد نزل الناس منازلهم وأخذوا أخذاهم؟ فيقال له: أترضى أن يكون لك مثل ملك ملك من ملوك الدنيا؟ فيقول؛ رضيت رب، فيقول: لك ذلك ومثله ومثله ومثله ومثله، فقال في الخامسة: رضيت، رب. فيقول: لك هذا وعشرة أمثاله، ولك ما اشتهت نفسك، ولذت عينك. فيقول: رضيت ربِّ..

قال: رب، فأعلاهم مترلة؟ قال: أولئك الذين أردت، غرست كرامتهم بيدي وختمت عليها، فلم تر عين، ولم تسمع أذن، ولم يخطر على قلب بشر.. قال ومصداقه في كتاب اللهﷻ ﴿فَلاَ تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا أُخْفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ﴾: موسا لەپەروەردگاری خۆی پرسی: کێ پایەنزمترین خەڵکی بەهەشتە؟ فەرموی: پیاوێکە، پاش ئەوە دێ کە هەمو خەڵکی بەهەشت چونەتە بەهەشت، پێی دەگوترێ: بچۆ بەهەشت، دەڵێ: ئەی پەروەردگارم، جا چۆن؟ لەکاتێکدا خەڵك لەشوێنی خۆیان نیشتەجێ بون و پشکی خۆیان وەرگرتوە؟، پێی دەگوترێ: رازی دەبی هێندەی پاشایەکی دنیا موڵکت هەبێ؟ دەڵێ: خۆشنودم ئەی پەروەردگارم، دەفەرمێ: ئەوەندەت بۆ هەیەو هێندەی دیکەش وە هێندەی دیکەش وهێندەی دیکەش و هێندەی دیکەش، لەپێنجەمیان گوتی: رازی بوم ئەی پەروەردگارم، دەفەرمێ: ئەمە بۆ تۆ لەگەڵ دە هێندەی دیو هەر شتێکی دڵت بۆ دەچێ و چێژی لێ دەکا. دەڵێ: خوشنودم ئەی پەروەردگارم.

موسا گوتی: پەروەردگارم، ئەدی پایە بەرزترینیان؟ گوتی؛ ئەوانی کە خۆم ویستومن، شکۆو رێزی وانم بەدەستی خۆم چاندوەو مۆرم کردوە، جا نەچاوێك دیتویەتیو نەگوێیەك بیستویەتی و نەبەبەر دڵی کەسێکدا رەت بوە) فەرموی بەڵگەی

راستیەکەشی ئەم ئایەتەی کتێبی خوایە: ﴿فَلاَ تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا أُخْفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ: هیچ کەسێك نازانی چ پاداشتێکی بەرزیان بۆ حەشاردراوە کە مایەی روناکی و ئارامی چاو و دڵە﴾السجدة:١٧))[1].

## خوازگەی سێیەم

## بالآترین پایەی بەهەشتیْ

بەرزو بالآترین پایە بەتاکە کەسێکی دەبڕیٚ و نێوی وەسیلەیە، بەویست و ویستی خودا ئەو پایەبەرزە بەپێغەمبەری هەڵبژێردراو و هەرە پایەدار و چاکترین بەدیهێنراوی خوا، موحەممەدی پەیامبەرمانﷺ دەبڕیٚو دەبێتە بەشی وی.

ئیبنی کەثیر لە(النهایة)دا دەڵیٚ: (باسی بالآترین پایەی بەهەشت کراوە کە وەسیلەیە، کە شوێنپایەی پێغەمبەری خوایﷺ تێدایە)، جا فەرمودەی جابیری عەبدوڵلای لای بوخاری هاوردوە، کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمیٚ:

((من قال حين يسمع النداء: اللهم رب هذه الدعوة التامة والصلاة القائمة، آت محمدا الوسيلة والفضيلة وابعثه مقاما محمودا الذي وعدته؛ حلت له الشفاعة يوم القيامة: هەر کەسێك کە گوێی لەبانگی بو گوتی؛ ئەی خودای پەروەردگاری ئەم بانگەوازە تەواو و ئەم نوێژە دابەستراوە، وەسیلەو بالآبون بەموحەممەد ببەخشە و، بینێرە ئەو پایە سوپاسکراوەی خۆت کە بەڵێنت پیٚداوە)، ئەو کەسە لەرۆژی قیامەتێدا شەفاعەتی منی بۆ حەلآڵ دەبیٚ)).

هەروەها فەرمودەی عەبدوڵلای عەمری کوڕی عاصی لای موسلیمی هێناوەتەوە کە دەڵیٚ: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بو فەرموی:

((إذا سمعتم المؤذن فقولوا مثل ما يقول، ثم صلوا عليَّ فإن من صلى عليَّ صلاة صلى الله عليه

[1] صحيح مسلم، كتاب الإيمان، باب ادنى اهل الجنة مترلة فيها: (١/١٧٦) ورقمه: ١٨٩.

**عشرا، ثم سلوا الله تعالى لي الوسيلة، فإن من سأل الله لي الوسيلة حلــت لــه الشــفاعة: ئەگەر گوێتان لەبانگوێژ بو، چی گوت ئێوەش وا بڵێن، پاشان درودم بۆ بنێرن چونکە هەر کەسێکی درودێکم بۆ بنێرێ خوا دە درودی بۆ دەنێرێ، پاشان داوای وەسیلەم بۆ لەخوای بەرز بکەن، چونکە هەر کەسێکی داوای وەسیلەم بۆ بکا، شەفاعەتی بۆ حەڵاڵ دەبێ)).**

**هاوەڵانیش لە پێغەمبەرﷺیان پرسی: وەسیلە چیە؟ فەرموی:**

**((اعلى درجة في الجنة، لا ينالها الاّ رجل واحد، وأرجوا أن أكــون هــو: بەرزترین پلەیە لەبەهەشتێ، لەپیاوێك بترازێ بەکەس نابڕێو، تکام وایە من ئەو پیاوەبم)).[1]**

**لەموسنەدیشدا لەئەبو سەعید هاتوە دەڵی: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:**

**((الوسيلة درجة عند الله، ليس فوقها درجة، فسلوا الله أن يؤتيني الوسيلة: وەسیلە پلەیەکە لەلای خودا، هیچ پلەی دیکەی لەهەوراز نیە،جا لەخوا داواکەن وەسیلەم پێ ببەخشێ)).[2]**

[1] رواه احمد عن أبي هريرة.

[2] أنظر هذه الأحاديث في (النهاية) لأبن كثير(٢/٢٣٣٢).

## خوازگەی چوارەم

### ئەوانەی لە پلەبەرزەکان نیشتەجێ دەبن

شەهیدەکان لەوانەن کە پلە بەرزەکان دادەگرن، چاکترینیشیان ئەوانەن لە پێشەوە دەجەنگن و تا دەکوژرێن ئاوڕ نادەنەوە، بەسەنەدێکی صەحیح لە پێغەمبەر ﷺ هاتوە، دەفەرمێ:

((أفضل الشهداء الذين يقاتلون في الصف الأول، فلا يلفتون وجوههم حتى يقتلوا، أولئك يتلبطون في الغرف العلى من الجنة، يضحك إليهم ربك، فإذا ضحك ربك إلى عبد في موطن فلا حساب عليه: **چاکترینی شەهیدان ئەوانەن لەریزی پێشەوە دەجەنگن و، تا دەکوژرێن رویان بە چ لایاندا وەرناگێڕن، ئەوانە لەهۆدە بەرزەکانی بەهەشت تل دەخۆن، پەروەردگاریان بۆیان پێدەکەنێ، ئەگەر پەروەردگاریشت لەهەر جێگەیەك بۆ بەندەیەك پێکەنێ ئەوە هیچ حسێبی لەسەر نیە))**[1].

**ئەوی بۆ بێوەژن و هەژاران دەکۆشێ و، بەپێداویستیان رادەگا، پلەو پایەی موجاهیدانی رێی خوای هەیە، لەئەبو هورەیرە هاتوە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەفەرمێ:**

((الساعي على الأرملة والمسكين، كالمجاهد في سبيل الله –وأحسبه قال– وكالقائم لا يفتر، وكالصائم لا يفطر: **ئەوی بۆ بێوەژن و هەژاران دەکۆشێ وەك موجاهیدی رێی خوایە، وەك یەکێکە شەونوێژ بکاو ساردنەبێتەوە، وەك رۆژوگرێکە بەینی نەداتێ و هەمیشە بەرۆژو بێ))**[2].

**پایەی ئەو کەسەی هەتیوان بەخێو دەکاو نازیان ڕادەگرێ نێزیکە لەپایەی پێغەمبەر ﷺ، لەصەحیحی موسلیم لەئەبو هورەیرە هاتوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:**

---

[1] في مسند احمد و معجم الطبراني عن نعيم بن همار؛ مسند أحمد: (٥/٢٨٧). صحيح جامع الصغير: (١/٣٦٣) ورقمه ١١١٨.

[2] صحيح مسلم، كتاب الزهد، باب الإحسان الى الأرملة والمسكين واليتيم: (٢/٢٢٨٦) ورقمه ٢٩٨٢.

((كافل اليتيم له أو لغيره، انا وهو كهاتين في الجنة: هەر کەسێك هەتیوان بەخێو بکا جا بە ماڵی خۆی بێ یان بە ماڵی هەتیوەکە بێت کە دەبێتە سەرپەرشتی شەرعی، من وئەو کەسە لەبەهەشتدا وەك ئەم دوانەین)) ئاماژەی بەپەنجەی دۆشاومژەو ناوەڕاست کرد[1].

هەروەها خودا بەرێژەوی دوعای منداڵان پلەی باوکان بەرز دەکاتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ:

((إن الله ليرفع الدرجة للعبد الصالح في الجنة، فيقول: يا رب، أنّى لي هذه؟ فيقول: بأستغفار ولدك لك: خودا لەبەهەشتێ پلەی بەندەی چاکەکار بەرز دەکاتەوە، دەڵێ: پەروەردگارم، ئەوەم لەکوێ بو؟ دەفەرمێ: بە داوای لێخۆشبون منداڵەکەت بۆ تۆ))[2].

لەصەحیحی موسلیمیش لەئەبو هورەیرە هاتوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ:

((إذا مات ابن آدم انقطع عنه عمله إلاّ من ثلاث؛ صدقة جارية، أو علم ينتفع به، أو ولد صالح يدعو له: ئەگەر ئادەمیزاد مرد، کردەوەکانی دەبڕێنەوەو چی دیکەیان ناچێتە سەر، بێجگە لەسێ شتان؛ خێرو چاکەیەکی بەردەوام، یا زانستێکی سودبەخش، یا منداڵێکی چاك بۆی بپاڕێتەوە))[3].

---

[1] هەمان سەرچاوە.

[2] في مسند احمد عن ابي هريرة، وقال ابن كثير: وهذا اسناد صحيح، و لم يخرجه احد من اصحاب الكتب الستة ولكن له شاهد في صحيح مسلم عن ابي هريرة.

[3] النهاية لأبن كثير: (٢/٣٤٠).

## جێباسی چوارەم

## خۆڵی بەهەشت

لەهەردو صەحیحاندا لەئەنەسی مالیك هاتوە لەئەبو ذەر ، لەفەرمودەی میعراجدا دەڵی: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((أدخلت الجنة، فإذا فيها جنادل اللؤلؤ، وإذا ترابها المسك: بردرام بۆ بەهەشت و، دیتم گابەردی مرواری تێدایەو، خاك و خۆڵەکەی میسکە)).

هەروەها لەئەبو سەعید هاتوە کە ئیبنی صەییاد لەبارەی خۆڵی بەهەشت لە پێغەمبەرﷺی پرسی، ئەویش فەرموی:

((هي درمكة بيضاء مسك خالص: بریتیە لە وردە ئاردێکی زۆر سپی کە میسکی پاکە)).[1]

لە موسنەدی ئەحمەدیش لەجابری عەبدوڵڵا هاتوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەبارەی جولەکان فەرموی:

((اني سائلهم عن تربة الجنة، وهي درمكة بيضاء: من لەبارەی خۆڵی بەهەشت پرسیاریان لێدەکەم، کە ئاردێکی سپیە)).

جا پرسیاری لێکردن، ئەوانیش گوتیان: کولێرەیەکە، ئەی ئەبولقاسم. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((الخبز من الدر: کولێرەکە لەدوڕە)).[2]

هەروەها لە ئەبو هورەیرە هاتوە دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، خەڵك لەچی بەدیهێنراون؟ فەرموی ((من ماء: لەئاو))، گوتمان: بەهەشت لەچی بنیات نراوە؟

فەرموی: ((لبنة من ذهب ولبنة من فضة، وملاطها المسك الأذفر، وحصباؤها الدر والياقوت، وتربتها الزعفران، من يدخلها ينعم ولا يبأس، ويخلد لا يموت، ولا يبلى ثيابهم ولا يفنى

---

[1] في صحيح مسلم ومسند احمد

[2] سەیری ئەم فەرمودانە کە لە: النهاية لابن كثير(٢/٢٤٢).

شبابم: خشتێك لەزێرو، خشتێك لەزیو، چینی بەینی دو خشتانیش میسكێكی هەرە بۆن خۆشە، وردە بەردی دوڕو یاقوتن و، خۆڵەكەی زەعفەرانە، هەركەسێ بچێتە نێوی لەخۆشیدا دەبێ‌و هەرگیز ناخۆشی نابینێ‌و، تاسەر دەژی و قەت نامرێ، وپۆشاك و جل و بەرگیان ناڕزێ‌و كۆن نابێ، گەنجێتیان بەسەر ناچێ))[1].

## جێباسی پێنجەم

### روبارەكانی بەهەشت

خوای پاك و بەرز هەواڵی پێداوین كە روبارگەلێك بەژێر بەهەشتێدا دەڕۆن:

﴿وَبَشِّرْ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ: بەو كەسانەی بڕوایان هێناوە و كاری چاكیان ئەنجام داوە مزگێنیان بدێ كە بەهەشت گەلێكیان بۆ هەیە چۆمە ئاوی زۆر بەژێردارەكانیاندا دەڕوا﴾البقرة:٢٥.

هەندێك جاریش دەفەرمێ روبارگەلیان بەژێردا دەڕوا:

﴿أُولَئِكَ لَهُمْ جَنَّاتُ عَدْنٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهِمْ الأَنْهَارُ: ئەوانە كەسانێكن بەهەشتی هەمیشەیی تایبەتی ئەوانە كە روبار بەژێر درەخت و كۆشكەكانیدا تێپەڕ دەبێ﴾الكهف:٣١.

پێغەمبەرﷺ زۆر بەرۆنی و ئاشكرایی باسی روبارەكانی بەهەشتی بۆ كردوین، لەشەوڕۆییەكەیدا:

((رأى أربعة أنهار يخرج من أصلها نهران ظاهران ونهران باطنان، فقلت: يا جبريل! ما هذه الأنهار؟ قال: أما النهران الباطنان؛ فنهران في الجنة، وأما الظاهران فالنيل والفرات: چوار روباری دیتن لە بنكی سیدرەتولمونتەها هەڵدەقوڵان، دو ڕوباری دیارو دو روباری

---

[1] رواه احمد و الترمذي والدرامي؛ مشكاة المصابيح: (٨٩/٣) ورقمه ٥٦٣٠، وقال محقق المشكاة: وله طرق وشواهد، وأورده في سلسلة الأحاديث الصحيحة.

پەنهان، گوتم: جبریل، ئەم روبارانە چین؟ گوتی: هەرچی دو روبارە پەنهانەکەن، دو روبارن لەبەهەشتێدا، دو روبارە دیارەکەش نیل و فوراتن))[1].

لەئەنەسی کوڕی مالیك هاتوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((رفعت لي السدرة، فإذا أربعة أنهار؛ نهران ظاهران ونهران باطنان، فأما الظاهران فالنيل والفرات وأما الباطنان فنهران في الجنة: داری سیدرەم بۆ بەرزکراوە، چوار روبارم دیتن، دو روباری دیار و، دو روباری پەنهان، هەرچی دوە دیارەکەن نیل و فوراتن، دوە پەنهانەکەش؛ دو روباری بەهەشتن))[2].

لەئەبو هورەیرەش هاتوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((سيحان وجيحان والفرات والنيل كل من أنهار الجنة: سەیحان و جەیحان و فورات و نیل هەمو لەروبارەکانی بەهەشتن))[3].

(رەنگە مەبەست لەوەی ئەو روبارانە هی بەهەشتێن ئەوەبێ کە بنەڕەتیان لەبەهەشتەوەیە، هەروەك مرۆڤیش بنەڕەتی لەبەهەشتەوەیە، جا ئەم فەرمودەیە تێك ناگیرێ لەگەڵ ئەوەی زانراوەو بینراوە کە سەرچاوەی ئەو روبارانە لەچاوگ و کانیاوە ناسراوەکانیان لەزەوی هەڵدەقوڵێن، جا ئەگەر واتایەکە وانەبێ یا بەوەی نەچێ، فەرمودەکە غەیب و پەنهانە و دەبێ بڕوای پی بهێنرێ‌و، بۆ خاوەنی هەواڵەکە تەسلیم بین)[4].

ئەلقاری دەڵێ: ( ئەو چوار روبارە بۆیە لەروبارەکانی بەهەشت ژمێردراون، چونکە سازگارن و هەرسیان سوکەو، بەرەکەتی خوداییان تێدایەو، پایەدار بون بەوەی پێغەمبەرانیان چونە سەر و لێیان خواردونەتەوە)[5].

---

[1] رواه مسلم في صحيحه، كتاب الإيمان، باب الإسراء، (١٥٠/١) رقم الحديث ١٦٤.

[2] جامع الأصول: (٥٠٧/١٠) وقال المحقق؛ رواه البخاري تعليقا في الأشربة، قال الحافظ في الفتح؛ وصله ابو عوانة والإسماعيلي والطبراني في (الصغير) من طريقه.

[3] صحيح مسلم، كتاب الجنة، باب ما في الدنيا من انهار الجنة، (٢١٨٣/٤) ورقم الحديث ٢٨٣٩ وعزاه الشيخ ناصر في سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٦/١) الى مسلم وأحمد والآجري والخطيب.

[4] سلسلة الأحاديث الصحيحة (١٨/١).

[5] نقله عنه الشيخ ناصر في تعليقه على مشكاة المصابيح: (٨٠/٣).

**کەوسەریش کە خودا بەپێغەمبەری خۆی ﷺ بەخشوە یەکێکە لەروبارەکانی بەهەشت:**

﴿إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ: **ئێمە کەوسەرمان پێ بەخشی**﴾الكوثر:١.

**پێغەمبەرﷺیش ئەو روبارەی دیوەو باسی بۆ فەرموین، لەئەنەسی مالیکەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی:**

((بينما أنا أسير في الجنة إذ أنا بنهر حافتاه قباب الدر المجوف، قلت: ما هذا يا جبريل؟ قال: هذا الكوثر الذي أعطاك ربك، فإذا طيبه أو طينه مسك أذفر: **کاتێك کە لەبەهەشتێ دەڕۆیشتم ، گەیشتینە روبارێك لێوارەکانی گومبەتی دوڕی کلۆر بون، گوتم: جبریل ئەوە چیە؟ فەرموی: ئەمە ئەو کەوسەرەیە کە پەروەردگارت پێی بەخشیوی، بۆنەکەی یا قوڕەکەی میسکی هەرە بۆنخۆش بو))**[1].

**ئیبنی عەبباس وشەی کەوسەری بەخێری زۆر لێکداوەتەوە کە خودا بەپێغەمبەرەکەی خۆی بەخشیوە.**

**ئەبو بیشر بە سەعیدی کوڕی جوبەیری بگێڕەوەی ئەو راڤەیە لە ئیبنی عەبباسی گوت: خەڵکانێك هەن دەڵێن؛ گوایە کەوسەر روبارێکە لەبەهەشتێ ، سەعید گوتی: ئەو ڕوبارەی بەهەشتیش هەر لەو خێرەیە خودا بەپێغەمبەرەکەی بەخشیوە**[2].

**ئیبنی کەثیری حافیظ ئەو فەرمودانەی کۆکردۆتەوە کە پێغەمبەر ﷺ باسی کەوسەری تێدا فەرمون، لەوانە ئەوەی کە موسلیم لەصەحیحەکەیدا لەئەنەسی دەگێڕتەوە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێك** ﴿إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ﴾الكوثر:١. **دابەزیە سەری، فەرموی:** ((أتدرون ما الكوثر؟ **ئایا دەزانن کەوسەر چیە؟)) گوتیان: خودا و پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرموی:** ((هو نهر وعدنيه ربي ﷻ عليه خير كثير: **روبارێکە خودای مەزن بەڵێنی پێداوم، خێرێکی زۆری لەسەرە)).**

**هەروەها فەرمودەکەی ئەنەسی لەموسنەدی ئەحمەد هێناوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ**

---

[1] صحيح البخاري، كتاب الرقاق، باب الحوض، فتح الباري: (١١/٤٦٤).

[2] صحيح البخاري، كتاب الرقاق، باب الحوض، فتح الباري: (١١/٤٦٣).

دەفەرمێ:

((أعطيت الكوثر، فإذا نهر يجري على ظهر الأرض، حافتاه قباب اللؤلؤ، ليس مسقوفا، فضربت بيدي إلى تربته، فإذا تربته مسك أذفر، و حصباؤه اللؤلؤ: كەوسەرم پێ بەخشراوە، روبارێکە بەسەر زەویدا دەکشێ، لێوارەکانی گومەزی مرواریـن، ساپیتەیان نیـە، دەستم لەخاکەکەی دا، خۆڵەکەی میسکی بۆنخۆش بو، وردە بەردیشی مـرواری بون)).

لەگێرانەوەیەکی دیکەدا هەر لەموسنەد، کە ئەنەس بەرزی دەکاتەوە:

((هو نهر أعطانيه الله في الجنة، ترابه مسك، ماؤه أبيض من اللبن، وأحلى من العسل، تـرده طيور أعناقها مثل أعناق الجزور: کەوسەر روبارێکە خودا لەبەهەشت پێی بەخشیوم، خۆڵەکەی میسکە، ئاوەکەی لەشیر سپیترەو، لەهەنوگین شیرینترە، باڵندەی وای دەچنە سەر ملیان وەکو ملی حوشترە)).

هەروەها ئیبنی کەثیر گێرانەوەی زۆری دیکەی لەهەمان بابەت ریزکردەوە، ئەگەر زێترت گەرەکە بۆ وێ بگەرێوە[1].

روبارەکانی بەهەشت بەتەنێ ئاویش نین، بەڵکو هەیانە ئاوەو، هەیە شیرەو، هەیە مەیەو، هەیانە هەنگوینی پالاوتەیە.

خودای بەرز دەفەرمێ: ﴿مَثَلُ الْجَنَّةِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ فِيهَا أَنْهَارٌ مِنْ مَاءٍ غَيْرِ آسِنٍ وَأَنْهَارٌ مِنْ لَبَنٍ لَمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُ وَأَنْهَارٌ مِنْ خَمْرٍ لَذَّةٍ لِلشَّارِبِينَ وَأَنْهَارٌ مِنْ عَسَلٍ مُصَفًّى: ئەو بەهەشتەی خودا بە پارێزکارانی بەڵێن داوە، چۆن چۆنیـە؟ چەندین روباری وای تێدا، ئاوەکەیان شلوێ نابێ. چەند روباری شیری تێدا، هەرگیز تامی نەگۆڕاوە، چەندین روباری شەرابی پێدا دەڕوا، تاوەیخۆن کەیفی پێدەکەن. چەند روبارێکیش لە هەنگوینی پالافتە﴾محمد:١٥.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ: ((إن في الجنة بحر العسل وبحر الخمر وبحر اللبن وبحر الماء ثم تنشق الأنهار بعد: لەبەهەشتێدا دەریای هەنگوین و دەریای مەی‌و، دەریای شیر و دەریای ئاو

[1] النهاية لابن كثير(٢/٢٤٦)

**هەیە، پاشان روبارەکان جودادەبنەوە))[1].**

**جا روبارەکانی بەهەشت لەو دەریایانە سەردەکەن و جودا دەبنەوە کە پێغەمبەر ﷺ باسی فەرمون، هەروەها هەواڵی روبارێکیشی پێداوین کە نێوی (باریق)ەو لەبەر دەرگەی بەهەشتدایە، جا شەهیدەکان لەبەرزەخدا لەلای ئەو روبارە دەبن.**

**پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ: ((الشهداء على بارق نهر بباب الجنة، في قبة خضراء، يخرج عليهم رزقهم من الجنة بكرة وعشيا: شەهیدان لەسەر باریقن کە روبارێکە لەدەرگەی بەهەشت، لەگومبەتێکی کەسکدا، سبەینان و هێواران رۆزی و بژێویان لەبەهەشتێوە بۆ دێ))[2].**

---

[1] في سنن الترمذي باسناد صحيح عن حكيم بن معاوية ( وهوجد بهز بن حكيم)؛ جامع الأصول: (١٠/٥٠٧) وقال المحقق؛ رواه الترمذي في صفة انهار الجنة، ورواه ايضا الدارمي، وقال الترمذي؛ حديث حسن صحيح، وهو كما قال.

[2] في مسند احمد ومعجم الطبراني ومستدرك الحاكم عن ابن عباس باسناد حسن؛ صحيح جامع الصغير؛ (٣/٢٣٥) ورقمه؛ ٣٦٣٦.

## جێباسی شەشەم

## کانیاوەکانی بەهەشت

کانیاوێکی زۆر و بەتام و چێژی جیاجیا لەبەهەشتێ هەن:

﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ: بەڕاستی پارێزکاران لەنێو باخ و کانیاواندان﴾الحجر: ٤٥.

﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي ظِلَالٍ وَعُيُونٍ: پارێزکاران لەبەر سێبەر و لەسەر کانیاوەکانن﴾المرسلات: ٤١.

لەوەسفی ئەو دو باخەی بۆ ئەو کەسانەی ئامادەکردوە لەخوای خۆیان ترسابون دەفەرمێ:

﴿فِيهِمَا عَيْنَانِ تَجْرِيَانِ: دو کانیاوی تێدایە بەخوڕ دەڕۆن﴾الرحمن: ٥٠.

بۆ دو باخەکەی خوارەوانیش دەفەرمێ:

﴿فِيهِمَا عَيْنَانِ نَضَّاخَتَانِ: دو کانی هەڵقوڵاویان تێدایە﴾الرحمن: ٦٦.

دوکانیاویش لەبەهەشت هەن، نێزیکەکان بەبێ هیچ تێکەڵ کردنێك پاك لە ئاوی ئەو دو کانیە دەخۆنەوە، چاکەکارانیش تێکەڵ بەهی دیکە لێیان نۆش دەکەن.

**کانیاوی یەکەم: کانیاوی کافور، خوای بەرز دەفەرمێ:**

﴿إِنَّ الأَبْرَارَ يَشْرَبُونَ مِنْ كَأْسٍ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُوراً، عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا عِبَادُ اللَّهِ يُفَجِّرُونَهَا تَفْجِيرًا: بەڕاستی چاکان لەپەرداخێك نۆش دەکەن کە کافور وعەتری خۆشی تێکەل کرابێ ، لەکانیاوێك بەندەکانی خوا لێی دەخۆنەوەو لەهەر لایەك ئارەزوکەن بەری دەدەنەوە﴾الانسان: ٥-٦.

جا پێی ڕاگەیاندوین کە چاکەکاران خواردنەوەی تێکەڵ بەکانیاوی کافور نۆش دەکەن، لەکاتێکدا بەندەکانی خوا بەسادەیی و زوڵاڵی دەینۆشن.

**کانیاوی دووەم: کانیاوی تەسنیم، خوای بەرز دەفەرمێ:**

﴿إِنَّ الأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ،عَلَى الأَرَائِكِ يَنظُرُونَ، تَعْرِفُ فِي وُجُوهِهِمْ نَضْرَةَ النَّعِيمِ، يُسْقَوْنَ مِنْ رَحِيقٍ مَخْتُومٍ، خِتَامُهُ مِسْكٌ وَفِي ذَلِكَ فَلْيَتَنَافَسْ الْمُتَنَافِسُونَ، وَمِزَاجُهُ مِنْ تَسْنِيمٍ، عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا الْمُقَرَّبُونَ: **بێگومان چاکان لەنازو نیعمەتدان، لەسەر کورسی و قەنەفە رازاوەکان تەماشای دەوروبەری خۆیان دەکەن، هەر لە روخساریاندا خۆشگوزەرانی دەبینیت، ئەوان لە شەرابی زولاڵی دەست لێنەدراو و مۆرکراو تێراو دەکرێن، دوا قومی بۆنی میسکە، جا ئەوانەی پێشبڕکێ دەکەن با لەمەدا خۆ پێش بخەن، ئەم شەرابە پاکە لەگەڵ تەسنیم لێك دراوە، کانیاوێکە نێزیکانی خودا لێی دەخۆنەوە**﴾المطففين:٢٢-٢٨.

**هەروەها کانیاوێکی دیکەش لەبەهەشت هەیە نێوی سەلسەبیلە، خوای بەرز دەفەرمێ:**

﴿وَيُسْقَوْنَ فِيهَا كَأْسًا كَانَ مِزَاجُهَا زَنجَبِيلاً، عَيْنًا فِيهَا تُسَمَّى سَلْسَبِيلاً: **لەوێدا بەکاسەیەك تێراو دەکرێن کە زەنجەبیلی تێکەڵ کراوە، کە ئەویش کانیاوێکە لەبەهەشتێ سەلسەبیلی پێ دەڵێن**﴾الانسان:١٧-١٨.

**رەنگە ئەمەش هەمان کانیاوەکەی یەکەم بێ.**

## جێباسی هەفتەم

## کۆشك و خێوەتەکانی بەهەشت

خودای گەورە لەبەهەشتدا خانو و نشینگەی خۆش وچاك بۆ بەهەشتیان بنیات دەنێ، هەروەك دەفەرمێ:

﴿وَمَسَاكِنَ طَيِّبَـــةً فِـــي جَنَّـــاتِ عَـــدْنٍ: خانوبەرێکی چاکی لەبەهەشتی عەدەن پێداون﴾التوبة: ٧٢.

خــودا لــەزۆر شــوێنی قورئــانێدا ئــەو نشــینگانەی بــەهۆدەکان نــاوبردوە، وەك دەفەرمێ:

﴿وَهُمْ فِي الْغُرُفَاتِ آمِنُونَ: ئەوانە لەهۆدەگەلی بەهەشت لەهێمنایی دان.﴾سبأ: ٣٧.

لەبارەی پاداش و ڕێزانەی بەندەگەلی خوای میهرەبانیش دەفەرمێ:

﴿أُولَئِكَ يُجْزَوْنَ الْغُرْفَةَ بِمَا صَبَرُوا وَيُلَقَّوْنَ فِيهَا تَحِيَّةً وَسَـــــلَامًا: ئەوانــەن لــەپای ئارامیــــان هـــۆدەی بـــــەرزی بەهەشــــتیان پــــێ دەدرێ و درودو ســــەلامیان لێ دەکرێ﴾الفرقان: ٧٥.

لەوەسفی ئەو هۆدانەشدا دەفەرمێ:

﴿لَكِنْ الَّذِينَ اتَّقَوْا رَبَّهُمْ لَهُمْ غُرَفٌ مِنْ فَوْقِهَا غُرَفٌ مَبْنِيَّةٌ تَجْـــرِي مِـــنْ تَحْتِـــهَا الأَنْهَارُ وَعْدَ اللَّهِ لاَ يُخْلِفُ اللَّـــهُ الْمِيعَـــادَ: بەڵام کەسانێکی کە خۆیان لەنافەرمانی پەروەردگاریان پاراستوە، باڵەخانەو هۆدەگەلێکیان لەبەهەشتێ هەیە، لەسەر ئەوانە نهۆمە هۆدەی دیکە سازدراوەو لەژێریاندا روباری بەخوڕ تێدەپەڕێ. بەڵێنی خوایە و خوا لە بەڵێنی خۆی لانادا﴾الزمر: ٢٠.

ئیبنی کەثیر دەڵێ: (خودای گەورە لەبارەی بەندە ئاسودەکانی خۆی رایگەیاندوە کە لەبەهەشتدا هۆدەگەلیان هەیە، کە بریتین لەکۆشکی بەرز:

﴿مِنْ فوْقِهَا غرَفٌ مَبْنِيَّة: **نهۆمگەلێکی دیکەیان لەسەر ساز دراوە**﴾الزمر: ٢٠.

**واتە چین لەسەر چین و نهۆم لەسەر نهۆم زۆر بە پوخت و بەرازاوەیی و پرینگاری و بەرزی بنیات نراون، پێغەمبەر ﷺیش باسی ئەو کۆشکانەی بۆ کردوین، وەك دەفەرمێ:**

((إن في الجنة غرفا يرى ظاهرها من باطنها، وباطنها من ظاهرها، اعدها الله تعالى لمن أطعم الطعام وألان الكلام، وتابع الصيام، وصلى بالليل والناس نيام: **کۆشك گەلێك لەبەهەشتدا هەن لەناوەوە دەریان دەدیترێ و لەدەرێ ڕا ناویان دەبینرێ. خودا بۆ ئەو کەسانەی ئامادەکردوە کە لەپێناو خوا نان دەدەن، وقسەی نەرم ونیان دەکەن و، لەڕۆژوان بەردەوامن و، بەشەو لەو کاتانەی خەڵك نوستون نوێژ دەکەن))** [1].

**هەروەها خودای بەرز پێی ڕاگەیاندوین کە لەبەهەشتێ خێوەت هەن ، وەك دەفەرمێ:**

﴿حُورٌ مَقْصُورَاتٌ فِي الْخِيَامِ: **پەریگەلێکی چاوڕەشی پەردەنشینی نێو خێوەتانن**﴾الرحمن: ٧٢.

**ئەم خێوەتانەش زۆر سەیرو سەمەرەن، لەمرواری پێکهاتون، بەڵکو هەر یەکەیان دانە مرواریەکی کلۆرە، بەرزیان بەرەو ئاسمان شێست میلەو، لە هەندێك گێڕانەوانیش بەرینایی شەست میلە، لەعەبدوڵڵای کوڕی قەیس هاتوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:**

((الخيمة درة مجوفة طولها في السماء ثلاثون ميلا، في كل زاوية منها للمؤمن اهل لا يراهم الآخرون: **خیوەتەکە کەوڕێکی کلۆرە درێژیەکەی بەرەو ئاسمانێ سی میلە، لەهەر گۆشەیەکیدا بڕوادار خانەوادەیەکی هەیە کەسانی دی نایانبینن))** [2].

**هەروەها موسلیم لەعەبدوڵڵای قەیس دەگێڕتەوە:**

---

[1] رواه احمد في مسنده وابن حبان في صحيحه عن ابي مالك الاشعري والترمذي عن علي؛ صحيح الجامع الصغير؛ (٢/٢٢٠) ورقمه ٢١١٩.

[2] وقال ابو عبدالصمد والحارث عن ابي عمران: (ستون ميلاً): صحيح البخاري، كتاب بدء الخلق، باب صفة الجنة، فتح الباري: (٦/٣١٨).

((إن للمؤمن في الجنة لخيمة من لؤلؤة واحدة مجوفة، طولها ستون ميلا، للمؤمن فيها أهلـــون، يطوف عليهم المؤمن، فلا يـــرى بعضـــهم بعضـــا: بڕوادار لەبەهەشتدا خێوەتێکی لەدانە مرواریـەکی کلـۆر هەیـە، درێژیەکـەی شێسـت میلـە، بـڕوادار خانـەوادەی تێداهـــەن، کەبەسەریاندا دەگەڕێو کەسیان ئەوانی دی نابینن)).

لەگێڕانەوەیەکی لای موسلیم هاتوە:

((في الجنة خيمة من لؤلؤة مجوفة عرضها ستون ميلا في كل زاوية منها أهل، ما يرون الآخرين، يطوف عليهم المؤمـــــن: خیوەتێك لەبەهەشت هەیە لەدانە مرواریـەکی کلـۆر پێکهاتوە، بەرینایيەکـەی شەسـت میلـە، لەهـەر گوشـەیەکی خانەوادەیـــەك هـــەن، کەسـانی دی نابینن، بڕوادار بەسەریاندا دەگەڕێ))[1].

هەروەها پێغەمبەر ﷺ باسی کۆشك و تەلاری هەندێك خێزان و هاوەڵانی خۆی بۆ کردوین، وەك لە صەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتوە، لەئەبو هورەیرە دەڵێ: جبریل هاتە لای پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمو:

((يا رسول الله، هذه خديجة قد أتت معها إناء فيه إدام و طعام، فإذا أتتك فاقرأ عليها الســـلام من ربها ومني، وبشرها ببيت في الجنة من قصب، لا صخب فيه ولا نصـــــب: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە خەدیجەیە هاتوە دەفرێکی پێیە خۆراك و پێخۆری تێدایە، جا کە هاتە لات سڵاوی پەروەردگاری و هی منی پێ ڕابگەیەنەو، موژدەی خانویەکی لەقامیش دروستکراوی بەهەشتی بدێ، نە ژاوەژاوی تێدایە نە ماندی بون))[2].

لەهەردو صەحیحی بوخاری و موسلیم لەجابیر هاتوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((دخلت الجنة فإذا أنا بالرميصاء امرأة أبي طلحة وسمعت خشفة، فقلت: من هذا؟ فقال: هـــذا بلال، ورأيت قصرا بفنائه جارية، فقلت: لمن هذا؟ فقالوا: لعمر بن الخطاب، فـــأردت أن أدخلـــه فأنظر إليه، فذكرت غيرتك: چومە بەهەشت و چاوم بە ڕومەیصا[3]ی خێزانی ئەبو طەلحە

---

[1] رواه مسلم، كتاب الجنة، باب صفة خيام الجنة؛ (٢١٨٢/٤) ورقمه ٢٨٣٨.

[2] مشكاة المصابيح: (٢٦٦/٣).

[3] رميصاء: واتە چاو بە چیقنە.. ئەمەش لەوەوە هـــاتوە کـە کـاتێك (ابوطلحة) هێشتا موسـڵمان نـەبوبو، داخوازی (ام سـلمە)ی کرد و پێی وت: (یا رمیصاء) بـۆ شـوم پـێ ناکـەیت؟ ئـەوەبو پاشـان شـوی پـێکرد و مارەییەکەشی موسڵمان بونی بو.

کەوت و گوێم لەخشپەیەك بو، گوتم: ئەوە کێیە؟ گوتی: ئەوە بیلالە، کۆشکێکیشم دیت کەنیزەکێکی لەحەوشدا راوەستا بو ، گوتم ئەوە بۆ کێیە؟ گوتیان: بۆ عومەری خەطابە، جا ویستم بچمە ناوی‌و تەماشای کەم، بەلاَم غیرەتی تۆم بیرکەوتەوە))، عومەر گوتی: داك و بابم بەفیدات بن چۆن من غیرەم بەرامبەر تۆ دەبێ[1].

هەروەها پێغەمبەر ﷺ ئەو رێگەیەی پێ ناساندوین کە بڕوادار پتر خانوی بەهەشتی پێ وەدەست دێنێ، هەر کەسێکی مزگەوتێك بۆ خوا بنیات نێ خودای گەورە لەبەهەشتدا خانوێکی بۆ بنیات دەنێ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ:

((من بنى لله مسجدا ولو كمفحص قطاة لبيضها بنى الله لــه بيــتا في الجنــة: هەر کەسێك مزگەوتێك بۆ خوا بنیات بنێ ، ئەگەر هێندی هێلانە قەتێیەکیش بێ کە بۆ هێلکەکانی جێی دەکا، لەپای ئەوە خودا خانویەکی لەبەهەشت بۆ بنیات دەنێ))[2].

لەعوسمانەوە هاتوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((من بنى مسجدا، يبتغي به وجه الله، بنى الله له بيتا مثله في الجنــة: هەر کەسێك مزگەوتێك بنیات بنێ‌و، هەر مەبەستیشی خودا بێ، خودا لەبەهەشتێدا یەکێکی وەك ئەوی بۆ بنیات دەنێ))[3].

هەروەها لەئوم حەبیبە هاتوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((من صلى في اليوم والليلة اثنتي عشرة ركعة تطوعا، بنى الله له بيتا في الجنـة: هەر کەسێکی لەڕۆژو شەوێکدا دوازدە ڕکاتە نوێژی خۆبەخشێ (سونەت) کرد ، خودا لەبەهەشتێ خانویەکی بۆ بنیات دەنێ))[4].

---

[1] مشكاة المصابيح : (٢٢٦/٣).

[2] في مسند احمد عن ابن عباس باسناد صحيح؛ صحيح الجامع الصغير: (٢٦٥/٥) ورقم الحديث ٦٠٠٥.

[3] في مسند احمد وصحيحي البخاري ومسلم وسنن الترمذي وسنن ابن ماجه؛ صحيــح جــامع الصغــير: (٢٦٥/٥) ورقم الحديث٦٠٠٧.

[4] في صحيح مسلم ومسند احمد وسنن ابي داود وسنن النسائي وسنن ابن ماجه؛ صحيح الجــامع: (٣١٦/٥)، ورقمه: ٦٢٣٤.

## جێباسی هەشتەم

## روناكی بەهەشت

قورطوبی دەڵێ: (زانایان دەڵێن: شەو و ڕۆژ لەبەهەشت نیە، بەهەشتیەكان لەروناكیەكی بەردەوام دان، بڕی شەویش بە شۆڕبونەوەی پەردەكان و داخرانی دەرگەكان دەزانن، بڕی ڕۆژیش بەهەڵكشانی پەردەكان و كرانەوەی دەرگەكان دەزانن، ئەبولفەرجی ئیبنی جەوزی باسی كردوە).[1]

خوای گەورە دەفەرمێ: ﴿وَلَهُمْ رِزْقُهُمْ فِيهَا بُكْرَةً وَعَشِيًّا، تِلْكَ الْجَنَّةُ الَّتِي نُورِثُ مِنْ عِبَادِنَا مَنْ كَانَ تَقِيًّا: لەوێدا بەیانی و هێواران رزق و ڕۆزیان هەیە، ئەمە بەهەشتێكە دەیكەینە میرات بۆ بەندە خۆپارێزەكانی خۆمان﴾مريم:٦٢-٦٣.

ئیبنی كەثیر لەراڤەی ئەم ئایەتە دەڵێ: (مەبەست كاتی سبەینان و هێوارانن نەك لەهەبونی ڕۆژو شەو، بەڵام ئەوان لەكاتانێكی تێپەڕبون كە بەهۆی تیشك و روناكیان هەستی پێ دەكرێ)[2].

ئیبنی تەیمیە لەم بابەتەوە دەڵێ: (نە خۆر لەبەهەشتدا هەیە نە مانگ، نەشەویش هەیە نە ڕۆژ، بەڵام سبەینەو هێوارە بەروناهیەك دەناسرێنەوە كە لەلای عەرشەوە دێ)[3].

---

[1] التذكرة للقرطبي : ٥٠٤

[2] تفسير ابن كثير: (٤/٤٧١).

[3] مجموع فتاوى شيخ الإسلام: (٤/٣١٢).

## جێباسی نۆیەم

## بۆنی بەهەشت

بەهەشت بۆنێکی یەکجار خۆش و دڵگیری هەیە هەمو لایەکی پڕ دەکات، بڕوادارانیش لەماوەی گەلێك فراوان و دوردا هەست بەو بۆنە خۆشە دەکەن، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ:

((من قتل رجلا من أهل الذمة لم يجد ريح الجنة وإن ريحها ليوجد من مسيرة سبعين عاما: هەر کەسێ پیاوێك لەئەهلی ذیممە بکوژی، بۆنی بەهەشت ناکات، بۆنی بەهەشتیش لەدوری هەفتا ساڵە ڕێوە دەکرێ))[1].

هەروەها دەفەرمێ: ((من قتل معاهدا لم يرح رائحة الجنة وإن ريحها ليوجد من مسيرة أربعين عاما: هەر کەسێ بەڵێن پێ دراوێك بکوژێ، بۆنی بەهەشت ناکا، بۆنی بەهەشتیش لەدوری چل ساڵەڕێیان دەکرێ))[2].

---

[1] في مسند احمد وسنن النسائي وسنن ابن ماجه ومستدرك الحاكم باسناد صحيح؛ صحيح الجامع الصغير: (٣٣٥/٥) ورقمه٦٣٢٤.

[2] صحيح البخاري ومسند أحمد، وسنن النسائي، سنن ابن ماجه عن عبدالله بن عمرو؛ صحيح الجامع: (٣٣٧/٥) ورقمه٦٣٣٣.

## جێباسی دەیەم

## درەختەکانی بەهەشت و بەروبومەکانیان

### خوازگەی یەکەم

### درەختەکان و بەروبومەکانیان زۆرو جۆراوجۆرو بەردەوامن

درەختەکانی بەهەشتێ زۆرن و بەتامن و جۆراوجۆرن، خوای بەرز پێی ڕاگەیاندوین کە درەختی ترێ و خورماو هەنار لەبەهەشت هەن، هەروەك درەختی نەبق و مۆزیشی تێدایە:

﴿إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ مَفَازًا، حَدَائِقَ وَأَعْنَابًا: خۆپارێزان سەرکەوتنی گەورە وەدەست دێنن. باخانی ڕازاوەو ترێی جۆراوجۆر﴾النبأ:٣١-٣٢.

﴿فِيهِمَا فَاكِهَةٌ وَنَخْلٌ وَرُمَّانٌ: هەمو جۆرە میوەیەکیان تێدایە بەتایبەتی خورماو هەنار﴾الرحمن:٦٨.

﴿وَأَصْحَابُ الْيَمِينِ مَا أَصْحَابُ الْيَمِينِ، فِي سِدْرٍ مَخْضُودٍ، وَطَلْحٍ مَنْضُودٍ، وَظِلٍّ مَمْدُودٍ، وَمَاءٍ مَسْكُوبٍ، وَفَاكِهَةٍ كَثِيرَةٍ: یارانی لای ڕاست، کام یارانی لای ڕاست ، لەژێر سێبەری درەختی نەبقی بێدڕك و، داری مۆزی پڕ هێشو و، سێبەری ڕاکشاو و دورو درێژو، ئاوی ڕژاو و میوەی زۆر﴾الواقعة:٢٧-٣٢.

سیدر دارێکی دڕکنە بەرەکەی نەبقی پێ دەڵێن، بەلام لەبەهەشتدا دڕکەکەی هەڵکێشراوە. طەلحیش جۆرە دارێکی دڕکنە لەحیجاز، بەلام لەبەهەشت پڕهێشوەو بۆ خواردنی بێماندی بون ئامادەو سازە.

ئەوەی قورئانی پیرۆز لەدرەختەکانی بەهەشتێ باسی فەرمون، شتێکی کەمە لەو دارو درەختانەی لەبەهەشتێدا هەن، بۆیەش دەفەرمێ:

﴿فِيهِمَا مِنْ كُلِّ فَاكِهَةٍ زَوجَانِ: لەهەر جۆرە میوەیەك جوتێكی تێدایە﴾الرحمن:٥٢.

لەبەر ئەوەی درەختەكان گەلێك زۆرن، بەهەشتیەكان چییان بوێ ئەو بانگ دەكەن و ئارەزویان بۆ چی بچێ ئەو هەڵدەبژێرن:

﴿يَدْعُونَ فِيهَا بِفَاكِهَةٍ كَثِيرَةٍ وَشَرَابٍ: داوای میوەو بادەیەكی زۆر دەكەن و بۆیان ئامادە دەكرێ﴾ص:٥١.

﴿وَفَاكِهَةٍ مِمَّا يَتَخَيَّرُونَ: میوەیەك كە بەخۆیان هەڵیدەبژێرن﴾الواقعة:٢٠.

﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي ظِلَالٍ وَعُيُونٍ، وَفَوَاكِهَ مِمَّا يَشْتَهُونَ: بەراستی خۆپارێزان لەبەر سێبەرو لەسەر كانیاوانن وە لە نێو میوەگەلێكی كە حەزیان لێبێ و ئارەزوی بكەن.﴾المرسلات:٤١-٤٢.

بەتێكڕایی هەرچی دەرون حەزی لێ بكاو چاو چێژی لێ وەرگرێ لەجۆرەكانی بەروبوم و خۆشی، هەمو لەبەهەشتێ هەن:

﴿يُطَافُ عَلَيْهِمْ بِصِحَافٍ مِنْ ذَهَبٍ وَأَكْوَابٍ وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ الأَنفُسُ وَتَلَذُّ الأَعْيُنُ: بە سینی و قاپ و قاچاغ و كوپی زێڕ (خواردن و خواردنەوە) بەدەوریاندا دەگێڕن، هەرچی دڵان ئارەزوی دەكەن و چاوان چێژی لێ وەردەگرن لەبەهەشتدا هەیە﴾الزخرف:٧١.

ئیبنی كەثیر بەقسەیەكی خۆش بەڵگەی مەزنێتی بەروبومی بەهەشتی هێناوەتەوە، گەیشتۆتە ئەو دەرەنجامەی كە خودا بە كەم شتێك لە زۆرانی ئاگادار كردوین، بەشتی ساكاریش لەشتی مەزن ئاگای كردوین، كاتێ باسی سیدرو طەلحی فەرموە، دەڵێ: (ئەگەر ئەو سیدرەی لەدنیا تەنیا بەرێكی لاواز دەدا كە نەبقی پێ دەڵێن، سەرەڕای دركی زۆری. ئەو طەلحەش كە لەدنیا تەنیا چاوەڕوانی سێبەری لێ دەكرێ، لەبەهەشتێ بەروبومی چڕوپڕی بەتام و بۆو جوان ببەخشن، بەشێوەیەك تاكە بەرێكی هەفتا جۆرە تام ورەنگی تێدا جەم بێ، هەموش پێك بچن، ئەدی دەبێ ئەو درەختانە چۆن بن كە هەر لەدنیا بەروبومی چاك دەبەخشن، وەكو سێو و، خورما و، ترێ و هی دیكە؟ دەبێ بۆنی ڕێحان و گوڵاڵان چۆن بێ؟ بەتێكڕایی ئەوەی

**لەبەهەشتێ دایە نەچاوێك دیتیتی و، نە گوێیەك بیستیتیو، نە بەسەر دڵی کەسێکدا هاتوە، لەخوا دەپارێینەوە بەمیهری خۆی لەو بەهەشتەمان پێ ببەخشێ)**[1].

**درەختەکانی بەهەشت هەردەم بەروبوم دەبەخشن، وەکو ئەوانی دنیا نین لەکات و وەرزێك بەر بدەن لەوی دیکەشدا نەیبەخشن، بەڵکو ئەوان هەمو دەمێ پڕ بەرو چڕ سێبەرن:**

﴿مَثَلُ الْجَنَّةِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ أُكُلُهَا دَائِمٌ وَظِلُّهَا: **نمونەی ئەو بەهەشتەی بەڵێنی بەخۆپاریزان دراوە ئەمەیە کە روباری بەخوڕ بەژێردارو باخەکانیدا تێدەپەڕێ و میوەو سێبەری ئەو دارانە هەمیشەییە**﴾الرعد:٣٥.

﴿وَفَاكِهَةٍ كَثِيرَةٍ، لاَ مَقْطُوعَةٍ وَلاَ مَمْنُوعَةٍ: **میوەگەلێکی زۆری تێدا، بەروبومیان بەردەوامە، لەگەڵ ئەو بەردەوامیەش رێ لەبەهەشتیان ناگیرێ بیان رنن.**﴾الواقعة:٣٣-٣٤.

**خۆشیەکی دی خەڵکی بەهەشت لەوە دایە کە ئەو بەروبومانەیان دێتە پێشێ دەبینن لەرەنگ و شێوە لەیەك دەچن، بەڵام لەتام و بۆ جیاوازن:**

﴿كُلَّمَا رُزِقُوا مِنْهَا مِنْ ثَمَرَةٍ رِزْقًا قَالُوا هَذَا الَّذِي رُزِقْنَا مِنْ قَبْلُ وَأُتُوا بِهِ مُتَشَابِهًا: **هەرکاتێك میوەیەکیان لەوێ پێ بدرێ، دەڵێن، ئەمە هەر لەوەیە کە پێشتر پێمان درابو، ئەو میوانەی دەیاندرێتێ لەشێوەدا بەهی دنیایێ دەچن**﴾البقرة:٢٥.

**داروردەختی بەهەشتێ لق و پوپیان هەڵکشاو و رێك و بەرزە:**

﴿لِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ جَنَّتَانِ، فَبِأَيِّ آلاَءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ، ذَوَاتَا أَفْنَانٍ: **بۆ هەر کەسێ لە پەروەردگاری خۆی بترسێ، دو باغ هەیە، دەیسا ئێوە لەکام چاکەی پەروەردگارتان حاشا دەکەن؟ هەردو خاوەن درەختی بە پەلك و پۆپن.**﴾الرحمن:٤٦-٤٨.

**لەگەڵ هەندێش کەسکێکی تۆخن:**

﴿وَمِنْ دُونِهِمَا جَنَّتَانِ، فَبِأَيِّ آلاَءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ، مُدْهَامَّتَانِ: **لەو دو باخچەیە نزمتر**

---

[1] النهاية لابن كثير (٢/٢٦٢).

دوی دیکەش هەن، بەکام نیعمەتەکانی پەروەردگارتان بێبڕوان، هەردوك سەوزێکی مەیلەو ڕەشن.﴾الرحمن:٦٣-٦٤.

دیارە بەهەشتیش بەمەیلەو ڕەش وەسف ناکرێ، مەگەر درەختەکانی لەبەر تۆخی ڕەنگە سەوزەکەیان ڕەش بنوێنن و، زۆریش تێکچڕژابن.

بەروبومی ئەو دارانەش شۆڕو نەوین، بەهەشتیەکان بەسوك وسانایی دەست ودەمیان دەگاتێ:

﴿مُتَّكِئِينَ عَلَى فُرُشٍ بَطَائِنُهَا مِنْ إِسْتَبْرَقٍ وَجَنَى الْجَنَّتَيْنِ دَانٍ: لەسەر دوشەکانێك پاڵکەوتون بەرەکانیان لەئاوریشەو میوەچنینی ئەو دو باخچەیە نزیکە دەستە﴾الرحمن:٥٤.

﴿وَذُلِّلَتْ قُطُوفُهَا تَذْلِيلاً: هێشوی میوەجاتی شۆڕو نێزیکە دەستە﴾الانسان:١٤.

سێبەرەکانیشیان بەو شێوەیە خودا باسی فەرمون:

﴿وَنُدْخِلُهُمْ ظِلاً ظَلِيلاً: دەیانبەینە بن سێبەرێك کە سێبەری لێ نەبڕێ﴾النساء:٥٧.

﴿وَظِلٍّ مَمْدُودٍ: سێبەرێکە ڕاکشاو و دورو درێژ﴾الواقعة:٣٠.

﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي ظِلَالٍ وَعُيُونٍ: خۆپارێزان لەبەر سێبەرو لەسەر کانیاوانن﴾المرسلات:٤١.

## خوازگەی دووەم

### باسی هەندێك درەختی بەهەشت

پێغەمبەر ﷺ باسی هەندێك درەختی بەهەشتی بۆ فەرموین؛ هێند سەمەرەن کە عەقڵان دەتاسێنن، توانستی بەدیهێنەرێکی مەزن بەمرۆڤان دەناسێنن، هێند فراوانن خەیاڵ گەلێك بۆ خەملاندن و ناسینیان لەو ئاسمانە مەلە دەکا، ئێمە هەندێك لەو فەرمودانە ریز دەکەین کە پێغەمبەر ﷺ فەرمونی.

**١- ئەو درەختەی سوار سەد ساڵ بەژێر سێبەرەکەیدا دەڕوا:**

ئەوە دارێکی زۆر مەزنە، تەنیا بەدیهێنەرەکەی لەگەورەیی شارەزایە، پێغەمبەرﷺیش وا مەزنێتی ئەو درەختەی بۆمان رونکردۆتەوە، کە سواری ماینێکی رەوان کە بۆ پێشبڕکێ سازابێ‌و بە ئەوپەڕی خێرایی خۆ بڕوا، ئەوجا سەد ساڵی پێویستە تا دەیبڕێ.

لەئەبو سەعیدی خودری (رەزای خوای لێبێ) هاتوە، پێغەمبەرﷺ فەرموی:

((إن في الجنة لشجرة يسير الراكب الجواد المضمر السريع مائة عام وما يقطعها: درەختێك لەبەهەشت هەیە، سواری هەسپی ساز بۆ پێشبڕکی بەو پەڕی خێرایی، سەد ساڵان دەڕوا و نایبڕێ))[1].

لەئەبو هورەیرەش هاتوە(رەزای خوای لێبێ) کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((إن في الجنة لشجرة يسير الراكب في ظلها مائة سنة، واقرؤوا إن شئتم ﴿وَظِلٍّ مَمْدُودٍ﴾: درەختێك لەبەهەشت هەیە سوار سەد ساڵان لەسێبەرەکەیدا دەڕوا، ئەگەر حەز دەکەن ئەم ئایەتە بخوێنن: ﴿وَظِلٍّ مَمْدُودٍ: وەسێبەرێکی راکشاو و درێژ﴾الواقعة: ٣٠))[2].

---

[1] رواه البخاري في كتاب الرقاق، باب صفة الجنة، فتح الباري: (١١/٤١٦)، ورواه مسلم في كتاب الجنة؛ باب إن في الجنة شجرة، (٢/٢١٧٦) ورقم الحديث: ٢٨٢٨.

[2] رواه البخاري في كتاب بدء الخلق، باب ما جاء في صفة الجنة، فتح الباري: (٦/٣١٩).

هەروەها لە ئەبو هورەیرەو سەهلی کوڕی سەعد هاتوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموی:

((إن في الجنة لشجرة يسير الراكب في ظلها مائة سنة لا يقطعها: درەختێك لەبەهەشت هەیە، سوار سەد ساڵان بەسێبەریدا ڕەت دەبێ و هەر نایبڕێ))[1].

**٢- سیدرەتولمونتەها:**

ئەو دارەیە خودای بەرز لەقورئان باسی فەرموە، هەروەك هەواڵی ئەوەی پێداوین کە موحەممەدی پێغەمبەرمان ﷺ لەلای ئەو دارەدا جبریلی بەو شێوەیەی خۆی دیت کە خودا بەدیهێناوە، ئەو درەختەش لەلای بەهەشتی ئارامگا(جنة المأوى) دایە، هەر خودا دەزانێ چی داپۆشیوە کاتێك پێغەمبەرﷺ دیتی:

﴿عِنْدَ سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى، عِنْدَهَا جَنَّةُ الْمَأْوَى، إِذْ يَغْشَى السِّدْرَةَ مَا يَغْشَى، مَا زَاغَ الْبَصَرُ وَمَا طَغَى: جارێکی دی جبریلی بەو شێوەیەی خۆی بینی لەلای سیدرەتولمونتەها ، کە بەهەشتی ئارامگا لەلای ئەو دایە، کاتێك کە سیدرەی داپۆشی ئەوەی داپۆشی. چاوی پێغەمبەر ڕەشکەوپێشکەی نەکردو لەمەبەست تێنەپەڕی﴾النجم: ١٤-١٧.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ لەبارەی ئەو دارە هەندێك ئەو شتانەی بۆ فەرموین کە دیبوی:

((ثم رفعت لي سدرة المنتهى، فإذا نبقها مثل قلال هجر، وإذا ورقها مثل آذان الفيلة، قال: – أي جبريل– هذه سدرة المنتهى، وإذا أربعة أنهار، نهران باطنان ونهران ظاهران، فقلت: ما هذان يا جبريل؟ قال: أما الباطنان فنهران في الجنة وأما الظاهران فالنيل والفرات: پاشان سیدرەتولمونتەهام بۆ بەرز کراوە، نەبقەکەی (بەرەکەی) وەکو گۆزەی هوجەر بو، گەڵاکانیشی وەکو گوێی فیل بون، جبریل گوتی: ئەمە سیدرەتولمونتەهایە، چوار ڕوباریشم دیتن، دو ڕوباری پەنهان و دو ڕوباری دیار، گوتم: ئەوانە چین، ئەی جبریل؟ گوتی: دوە پەنهانەکە دو ڕوباری بەهەشتن و، دوە دیارەکەش نیل و فوراتن))[2].

---

١ رواه مسلم في كتاب الجنة؛ باب إن في الجنة شجرة يسير الراكب في ظلها مائة عام، (٢١٧٥/٢) ورقم الحديث: ٢٨٢٦،٢٨٢٧.

٢ رواه البخاري ومسلم؛ صحيح الجامع: (١٨/٣) ورقمه٢٨٦١ وعزاه الى البخاري ومسلم واحمد والترمذي.

**لەهەردو صحیحانیش هاتوە:** ((ثم انطلق بي حتى انتهى الى سدرة المنتهى، ونبقـــها مثـل قلال هجر، و ورقها مثل آذان الفيلة، تكاد الورقة تغطي هذه الأمة. فغشيها الـــوان لا أدري مـــا هي، ثم ادخلت الجنة، فاذا فيها جنابذ اللؤلؤ، واذا ترابهـــا المســـك: **ئەوجا بەگەڵم کەوت تا بردمیە لای سیدرەتولمونتەها، نەبقەکەی وەکو گۆزەی هوجەر بو، گەڵاکەشی وەکو گوێی فیلان، هەر پەلکێکی نێزێك بو ئەم ئوممەتە داپۆشێ، جا رەنگانێکی وای بەسەردا هات و داپۆشی، نەم دەزانی چنە، پاشان بردرامە بەهەشت، گردۆڵکەی مرواری تێدابو. خۆڵەکەشی میسك بو))**[1].

**٣- داری توبا( طوبی ):**

**ئەمەش دەرختێکی مەزنە پۆشاکی بەهەشتیان دروست دەکا، لەئەبو سەعیدی خودری هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ:**

((طوبى شجرة في الجنة، مسيرة مائة عام، ثياب اهل الجنة تخرج من اكمامـــها: **توبا دارێکی بەهەشتە، سەد ساڵە رێیە، پۆشاکی خەڵکی بەهەشت لەخونچەکانی دەردەچێ))**[2].

**ئەو فەرمودەیەش کە ئەحمەد لە موسنەدەکەیدا لەعەبدوڵڵای عەمری دەگێرێتەوە بەڵگەی ئەوەیە کە جل وبەرگی بەهەشتیان لەبەروبومی بەهەشتەوە دەردەچێ، کە دەڵێ: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، باسی پۆشاکی بەهەشتیمان بۆ بکە، ئایا دروست دەکرێن، یا دەچنرێن؟ هەندێك کەس پێکەنین.**

**ئەوجا پێغەمبەرﷺ فەرموی:** ((ومم تضحكون، من جاهل سأل عالما: **بەچی پێدەکەنن، بەنەزانێکی پرسیاری لەزانایەك کرد؟))**

**پاشان پێغەمبەر ﷺ پاڵکەوت، ئەوجا فەرموی:** ((أيـــن الســـائل: **کوا خاوەن پرسیارەکە؟)) گوتی: ئەوەتام ئەی پێغەمبەری خوا.**

**فەرموی:** ((لا، بل تشقق عنها ثمر الجنـــة، ثـــلاث مـــرات: **نەخێر، بەڵکو لەبەروبومی**

---

[1] صحيح الجامع الصغير: (٨٢/٤)، وعزاه الى البخاري ومسلم، ورقمه ٤٠٧٥.

[2] في مسند احمد وتفسير ابن جرير، وصحيح ابن حبان؛ سلسلة الأحـــاديث الصحيحـــة: (٦٣٩/٤) ورقـــم الحديث: ١٩٨٥، والحديث اسناده حسن.

بەهەشت دێنەدەر، سێ جاران ئەمەی دوپات کردەوە))[1].

## خوازگەی سێیەم

## سەروەری روەکە بۆندارەکانی بەهەشت

خوای بەرز هەواڵی پێداوین کە رێحان و درەختی بۆنخۆش لەبەهەشتێ هەن:

﴿فَأَمَّا إِنْ كَانَ مِنْ الْمُقَرَّبِينَ، فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّتُ نَعِيمٍ: ئینجا ئەگەر لەنێزیکان بێ، هەسانەوەو بۆنی خۆش و موژدەی بەهەشتی پڕ لەنازو بەهرەی بۆ هەیە﴾الواقعة:٨٨-٨٩.

پێغەمبەرﷺیش پێی راگەیاندوین سەروەری درەختە بۆندارەکانی خەڵکی بەهەشت خەنەیە، لەعەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە هاتوە لە پێغەمبەر ﷺ کەدەفەرمێ:

((سيد ريحان الجنة الحناء: سەروەری روەکە بۆنخۆشەکانی بەهەشت، خەنەیە))[2].

---

[1] هەمان سەرچاوە(٤/٦٤٠)

[2] في معجم الطبراني الكبير باسناد صحيح على شرط الشيخين؛سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٤٠٧/٣) ورقمه ١٤٢٠.

## خوازگەی چوارەم

### قەدی دەرختەکانی بەهەشت زێڕن

یەکێکی دی لەو شتە سوڕهێنەرانەی پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێداوین ئەوەیە کە قەدی دەرختەکانی بەهەشت زێڕن، وەك لەئەبو هورەیرە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((ما في الجنة شجرة الاّ وساقها من ذهب: هەر دەرختێکی لەبەهەشت هەیە، قەدەکەی زێڕە))[1].

## خوازگەی پێنجەم

### چۆن بڕوادار پشکی خۆی لەدرەختەکانی بەهەشت زیاد دەکا؟

ئیبراهیمی باوکی پێغەمبەران و خۆشەویستی خوای میهرەبان لەشەوی ئیسرادا لەموحەممەدی پێغەمبەری ئیمەی ﷺ داوا کرد، کە سڵاوی وی بەئوممەتی خۆی بگەیەنێ و ئەو رێگەیان پی بڵێ کە دەتوانن پشکی خۆیان لەدارودرەختی بەهەشت پێ زێدە بکەن، هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ:[2]

((لقيت ابراهيم ليلة اسري بي، فقال: يا محمد، أقرئ أمتك أن الجنة أرض طيبة التربة، عذبة الماء، وانها قيعان، وأن غراسها سبحان الله، والحمدلله، ولااله الاّ الله، والله أكبر: ئەو شەوی شەوڕۆیم پێکرا بەئیبراهیم گەیشتم، گوتی: ئەی موحەممەد، بەئوممەتی خۆت بڵی بەهەشت خاکێکە خۆڵەکەی باشە، ئاوەکەی سازگارەو، دەشتاییە، چاندنیش تێیدا بریتیە لەگوتنی: سبحان الله، والحمد لله، ولا اله الا الله، والله أكبر.

[1] في سنن الترمذي، وصحيح ابن حبان، وسنن البيهقي، باسناد صحيح؛ صحيح الجامع الصغير: (٥/١٥٠)، قال ابن كثير في النهاية: (٢/٢٥٤)، رواه الترمذي، وقال: حسن صحيح.

[2] روى الترمذي باسناد حسن عن ابن مسعود.

## جیباسی یازدەم

## جوڵندە و باڵندەکانی بەهەشت

**هەر خودای بەرز دەزانی چەندو چ جۆرە باڵندە و جوڵندەیەك لەبەهەشت هەن، لەبارەی ئەو خۆشیو نازەی بەهەشتی دەکەونە نێوی خوا دەفەرمێ:**

﴿وَلَحْمِ طَيْرٍ مِمَّا يَشْتَهُونَ، وَحُورٌ عِينٌ: **گۆشتی هەر باڵندەیەکی حەزی لێبکەن و، پەریانی چاو بەڵەك**﴾الواقعة: ٢١-٢٢.

**لەئەنەس هاتوە، دەڵێ: لەپێغەمبەر ﷺ پرسیار کرا: کەوسەر چیە؟ فەرموی:**

((ذاك نهر أعطانيه الله –يعني في الجنة– أشد بياضا من اللبن وأحلى من العسل، فيه طير أعناقها كأعناق الجزر: **کەوسەر روبارێکە خودا لەبەهەشت پێی بەخشیوم، لەشیر سپیترەو ، لە هەنگوین شیرینترە، باڵندەی وای تێدا ملیان وەك ملی حوشترە**)).

**عومەر گوتی: بەراستی ئەوە نازو نیعمەتە. پێغەمبەر ﷺ فەرموی:**

((أكلتها أنعم منها: **ئەوانی دەیانخۆن لەوان نازدارترن**))[1].

**لەئیبنی مەسعود هاتوە دەڵێ: پیاوێك حوشترێکی لوتبڕاوی هێناو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەم حوشترە لەڕێی خوایە، فەرموی:**

((لك بها سبع مائة ناقة مخطومة في الجنة: **لەپای ئەمە لەبەهەشتدا حەفسەد حوشتری لوتبڕاوت هەیە**)).[2]

**هەروەها موسلیم لەصەحیحەکەیدا لەئەبو مەسعودی ئەنصاری دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پیاوێك حوشترێکی لوتبڕاوی هێناو گوتی: ئەمە لەڕاهی خوایە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی:** ((لك بها يوم القيامة سبع مائة ناقة كلها مخطومة: **لەڕۆژی قیامەتدا لەباتی ئەمە حەفسەد حوشترت دەبێ هەمویان لوتبڕاون**))[3].

---

[1] مشكاة المصابيح: (٢/٩١)، قال المحقق: رواه الترمذي وقال حديث حسن غريب، قلت (الألباني): سنده حسن.

[2] اخرجه ابو نعيم في الحلية والحاكم في مستدركه وقال: صحيح علي شرط الشيخين، و وافقه الذهبي و وافقهما الشيخ ناصرالدين الالباني؛ سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٢/٢٢٨) ورقمه ٦٣٤.

[3] رواه مسلم؛ مشكاة المصابيح: (٢/٣٥٠) ورقمه ٣٧٩٩.

# بەندی چوارەم

# بەهەشتیەکان

## جێباسی یەکەم

## ئەو کردەوانەی شایستەی بەهەشتی کردون

بەهەشتیەکان بریتین لە بڕوادارە یەکخواپەرستەکان، هەرکەسێکی هاوبەش بۆ خودا دابنێ یان بڕوای بە خوا نەبێ، یا یەکێك لەبنچینەکانی باوەڕ بەدرۆ بخاتەوە، لە باخی بەهەشت بێبەشەو لە ئاگری دۆزەخ دەبێت.

قورئانی پیرۆزیش لەگەلەك شوێنان باسی فەرموە کە بەهەشتیەکان ئەو بڕوادارانەن کە کردەوەی چاك ئەنجام دەدەن، هەندێك جاریش باسی ئەو کردەوە چاکانە دەکا کە خاوەنیان شیاوی بەهەشت دەکەن.

لەو شوێنانەی کە قورئان باسی ئەوەی فەرموە بەهەشتنشینان بەهەشت بەبڕواو کردەوەی چاك وەدەست دەهێننن ئەم ئایەتە پیرۆزانەن:

﴿وَبَشِّرْ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْـــهَارُ كُلَّمَا رُزِقُوا مِنْهَا مِنْ ثَمَرَةٍ رِزْقًا قَالُوا هَذَا الَّذِي رُزِقْنَا مِنْ قَبْلُ وَأُتُوا بِهِ مُتَشَابِهًا وَلَهُمْ فِيهَا أَزْوَاجٌ مُطَهَّرَةٌ وَهُمْ فِيهَا خَـــالِدُونَ: مـوژدە بدە ئەو کەسانەی بڕوایان هێناوە و کاری چاکیان ئەنجام داوە، کە بەهەشتگەلێکیان دەدرێتێ روباری بەخوڕیان بەژێردا تێدەپەڕێ، هەر کاتێك بەروبوم و میوەیەکیان پێ بدرێ، دەڵێن هەر ئەوەیە پێشترێ پێمان درابو، لەشێوە بەمیوەی دنیا دەچن و، ژنانێکی پاك و بێگەردیان هەیە و هەمیشە لەبەهەشتدا دەمێننەوە﴾البقرة:٢٥.

وه دهفهرمێ: ﴿والذِينَ آمَنوا وعَمِلوا الصَّالِحَاتِ سَنُدْخِلُهُمْ جَنَاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا لَهُمْ فِيهَا أَزْوَاجٌ مُطَهَّرَةٌ ونُدْخِلُهُمْ ظِلاً ظَلِيلاً: **ئەو كەسانەی كە بڕوایان هێناوەو كاری چاكیان ئەنجام داوە، زو دەیانبەینە نێو بەهەشتێك كە روباریان بەبندا ڕەت دەبێو بەیەكجاری لەوێدا دەمێننەوەو ژنانی پاك و بێگەردیان هەیە و، ئەوانە دەبەینە بن سێبەرێك كە سێبەری لێ نەبڕێ﴾**النساء:٥٧.

وه دهفهرمێ: ﴿والَّذِينَ آمَنُوا وعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لاَ نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا أُولَئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ: **ئەو كەسانەی بڕوایان هێناوەو كردەوەی چاكیان ئەنجام داوە، كەس ئەركبار ناكەین مەگەر بەئەندازەی توانا، ئەوانە بەهەشتین ولەوێدا دەمێننەوە﴾**الاعراف:٤٢.

وه دهفهرمێ: ﴿وَعَدَ اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ وَرِضْوَانٌ مِنْ اللَّهِ أَكْبَرُ ذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ: **خودا بەڵێنی باخانی بەهەشتی بە پیاوان و ژنانی بڕوادار داوە كە روباریان بە بندا ڕەت دەبێ و بەیەكجاری تێیدا دەمێننەوەو نشینگەی باشی لەبەهەشتی عەدن پێداون، رەزامەندی خوداش لە هەمو چاكترەو ئەمەش گەورەترین سەركەوتنە﴾**التوبة:٧٢.

وه دهفهرمێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ يَهْدِيهِمْ رَبُّهُمْ بِإِيمَانِهِمْ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهِمْ الأَنْهَارُ فِي جَنَّاتِ النَّعِيمِ، دَعْوَاهُمْ فِيهَا سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَتَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلاَمٌ وَآخِرُ دَعْوَاهُمْ أَنْ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ: **ئەو كەسانەی بڕوایان هێناوەو كاری چاكیان كردوە، خودا بە هۆی بڕواكەیان ڕێنوێنیان دەكا لەنێو باخە پڕنازەكانی بەهەشتدا روباریان بەژێردا دەڕوا، قسەو پاڕانەوەیان لەبەهەشتدا ئەمەیە كە ئەی خودایە تۆ پاك و بێخەوشیو درودی ئەوان سڵاوە و دوا قسەشیان ئەمەیە: ستایش تایبەتی خوای پەروەردگاری جیهانیانە﴾**یونس:٩-١٠.

هەروەها دهفهرمێ: ﴿أُولَئِكَ لَهُمْ جَنَّاتُ عَدْنٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهِمْ الأَنْهَارُ يُحَلَّوْنَ فِيهَا

مِنْ أَسَاوِرَ مِنْ ذَهَبٍ وَيَلْبَسُونَ ثِيَابًا خُضْرًا مِنْ سُنْدُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ مُتَّكِئِينَ فِيهَا عَلَى الأَرَائِكِ نِعْمَ الثَّوَابُ وَحَسُنَتْ مُرْتَفَقًا: ئەوانە کەسانێکن بەهەشتی هەمیشەییان پێ دەبڕێ کە روباری بەخوڕیان بەژێردا دەڕوا، لەوێدا بەدەسبەندی زێڕ دەڕازێندرێنەوەو پۆشاکی سەوزی ئاوریشمینی ناسك و ئەستور دەپۆشن و پاڵیان بەتەختگەلێك داوە، چ پاداشتێکی چاك و نشینگەیەکی چاکە﴾ الكهف: ٣١.

دیسان دەفەرمێ: ﴿وَمَنْ يَأْتِهِ مُؤْمِنًا قَدْ عَمِلَ الصَّالِحَاتِ فَأُولَٰئِكَ لَهُمُ الدَّرَجَاتُ الْعُلَا، جَنَّاتُ عَدْنٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَذَٰلِكَ جَزَاءُ مَنْ تَزَكَّى: هەر کەس بەئیمانەوە بێتە لای پەروەردگاری‌و کردەوەی چاکیشی ئەنجام دابێ، ئەوانە پلەی باڵایان دەدرێتێ، بەهەشتی نەمری کە چۆمی بەخوڕی بەژێردا رەت دەبێ، یەکجاری لەوێندەر دەمێننەوەو، ئەمە پاداش و رێزانەی کەسێکە خۆی پاك وخاوێن رابگرێ﴾طه: ٧٥-٧٦.

هەندێك جاریش باسی ئەوە دەکا کە بەهەشتیان بە وەدیهێنانی یەکێك لەمەسەلەکانی ئیمان یا بەکارێکی چاك دەستخستوە، واش دەبێ بەدورو درێژی لەکردەوە چاکەکان دەدوێ.

هەندێك جار لەوە دەدوێ کەبەهەشتیەکان بەئیمان و ئیسلام شایستەی بەهەشت بون:

﴿يَا عِبَادِ لاَ خَوْفٌ عَلَيْكُمُ الْيَوْمَ وَلاَ أَنْتُمْ تَحْزَنُونَ، الَّذِينَ آمَنُوا بِآيَاتِنَا وَكَانُوا مُسْلِمِينَ، ادْخُلُوا الْجَنَّةَ أَنْتُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ تُحْبَرُونَ: ئەی بەندەکانی من ئەمڕۆ نەترستان لەسەرەو نە خەمگینیش دەبن. کەسانێك کە بەنیشانەکانی ئێمە بڕوایان هێناو موسڵمان بون، ئێوەو هاوسەرەکانتان بە رێزگیراوی وشادی بڕۆنە بەهەشت﴾الزخرف: ٦٨-٧٠.

جارانێکی دیش رادەگەیەنێ کە بەهۆی دڵڕاستیان لەدینی خوا شایستەی بون:

﴿إِلاَّ عِبَادَ اللَّهِ الْمُخْلَصِينَ، أُولَٰئِكَ لَهُمْ رِزْقٌ مَعْلُومٌ، فَوَاكِهُ وَهُمْ مُكْرَمُونَ. فِي جَنَّاتِ النَّعِيمِ: مەگەر بەندە پاك و دڵڕاستەکانی خوا. ئەمانە رزق ورۆزی دیاریکراویان

هەیە، میوەی جۆراو جۆری چاك، وە ئەوانە ریز لێگیراون، لەباخانی بەهەشتی پڕ خێر و بێر﴾الصافات: ٤٠-٤٣.

هەندێك جاریش باسی شایستەبونیان دەكا بە هۆی هێزی پەیوەندیو روتێكردن و پەرستنیان بۆ خودا:

﴿إِنَّمَا يُؤْمِنُ بِآيَاتِنَا الَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا بِهَا خَرُّوا سُجَّدًا وَسَبَّحُوا بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَهُمْ لاَ يَسْتَكْبِرُونَ، تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنْ الْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ، فَلاَ تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا أُخْفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ: بەراستی كەسانێك بەنیشانەكانی ئێمە بڕوادێنن، كە هەردەمێك ئەم نیشانانەیان بخرێتەوە بیر دەكەونە سوژدەبردن و پەروەردگاریان بەپاكی ستایش دەكەن و خۆیان بەزل دانانێن، كەلەكەكانیان لە پێخەف هەڵدەگرن و بەترس و هومێد لەپەروەردگاریان دەپاڕێنەوەو لەوەی كردومانەتە رۆزیان دەبەخشن، كەس نازانێ چ پاداشتێكی گرنگیان بۆ حەشاردراوە كە مایەی روناكی چاو و دڵەو پاداشی كردەوەكانیانە﴾السجدة: ١٥-١٧.

لەو كردەوانەش ئارام و پشت بەخوا بەستنە:

﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَنُبَوِّئَنَّهُمْ مِنْ الْجَنَّةِ غُرَفًا تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا نِعْمَ أَجْرُ الْعَامِلِينَ، الَّذِينَ صَبَرُوا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ: كەسانێكی بڕوایان هێناوەو كردەی چاكیان ئەنجام داوە، لەكۆشكەكانی بەرزی بەهەشت جێیان پێ دەبەخشین كە روباریان بەژێردا رەت دەبێ، بۆ هەمیشە تێیدا دەمێننەوە، پاداشتی كردەوەكاران چەند پاداشتێكی چاكە، ئەوانەی ئارامیان گرت و پشتیان بەپەروەردگاریان بەست﴾العنكبوت: ٥٨-٥٩.

راستاڵ بون(الاستقامة) لەئیمانیش یەكێكی دیە:

﴿إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا فَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ، أُوْلَئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ خَالِدِينَ فِيهَا جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ: ئەوانی گوتیان خوا پەروەردگاری ئێمەیە و پاشان لەسەر قسەی خۆیان مان و بەردەوام بون، ترسیان بۆ

نیەو خەفەتباریش نابن. ئەوانە لەپای کردەوەکانیان دەچنە بەهەشت و یەکجاری تێیدا دەمێننەوە﴾الاحقاف:١٣-١٤.

هەروەها ملکەچی و دڵکزی یەکێکی دیکەیە:

﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَأَخْبَتُوا إِلَى رَبِّهِمْ أُولَئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ: ئەوان کەسانی بڕوایان هێناوەو چاکەکار بون لەراست خوادا خۆیان بەکەم و مل کەچ گرتوەو تەسلیم بون، ئەوانە بەهەشتین و هەمیشە لەوێدا دەمێننەوە﴾هود:٢٣.

ترسان لەخوداش یەکێکە لەو کردەوانە:

﴿وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ جَنَّتَانِ: ئەو کەسی لە پەروەردگاری دەترسێ، دوباخی بەهەشتی دەدرێتێ﴾الرحمن:٤٦.

هەروەها بوغزاندنی بێباوەڕە هاوبەش پەرستەکان و خوشنەویستنیان کردەوەکی دیکەیە:

﴿ لاَ تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ أُولَئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الإِيمَانَ وَأَيَّدَهُمْ بِرُوحٍ مِنْهُ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ: تۆ نابینی ئەوانەی کە بڕوایان بەخواو بەڕۆژی دوایی هێنابێ، لەهەمان کات لەگەڵ دوژمنانی خواو پێغەمبەرەکەی دۆستێتی بکەن. هەرچەندە باو و باپیر یا کوڕ یا برا یا خزمی ئەوانیش بن، ئەمانە کەسانێکن خوا بڕوای لەنێو دڵ و دەرونیاندا جێگیر کردوەو بەهێزێکی تایبەتی خۆی پشتیوانی کردون ودەیانباتە باغانێکەوە کە جۆگە ئاوی زۆریان بەژێردا دەڕوا، بەنەمری تێیدا دەمێننەوە، خوایان لێ رازی بوەو، ئەوانیش لەخوا رازین﴾المجادلة:٢٢.

هەندێك جارانیش ئایەتە پیرۆزەکان زۆر بەدرێژی باسی کردەوەی چاك دەکەن کە خاوەنەکانیان شایستەی بەهەشتێ دەکەن، جا لەسورەتی رەعددا لەوە دەدوێ کە بەهۆی بیروباوەڕیان بەوەی کە ئەوەی دابەزیوەتە سەر پێغەمبەر ﷺ حەقە، جێبەجێ

کردنی بەڵێنان و، نەشکاندنی پەیمانان و، گەیاندنی ئەو پەیوەندیانەی خوا فەرمانی پێکردون و، ترسانیان لەخوداو، پرینگانەوەیان لەلێپرسینەوەی خراپ و، ئارامیان بۆ خوداو، نوێژکردن و ماڵ بەخشین بەنهێنی و ئاشکراو، لادانی خراپەیان بەچاکە:

﴿أَفَمَنْ يَعْلَمُ أَنَّمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ الْحَقُّ كَمَنْ هُوَ أَعْمَى إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُولُوا الأَلْبَابِ، الَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ وَلاَ يَنقُضُونَ الْمِيثَاقَ، وَالَّذِينَ يَصِلُونَ مَا أَمَرَ اللَّهُ بِهِ أَنْ يُوصَلَ وَيَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ وَيَخَافُونَ سُوءَ الْحِسَابِ، وَالَّذِينَ صَبَرُوا ابْتِغَاءَ وَجْهِ رَبِّهِمْ وَأَقَامُوا الصَّلاَةَ وَأَنفَقُوا مِمَّا رَزَقْنَاهُمْ سِرًّا وَعَلاَنِيَةً وَيَدْرَءُونَ بِالْحَسَنَةِ السَّيِّئَةَ أُوْلَئِكَ لَهُمْ عُقْبَى الدَّارِ، جَنَّاتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا وَمَنْ صَلَحَ مِنْ آبَائِهِمْ وَأَزْوَاجِهِمْ وَذُرِّيَّاتِهِمْ وَالْمَلاَئِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِمْ مِنْ كُلِّ بَابٍ، سَلاَمٌ عَلَيْكُمْ بِمَا صَبَرْتُمْ فَنِعْمَ عُقْبَى الدَّارِ: جا ئایا کەسێك کە دەزانێ ئەوەی لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆ تۆ دابەزیوە هەقە وەکو کەسێکی نابینایە، تەنیا خاوەن عەقڵان تێدەگەن و دەپرینگێنەوە، ئەوانی کە بۆ پەیمانی خوا وەفا دەنوێنن و بەڵێن ناشکێنن، و ئەوانەی کە هەرچی خوا فورمانی بە گەیاندنی داوە دەیگەیەنن و لەپەروەردگاریان دەترسن و لە لێپرسینەوەی قیامەت دەترسێن و ئەوانەی لەبەر ویستی پەروەردگاریان ئارام دەگرن و نوێژیان بەجێهێناوە لەو رزق و رۆزیەی پێمان داون بەنهێنیو بەئاشکرا بەخشیویانە و بە چاکە خراپە دەشۆنەوەو دەیسڕنەوە، سەرەنجامی چاکی قیامەت هەر بۆ ئەوانە، بەهەشتگەلێکی هەمیشەیی کە دەچنە ناوی، هەروا باو و باپیران و ژنان و منداڵانی چاکی ئەوان و فریشتە لەهەمو دەرگاکان دێنە لایان، پێیان دەڵێن: سڵاوتان لێبێ کە ئارامتان دەگرت، جا چەند جوانە سەرەنجامی چاکی ئەو دنیا﴾الرعد:١٩-٢٤.

لەسەرەتای سورەتی (المؤمنون)یشدا بڕیاری داوە کە سەرکەوتن بۆ بڕواداارانە، پاشان ئەو کردەوانەی رونکردۆتەوە کە بۆ سەرکەوتن دەیانسازێنێ، ئەوەشی پێ راگەیاندوین کە سەرکەوتنیان بریتیە لەناردنیان بۆ فیردەوسی باڵا کە بۆ هەمیشە تێیدا دەمێننەوە:

﴿قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ، الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ، وَالَّذِينَ هُمْ عَنْ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ، وَالَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَاةِ فَاعِلُونَ، وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ، إِلاَّ عَلَى أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ، فَمَنْ ابْتَغَى وَرَاءَ ذَلِكَ فَأُوْلَئِكَ هُمْ الْعَادُونَ، وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ، وَالَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلَوَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ، أُوْلَئِكَ هُمْ الْوَارِثُونَ، الَّذِينَ يَرِثُونَ الْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ: **بەراستی بڕواداران رزگارن، کەسانێك کە لە نوێژکردن خۆشکێن و خۆبەکەم زانن، وە کەسانێك کە لەقسەو کردەوەی بێکەڵك و بەتاڵ ڕو وەردەگێڕن، ئەوانەی زەکات دەرن و کەسانێك کە پارێزەری داوێنی پاکی خۆیانن، مەگەر لەگەڵ ژنانی خۆیان یا کەنیزەکانیان، لەمەشدا لۆمە ناکرێن، جا هەر کەس لەگەڵ بێجگە لەم دوانە دەست تێکەڵ بکا، ئەمانە سنوربەزێن و دەست درێژکەرن، کەسانێك راگری ئەسپاردەو پەیمانی خۆیانن، وەکەسانێك کە لەسەر نوێژەکانیان سورن و دەیانپارێزن، هەر ئەوان میرات گرانن، کەسانێك کەبەهەشت بەمیرات وەدەست دەهێنن و بۆ هەمیشە لەوێدان﴾**المؤمنون: ١-١١.

**پێغەمبەر ﷺ باسی سێ کردەوەی مەزنی بۆ فەرموین کە خاوەنەکانیان دەکەنە شایانی بەهەشت، هەروەك لە وتارێکیدا فەرموی:**

((...وأهل الجنة ثلاثة؛ ذو سلطان مقسط متصدق موفق، ورجل رحيم رقيق القلب لكل ذي قربى ومسلم، وعفيف متعفف ذو عيال:.. **خەڵکی بەهەشتیش سیانن؛ دەسەڵاتدارێکی دادگەری خێرکەری سەرکەوتو و، پیاوێکی میهرەبانی دڵ ناسك بۆ هەمو خزمێك و موسڵمانێك و، هەمو داوێنپاکێك کەداوێنی خۆی پاك ڕادەگرێ و منداڵی هەن))**[1].

---

[1] رواه مسلم في صحيحه عن عياض بن حمار المجاشعي؛ انظر شرح النووي على مسلم: (١٧/١٩٨).

## جێباسی دووەم

## ڕێگەی بەهەشتێ ناخۆش ونەستەمە

بەهەشت پایەکی باڵایە، وەسەرکەوتنی بەرزاییانیش توانایەکی زۆری گەرەکە، ڕێی بەهەشتیش پێچەوانەیی ئارەزو و خۆشییەکانی نەفسی تێدایە؛ ئەمەش پێویستی بە لێنەوینێکی(عزیمة) گەورەو، ویستێکی بەهێز هەیە، ئەبو هورەیرە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((حجبت النار بالشهوات وحجبت الجنة بالمكاره: دۆزەخ بەئارەزوان داپۆشراوەو، بەهەشتیش بەناخۆشیان داپۆشراوە))[1].

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ: ((لما خلق الله الجنة قال لجبريل: اذهب فانظر إليها، فذهب فنظر إليها فقال: وعزتك لا يسمع بها أحد إلا دخلها، فحفها بالمكاره، فقال: اذهب فانظر إليها، فذهب فنظر إليها ثم جاء فقال: وعزتك لقد خشيت أن لا يدخلها أحد: کە خودا بەهەشتی بەدیهێنا بەجبریلی فەرمو: بڕۆ تەماشای کە، چو سەیری کرد، جا گەڕاوەو گوتی: بەعیززەتی تۆ هەر کەسێکی لەبارەی بەهەشت گوێبیست بێ دەچێتە نێوی، پاشان بەکاری ناخۆش ناخۆش دەوری تەنی، ئەوجا فەرموی: بڕۆ سەیری بکە، چو تەماشای کرد، پاشان گەڕاوەو گوتی: سوێند بەعیززەتی تۆ لەوەی ترسام کەسی تێ نەچێ))[2].

نەوەو ی لەراڤەی موسلیمدا لەبارەی فەرمودەی یەکەم دەڵێ: ( ئەم فەرمودەیە، لەقسە هەرە جوان و پاراو و چڕوپڕو کۆکەرەوەکانە کە بە پێغەمبەرﷺ بەخشراوە، لەبەر ڕانواندنی جوان و بەرزی نمونە هێنانەوەی، واتاکەشی ئەوەیە کە مرۆ ناگاتە

---

[1] رواه البخاري ومسلم، ولمسلم (حفت) بدل (حجبت)؛ جامع الأصول: (١٠/٥٢٠) ورقمه ٨٠٦٩.

[2] في سنن النسائي والترمذي وابي داود عن ابي هريرة؛ جامع الأصول: (١٠/٥٢١) ورقمه ٨٠٦٨، وقال الترمذي فيه: حديث حسن صحيح غريب.

بەهەشت تا کردەوەی ناخۆش ئەنجام دەداو، ناچێتە دۆزەخ هەتا ئارەزوان ئەنجام دەدا، چونکی بەهەشت و دۆزەخ بەم دوانە پەردەپۆش کراون، هەر کەس پەردەکان بدڕێنێ دەگاتە داپۆشراوەکان، بەزاندنی پەردەی بەهەشتیش بەئەنجامدانی کاری ناخۆشەو بەزاندنی پەردەی دۆزەخیش بەئەنجامدان و تێرکردنی ئارەزووەکانە، هەرچی کارە ناخۆشەکانن، کوششی پەرستش و بەردەوامیو ، ئارام لەئاست ناخۆشیەکانیو، قوتدانەوەی رق و کینەو، لێبوردن و نیانی و خێرو چاکە لەئاست خراپەکارو ، ئارام بەرامبەر ئارەزووەکان و شتی هاوشێوە دەگرێتەوە)[١].

[١] شرح النووي على مسلم : (١٦٥/١٧).

## جیباسی سییەم

### بەهەشتنشینان پشکی دۆزەخییان لەبەهەشتێ بە میرات دەگرن

خودا بۆ هەر ئادەمیەك دو نشینگەی داناوە؛ یەکێکیان لەبەهەشت و، ئەوی دیکە لەدۆزەخ، پاشان ئەوانەی بێبڕواو موشریکن و ناشادییان لەچارەدا نوسراوە نشینگەی بەهەشتیەکان لەنێو دۆزەخدا بەمیرات دەگرن، ئەو بەهەشتیانەی ئاسودەیی‌و کامەرانیشیان لەچارەدا نوسراوە نشینگەکانی دۆزەخییان لەبەهەشتێدا بەمیرات دەگرن. خودای بەرز لەبارەی بڕواداره سەرکەوتوەکان، پاش باس کردنی ئەو کردەوانەی دەیانباتە بەهەشت، دەفەرمێ:

﴿أُوْلَئِكَ هُمُ الْوَارِثُونَ، الَّذِينَ يَرِثُونَ الْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ: هەر ئەوانە میراتگرانن، کەسانێك کەبەهەشت بەمیرات وەدەست دێنن و بۆهەمیشە لەوێدان.﴾المؤمنون: ١٠-١١.

ئیبنی کەثیریش هەر لەراڤەی ئەم ئایەتە دەڵێ: (ئیبنی ئەبی حاتەم دەڵێ – سەنەدەکەشی تا ئەبو هورەیرە ریزکردوە-: پێغەمبەرﷺ فەرموی:

((ما منكم من أحد إلا وله منزلان: منزل في الجنة ومنزل في النار، فأما المؤمن فيبني بيته الذي في الجنة، ويهدم بيته الذي في النار: هەر یەکێك لەئێوە دو نشینگەی هەن؛ نشینگەیەك لەبەهەشت و یەکێك لەدۆزەخ ، هەرچی بڕوادارە ماڵەکەی بەهەشتی بنیات دەنێ و، ئەو خانوەی دۆزەخیشی دەڕوخێنێ)). وەك ئەوەشی لەسەعیدی کوڕی جوبەیر گێڕاوەتەوە.

جا بڕوادارەکان مەنزڵگەکانی کافران بەمیرات دەگرن، چونکە ئەوان تەنیا بۆ پەرستنی خودای بێهاوتا بەدیهێنراون، جا کە ئەوانە ئەو پەرستنەیان ئەنجامدا کە ئەرك بو لەسەریان، بێبڕواکانیش وازیان لەو ئەرکە هێناوە کە بۆی بەدیهێنراون،

بڕواداران پشکی وانیشیان وەدەست دێنا، ئەگەر تاعەتی پەروەردگاری خۆیان کردبا.

بەڵکو لەوەش زێتر، وەك ئەوەی لە پێغەمبەر ﷺ هاتوە[1]، دەفەرمێ:

((يجيء ناس يوم القيامة من المسلمين بذنوب أمثال الجبال، فيغفرها الله لهم، ويضعها على اليهود والنصارى: خەڵكانێك لەموسڵمانان لەرۆژی قیامەتێ دەهێنرێن گوناهیان وەك چیایە، خودا لێیان دەبورێ‌و، گوناهەكە دەخاتە سەر جولەكەو دیانان)).

لەبێژەیەكی تریشدا هاتوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((إذا كان يوم القيامة دفع الله لكل مسلم يهوديا أو نصرانيا، فيقال: هذا فكاك من النار: كەرۆژی قیامەت دادێ هەر موسڵمانەی خودا جولەكەیەك یان دیانێكی دەداتێ و، دەگوترێ؛ ئەمە مایەی دەرباز بونتە لەدۆزەخ)).

ئەم فەرمودەیەش وەك ئەو ئایەتەیە كە دەفەرمێ:

﴿تِلْكَ الْجَنَّةُ الَّتِي نُورِثُ مِنْ عِبَادِنَا مَنْ كَانَ تَقِيًّا: ئەو بەهەشتەیە كە دەیكەینە میرات بۆ بەندەكانی خۆپارێزی خۆمان﴾ مريم:٦٣.

وەدەفەرمێ ﴿وَتِلْكَ الْجَنَّةُ الَّتِي أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ: ئەمە بەهەشتێكە لەپای ئەو كردەوەی ئەنجامتان داوە بەمیرات پێتان گەیشتوە﴾الزخرف:٧٢.

ئەوان پشكی بێبڕواكان لەباخانی بەهەشت بەمیرات دەگرن)[2].

---

[1] في صحيح مسلم عن ابي بردة عن ابي موسى.

[2] تفسير ابن كثير: (٥/١٠).

## جیاسی چوارەم

## بێدەسەلاتەکان زۆرترین خەڵکی بەهەشتن

زۆرینەی ئەو کەسانەی دەچنە بەهەشت، ئەو بێدەسەلاتانەن کە خەڵك گرنگیان پێ نادەن و بەهەندیان هەڵناگرن، بەڵام لەلای خودا مەزنن، چونکە بۆ پەروەردگاریان ملکەچ و دلارامن، لەئاستی زەبون و گەردنکەچن و، مافی بەندایەتی کردن بۆ خوا بەرپادەکەن.

بوخاری و موسلیم لەحاریثەی کوڕی وەهەب دەگێڕنەوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((ألا أخبركم بأهل الجنة؟: ئایا هەوالی خەڵکی بەهەشتتان نەدەمێ؟)) گوتیان: بەڵێ.

فەرموی: (كل ضعيف متضعف، لو اقسم على الله لأبـــره: هەمو لاوازێکی خۆ بەلاواز دانەر، ئەگەر سوێند لەسەر خودا بخوا خودا نایەڵێ سوێندەکەی بکەوێ‌و بۆی جێبەجێ دەکا))[1].

ئەوەوەی لەراڤەی فەرمودەکەدا دەڵێ: (واتا خەڵك بە بێدەسەلاتیان دادەنێن و بەنزمیان دەزانن و، ستەمیان لێ دەکەن، لەبەر فەقیرحاڵیان لەدنیایێ، مرازیش وایە زۆربەی خەڵکی بەهەشت ئەوانن.. مەبەست ئەوە نیە هەمویان دابگرێ)[2].

لەهەردو صەحیح و موسنەدی ئەحمەد لە ئوسامەی زەید هاتوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((قمت على باب الجنة، فكان عامّة من دخلها المساكين، وأصحاب الجدّ محبوســون غــير أن أصحاب النار قد أمر بهم إلى النار، وقمت على باب النار فإذا عامة من دخلــها النســاء: لەبەر

---

[1] جامع الأصول: (١٠/٥٣٥).

[2] النووي على مسلم. (١٧/١٨٧).

دەرگـەی بەهەشـت راوەسـتام زۆربـەی ئەوانـەی دەچونـە نێـوی لەهـەژاران بـون و، دەوڵەمەندو بەختەوەرانیش بەندکرابون، بەڵام دۆزەخیـەکان بۆ دۆزەخ بەڕێ خرابـون، لەبەر دەرگەی دۆزەخیش راوەستام، زۆربەی ئەوانەی دەچونە نێوی ئافرەتان بون))[1].

لەهەردو صەحیحانیش لەئیبنی عەبباس هاتوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((اطلعت في الجنة فرأيت أكثر أهلها الفقراء واطلعت في النار فرأيت أكثر أهلـــها النســـاء: سەرم بەبەهەشتێ داگرت، دیتم زۆربەی خەڵکەکەی هـەژارەکانن، چاویشـم بەدۆزەخدا گرت، دیتم زۆربەی خەڵکەکەی ئافرەتانن))[2].

---

[1] مشكاة المصابيح: (٦٦٣/٢) ورقمه ٥٢٣٣.

[2] مشكاة المصابيح: (٦٦٣/٢) ورقمه ٥٢٣٤.

## جیباسی پێنجەم

### ئایا لەبەهەشتێ پیاو زیاترن یان ئافرەت؟

هێشتا هاوەڵان زندی بون کێشەو بەربەرەکانی لەم بارەیەوە کەوتە نێوان ئافرەت و پیاوان، لەئیبنی سیرین هاتوە دەڵێ: بەربەرەکانی کەوتە نێوان ئافرەت و پیاوان؛ داخوا کێهەیان لەبەهەشتێ زۆرترن؟ لە گێڕانەوەیەك هاتوە یان شانازیان کردوە، یان لەنێو خۆیاندا باسیان کرد، کە ئایا لە بەهەشتدا پیاو زۆرترن یان ئافرەت؟ لەئەبو هورەیرەیان پرسی. ئەمیش ڕای وابو ئافرەت زۆرترن بەبیانوی ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەر ﷺ:

((إن أول زمرة تدخل الجنة على صورة القمر ليلة البدر والتي تليها على أضوأ كوكب درّي في السماء، لكل امرئ منهم زوجتان اثنتان، يرى مخ سوقهما من وراء اللحم، وما في الجنة أعزب: یەکەم پێڕ کە دەچنە بەهەشت وێنەیان وەك مانگی چاردەیە، پێڕی پاشەوانیش وەك پرشنگدارترین ئەستێرەی ئاسمانێ وان، هەر پیاوێك لەوانە دو ژنی هەیە، مۆخی قاچیان لەو دیو گۆشتەوە دەبینرێ، هیچ رەبەنیش لە بەهەشت نین))[1].

ئەم فەرمودەیەش زۆر بە رونی بەڵگەیە کە لە بەهەشتێ ئافرەتان لەپیاوان زۆرترن، هەندێکیش دەڵێن پیاوان زیاترن بەبیانوی ئەم فەرمودەیە:

((رأيتكن اكثر اهل النار: ئێوەم دیت زۆربەی خەڵکی دۆزەخ بون)).

وەرامیش وایە کە ئیبنی حەجەری عەسقەلانی دەڵێ: ئەگەر زۆرینەی دۆزەخییان بن، ئەوە ناخوازێ کە کەمینەی خەڵکی بەهەشت بن[2]. واش هەردو فەرمودە کۆدەکرێنەوە کە ئافرەتان زۆربەی خەڵکی دۆزەخ و زۆربەی خەڵکی بەهەشت بن، ئەمەش وا دەگەیەنێ کە ئافرەتان لەنێو خەڵکیدا بونیان لەپیاوان زیاترە، دەشکرێ

[1] صحيح مسلم، كتاب الجنة، باب أول زمرة تدخل الجنة، (٢١٧٩/٤) رقمه ٢٨٣٤.
[2] فتح الباري: ٣٢٥/٦

بگوترێ: فەرمودەکەی ئەبو هورەیرە بەڵگەی ئەوەیە کە جۆری ئافرەتان لەبەهەشتێ زۆرن، جا ئافرەتانی دنیا بن یا پەریە چاوبەڵەکەکان.

پرسیارێکی دی سەرهەڵدەدا؛ کامەیان لەبەهەشت زۆرترن؛ پیاوان یا ئافرەتانی دنیا؟

قورطوبی وا نێوانی هەردو دەقانی کۆك کردوە کە ئافرەتان لەپێش شەفاعەت و دەرهێنانی یەکخواپەرستە یاخیەکان زۆرینەی خەڵکی دۆزەخن، بەڵام کاتێك بەتکای تکاکاران و میهری میهرەبانترین میهرەبانان لەدۆزەخی دەرهێنران، دەبنە زۆربەی خەڵکی بەهەشت[1].

بەڵگەیەکی دیکەش بۆ کەمی ژمارەی ئافرەتان لەبەهەشتێ ئەو فەرمودەیە کە عەمری کوڕی عاص دەیگێڕێتەوە دەڵێ: (کاتێك لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ لەم ڕێچکە چیایانە دانیشتبون فەرمووی:

((انظروا هل ترون شيئاً؟: تەماشاکەن، ئایا هیچ دەبینن؟))

گوتمان: ڕەوە قەلەڕەشکەیەك دەبینین کە یەکێکی بەڵەکیان تێدایە، دندوك و پێیەکانی سۆرن.

پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((لايدخل الجنة من النساء الا من كان منهن مثل هذا الغــــراب في الغربان: لەئافرەتان کەس ناچێتە بەهەشت، تەنیا ئەو ئافرەتەی لەنێویاندا وەکو ئەو قەلەڕەشکەیە بێ لەنێو قەلان))[2].

---

[1] راجع التذكرة للقرطبي: ص٤٧٥.

[2] رواه أحمد وأبو يعلى، سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٤/٤٦٦) روقمه ١٨٥١، وصحح الشيخ اسناده.

## جیباسی شەشەم

## ئەوانەی بەر لەئەرکبار بونێ دەمرن

### خوازگەی یەکەم

### منداڵی بڕواداران

ئەو منداڵانەی بڕوادارن کەپێش بالغ بونێ دەمرن بەویست و میهری خوای مەزن، لەبەهشتدان. خودای بەرز دەفەرمێ:

﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَاتَّبَعَتْهُمْ ذُرِّيَّتُهُمْ بِإِيمَانٍ أَلْحَقْنَا بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَمَا أَلَتْنَاهُمْ مِنْ عَمَلِهِمْ مِنْ شَيْءٍ كُلُّ امْرِئٍ بِمَا كَسَبَ رَهِينٌ: ئەو کەسانەی بڕوایان هێناو منداڵەکانیشیان بە پەیڕەوی لەوان بڕوایان هێنا. منداڵەکانیان لەبەهەشتێ بەوان دەگەیەنین و هیچ شتێك لە کردەوەیان کەم ناکەینەوەو هەمو کەس بارمتەی کاری خۆیەتی﴾الطور:٢١.

کە خودای بەرز دەفەرمێ: ﴿كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ: هەر کەس بارمتەی کاری خۆیەتی﴾المدثر:٣٨.

عەلی کوڕی ئەبو طالیب کردویەتی بەبەڵگە کە منداڵی بڕواداران لەبەهەشتێ دان چونکە کردەوەیان نەکردوە تا پێوەی پەیوەست بن.[1]

بوخاریش لەصەحیحەکەیدا دەروازەیەکی گرێداوە بەنێوی (چاکی ئەو کەسەی منداڵێکی دەمرێ و چاوی لەپاداشی خوایە)، لەوێ ئەو فەرمودەی هاوردوە کە ئەنەس دەیگێڕێتەوەو دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((ما من الناس مسلم يتوفى له ثلاث لم يبلغوا الحنث إلا أدخله الله الجنة بفضل رحمته إيـــاهم:

[1] التذكرة للقرطبي، ص١٥١١، وعزاه الى ابي عمرو في التمهيد والأستذكار وابي عبدالله الترمذي في نوادر الأصول.

هەر موسڵمانێك لەخەڵكی سێ منداڵی لەپێش باڵغ بونی بمرن، خودا بەهۆی میهرو بەزەیی بۆوان ئەویش دەباتە بەهەشت)).

لەگەڵ فەرمودەكەی ئەبو سەعیدیش (رەزای خوای لێبێ) كە ئافرەتان عەرزی پێغەمبەرﷺیان كرد رۆژێكیان بۆ تەرخان بكا، جا وەعزی بۆ دان و، فەرمووی:

((أيما امرأة مات لها ثلاثة من الولد كانوا حجابا لها من النـــار: هەر ژنێك سێ لەمنداڵانی بمرن، دەبنە پەردەی پاراستنی لەدۆزەخ))، ژنێك گوتی: ئەدی دوان؟ فەرمووی: ((واثنان: دوانیش))[1].

دەروازەیەكی تریشی ناوناوە بە (ئەو شتانەی لەبارەی منداڵی موشریكان گوتراون)، لەویش فەرمودەكەی پێشوی ئەنەسی هێناوەتەوە، لەگەڵ فەرمودەكەی ئەبو هورەیرە لە پێغەمبەر ﷺ كە دەفەرمێ:

((من مات له ثلاثة من الولد لم يبلغوا الحنث كان له حجابا من النار أو دخـــل الجنـــة: هەر كەسێك سێ منداڵی لەپێش باڵغ بونی مردن، دەبنە پەردەی دۆزەخ بۆ وی، یا دەچێتە بەهەشت)).

فەرمودەكەی بەڕائیش كە دەڵێ: ( كاتێك ئیبراهیمعليه السلام كۆچی دوایی كرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

((ان له مرضعاً في الجنة: دایەنێكی لەبەهەشتێ هەیە))[2].

ڕوی بەڵگەبونیش لەو فەرمودانەی بوخاری هێناویەتی بۆ ئەوەی كە منداڵانی بڕواداران لەبەهەشتێدان، بەپێی گۆتەی ئیبنی حەجەر وایە ( هەر كەسێكی ببتە هۆی داپۆشین و ڕێگری دۆزەخ لەداك و بابی، بەخۆی شیاوترە دۆزەخی لێ داپۆشرێ چونكە ئەو بنچینەو هۆی بەزەییەكەیە)[3].

---

[1] صحيح البخاري، كتاب الجنائز، باب فضل من مات له ولد فأحتسب، فتح الباري: (١١٨/٣).

[2] صحيح البخاري، كتاب الجنائز، باب ما قيل في اولاد المسلمين، فتح البـــاري: (٢٤٤/٣)، وحديـــث ابي هريرة رواه معلقا.

[3] فتح الباري : (٢٤٤/٣).

دەقگەلێکی راشکاویش هاتون لەبارەی چونی مندالی بڕواداران بۆ بەهەشتێ. لەوانەش کە دەفەرمێ:

((إن المسلمين وأولادهم في الجنة: موسڵمانان و منداڵەکانیان لەبەهەشتێ دان))[1].

هەروەها دەفەرمێ: ((ما من مسلمين يموت لهما ثلاثة من الولد لم يبلغوا الحنث إلاّ أدخلهم الله وإياهم بفضل رحمته الجنة: هەر دو موسڵمانێك سێ منداڵیان بەر لە بالغ بونێ بمرن خودا ئەوان و ئەمانیش بەمیهری خۆی دەباتە بەهەشت))[2].

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ[3]: ((صغارهم دعاميص الجنة، يتلقى أحدهم أباه أو قال أبويه فيأخذ بثوبه، أو قال بيده كما آخذ أنا بصنفة ثوبك هذا، فلا يتناهى، أو قال: فلا ينتهي حتى يدخله الله وإياه الجنة: بەچکەکانیان چۆلەکەی بەهەشتن، هەریەکەیان دەگاتە باوکی یا فەرموی دایك وبابی لچکی جلکەکەی یا دەستی دەگرێ، هەروەك من لچکی تۆ دەگرم. وازی لێناهێنێ هەتا خودا ئەم و ئەو دەباتە بەهەشتێ))[4].

هەروەها لەئەبو هورەیرە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی:((ذراري المسلمين في الجنة تكفلهم ابراهيم ﷺ: ئیبراهیم ﷺ منداڵانی موسڵمانان لەبەهەشتێ لەخۆ دەگرێ))[5].

دیسان دەفەرمێ: ((أطفال المؤمنين في الجنة يكفلهم ابراهيم وسارة، حتى يدفعوهم الى ابائهم يوم القيامة: ئیبراهیم و سارە لەبەهەشتێ منداڵی بڕواداران لەخۆدەگرن، هەتاکو لەڕۆژی دوایی دەیاندەنەوە، داك و بابیان))[6]

ئەوەویش کۆڕابونی کۆمەڵە زانایەکی موسڵمانی جێباوەڕی ڕاگواستوە لەسەر

---

[1] فتح الباري : (٣/٢٤٥) والحديث عن علي مرفوعاً عند عبدالله بن احمد في زيادات المسند.

[2] فتح الباري: (٣/٢٤٥) والحديث لابن هريرة عن احمد في مسنده مرفوعاً.

[3] روى مسلم في صحيحه، واحمد في سنده عن ابي هريرة.

[4] سلسلة الأحاديث الصحيحة: (١/١٧٤) ورقمه ٤٣٢.

[5] روى الامام احمد، وابن حبان، والحاكم؛ سلسلة الأحاديث الصحيحة (٢/١٥٦) ورقمه٦٠٣، وذكر محقق أن الحاكم صحح اسناده و وافقه الذهبي، إلاّ أن الشيخ ناصر قال: هو حسن فقط.

[6] رواه ابو نعيم في اخبار اصبهان والديلمي، وابن عساكر عن ابي هريرة؛ سلسلة الأحاديث الصحيحة (٣/٤٥١) ورقمه١٤٦٧.

ئەوەی کە هەر منداڵێکی موسڵمانان بمرێ لەبەهەشتە. واش لەوی رایگواستوە کە هەندێك لەو ئاستی وەستاون[1].

قورطوبیش ئەو هەڵوێستەیە لەحەمادی کوڕی زەید و، حەمادی کوڕی سەلەمەو، ئیسحاقی کوڕی راهەوێ دەگێڕێتەوە[2].

نەوەوی دەڵێ: (هەندێك لەئاستی رادەوەستن لەبەر فەرمودەی عائیشە، واتە ئەوەی موسلیم تەخریجی کردوە بەبێژەی: کوڕیژگەیەك لەئەنصارییان مرد، منیش گوتم: لەخۆی خەنی، چ خراپەی نەکردن و نەگەیشتە خراپان. پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((أو غير ذلك يا عائشة، إن الله خلق للجنـــة أهـــلا..: رەنگە واش نەبێ ئەی عائیشە، خودا خەڵکێکی بۆ بەهەشت بەدیهێناون..)).

دەڵێ: رەنگە بۆیە وا وەرامی دابێتەوە تاکو وا زو و بەبێ بەڵگە قسەی گردەبڕ نەکا، یاخود پێش ئەوەی بزانی کەمنداڵانی بڕواداران دەچنە بەهەشت، وای فەرموە)[3].

دەڵێم: رەنگە دروست وابێ کە فەرمودەکە ئامارژە بەوە بکا، نابێ ئێمە یەکێك دیاری بکەن کە لە بەهەشتیانە، هەرچەند بەشێوەیەکی رەهاو گشتگیر گەواهی بەهەشتیان بۆ دەدەین، مەسەلەی دوەمیش بریتیە لەهێرش نەبردن بۆ ئەم بابەتە، تا خەڵك جورئەت نەکەن وەك ئەوەی لەسەردەمی خۆماندا وا ڕودەداو ئەوانی بە مردواندا هەڵدەڵێن و هەڵدەبەستن کە مردیەکەیان لەبەهەشتە هەرچەند بێدینترین کەسیش بێ.

ئیبنی تەیمیە (بەر میهری خوابێ) دەڵێ: (بۆ یەکێکی دیاریکراو لەمنداڵانی بڕواداران گەواهی چونە بەهەشت نادرێ، ئەگەرچی ئەو شایەدیە بەرەهایی بدرێ)[4].

---

[1] فتح الباري (٣/٢٤٤).

[2] التذكرة للقرطبي ص٥١١.

[3] فتح الباري : (٣/٢٤٤).

[4] مجموعة فتاوى شيخ الإسلام: (٤/٢٨١).

## خوازگەی دوەم

## منداڵانی هاوبەشدانەران

بوخـاری لەصەحیحەکـەیدا دەروازەیـەکی ناونـاوە (ئـەوەی لـەبارەی منداڵـی موشـریکان گوتـراوە)، لـەوێدا فەرمودەکـەی ئیبنـی عەبباسـی (ڕەزای خـوای لێبـێ) هێناوەتەوە کە دەڵێ: (پێغەمبەر ﷺ لەبارەی منداڵی هاوبەشدانەران پرسیاری لێکرا، فەرمووی: ((الله اذ خلقهم اعلم بما کانوا عاملین: ئەو خودایەی بەدیهێناون، چاکتر دەزانێ چییان دەکرد)).

لەگەڵ فـەرمودەی ئـەبو هورەیـرە (ڕەزای خـوای لێبـێ) دەڵـێ: (لـەبارەی منداڵـی موشریکان پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ کرد، فەرمووی:

((الله اعلم بما کانوا عاملین: خودا چاتر دەزانێ چ کردەوەیەکیان ئەنجام دەدا)).

وە فەرمودەی ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێ) کە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

((کل مولود یولد علی الفطرة، فأبواه یهودانه أو ینصرانه أو یمجسانه، کمثل البهیمـة تنتـج البهیمة، هل تری فیها جدعـاء: هـەمو منداڵێك لەسـەر فیطرەت لـەدایك دەبـی، جا باب و داکی دەیکەنـە جولەکـە یـان دیـان یـاخود ئاگرپەرسـت، وەك چـۆن ئـاژەڵ بـە تـێر و تەواوی پەیدا دەبێ، ئایا هیچ دانەیەکی لوتبڕاویان تێدا دەبینیت؟))[1].

ئیبنـی حەجـەر دەڵـێ: وا هەسـت دەکـەم لـێرەدا کـە بوخـاری لەئاسـت منداڵـە موشـریکان ڕاوەسـتاوەو ڕای نـەداوە، بـەڵام پاشـان بـەپێی تەفسـیری سـورەتی ڕۆم لەصەحیحەکەیدا، ڕای وابوە کە ئەو بۆچونەی هەڵبژاردوە کە دەڵێ دەچنە بەهەشت، فەرمودەکانی ئەو دەروازەشی وا ڕێکخستوە ئاماژە بە هەڵبژاردنی ئەو ڕاڕەوە دەکا، چونکـی لەسـەرەتا ئەوفـەرمودەی هێناوەتـەوە کـە بەڵگـەی ڕاوەسـتانە، بـەڵام ئـەو

[1] صحیح البخاري، کتاب الجنائز، باب ما قیل في اولاد المشرکین، فتح الباري: (٢٤٦/٣).

**فەرمودەی کردۆتە دوەم کە چونە بەهشتیان تاسەنگ(مرجح) دەکا، لەسێیەمیش ئەو فەرمودەی هێناوەتەوە بەراشکاوی وای راگەیاندوەو لەمیانەی فەرمودەکەدا هاتوە:**

((واما الصبيان حوله فــأولاد النــاس: **هەرچی کورپژگەکانی چاردەورینە، منداڵانی خەڵکین**)).

**بوخاریش لە(تعبیر)دا بەم واژەیە هێناویەتیەوە:** ((واما الولدان الذين حولـــه فكـل مولود يولد على الفطرة: **ئەو منداڵانەی چواردەوریشی ئەوا هەر منداڵێك لەسەر فیطرەت لەدایك دەبێ**)).

**جا هەندێك لە موسڵمانان گوتیان: ئەدی منداڵی موشریکان؟ فەرموی** ((واولاد المشركين: **منداڵی موشریکانیش هەروا**))[1].

**ئیبنی حەجەر دەڵی: ( ئەو فەرمودەیەشی پاڵپشتە کە ئەبو یەعلی بەمەرفوعی لەئەنەسی دەگێڕتەوە:**

((سألت ربي اللاهين من ذرية البشر أن لا يعذبهم فأعطانيـــهم: **داوام لەپەروەردگارم کرد بێئاگایانی وەچەی مرۆڤ ئەشکەنجە نەدا، جا بەمنی بەخشین**))[2].

**لەو فەرمودەی ئیبنی عەبباس کە بەزار بەمەرفوعی دەیگێڕێتەوە، راڤەی** (اللاهـين: **بێئاگایان) بەمنداڵان کراوە.**

**پوری خەنسای کچی معاویەی کوڕی صەریم دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ پرسی: کێ لەبەهەشتە؟ فەرموی:**

((النبي في الجنة، والشهيد في الجنة، والمولـــود في الجنـــة: **پێغەمبەر لەبەهەشتە، شەهید لەبەهەشتە، منداڵیش لەبەهەشتە**))[3].

**هەروەها ئەو فەرمودەشیان کردۆتە بیانگە کە دەفەرمێ:**

---

[1] فتح الباري: (٣/٢٤٦)

[2] إسناده حسن.

[3] اخرج احمد من طريق خنساء بنت معاوية بن صريم عن عمتها، اسناده حسن؛ فتح الباري: (٣/٢٤٦).

((أطفال المشركين خـــدم اهــل الجنــة: منداڵانی موشریکان خزمەتکارانی خەڵکی بەهەشتن))[1].

کۆمەڵێکی زۆر لەزانایانیش دەڵێن؛ ئەو منداڵانە لەبەهەشتن، ئەبولفەرەجی ئیبنی جەوزیش هەر ئەم رایەی هەڵبژاردوە[2]، ئەوەویش لەبارەی ئەم بۆچونە دەڵێ: (ئەو رارەوە راست و دروست و هەڵبژێردراوەیە کە تۆژەرانی پێگەیشتون، چونکە خودا دەفەرمێ:

﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولاً: ئێمە هیچ تاك و تاقمێك ئەشکەنجە نادەین هەتا پێشتر پێغەمبەرێکیان بۆ دەنێرین﴾الاسراء:١٥.

پشتیشی بەو بەڵگانە بەستوە کە بوخاری وەی دیکە هێناویانەتەوە[3].

دەڵێم: قورطوبیش هەمان ئەم رایەی پەسەند کردوە، هەروەها قورطوبی ئەم بۆچونەو ئەو دەقانەی وایان لێ دەفامرێتەوە کە لەگەڵی تێك ناکەنەوە، وا رێکخستون کە پێغەمبەر ﷺ لە سەرەتا فەرمویەتی ئەو منداڵانە لەگەڵ باوکانیانن لەدۆزەخدا، پاشان هەڵوەستەی فەرموەو، فەرمویەتی: خودا زاناترە چییان دەکرد، پاشان نیگای بۆ هات کە هیچ کەسێك بەگوناهی یەکێکی دیکە ئەشکەنجە نادرێ:

﴿وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى: تاوانی کەس لە ئەستۆی کەسدا نیە﴾الاسراء:١٥.

جا ئەو کاتە بڕیاری دا کە لەبەهەشتن[4].

جا هەر لەم بارەیەوە فەرمودەیەکی هێناوەتەوە کە عەبدورەزاق دەیگێڕێتەوە، بەڵام فەرمودەکە هەروەکو ئیبنی حەجەری عەسقەلانی دەڵی: فەرمودەیەکی لاوازە[5].

---

[1] رواه ابن منده في المعرفة، وابو نعيم في الحلية، وابويعلي في مسنده، وحكم عليه الشـيخ نـاصر بالصحـة بمجموع طرقه؛ سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٤٥٢/٣) ورقمه ١٤٦٨.

[2] مجموع فتاوي شيخ الإسلام: (٣٧٢/٢٤) ، (٣٠٣/٤).

[3] فتح الباري: (٢٤٧/٣).

[4] التذكرة للقرطبي: ص٥١٥

[5] فتح الباري : (٢٤٧/٣).

بەپێی ئەم کۆککردنەی کە ئیبنی حەجەر باسی کردوە وا دەردەکەوێ کە مەسەلەکە لەبابەتی تێرامان و کۆشین نیە، بەڵکو مەسەلەیەکی غەیبیەو، بەنیگا نەبێ قسەی تێدا ناکرێ، خوداش زاناترە.

رەنگە ئیشکالێکی دیکەش بێنیتە گۆڕێ کە دەگوترێ مندالانی بڕواداران و موشریکان لەبەهەشتێ دان، بە ئەو دەقانەی بەڵگەی ئەوەن کە خودا هەر لە ئەزەلەوە خەڵکی بەهەشت و هی دۆزەخی ناسیوە، کاتێك فریشتەش سەردانی مندالان دەکا، رۆزی و ئاکام و شادی و ناشادی کۆرپە دەنوسێ، لەوەرامیشدا دەگوترێ هەر کەسێکی بەگچکەیی‌و پێش ئەنجام دانی کردەوە بمرێ هەر لەزگی دایکیدا شادی‌و ئاسودە نوسراوە، خوداش بەراستی ئاگاترە.

کۆمەڵێکیش لە زانایان وای بۆ چون کە ئەو مندالە دەکەوێتە بەر ویستی خودا، ئەمەش لەحەمادی زەیدو، حەمادی سەلەمەو ئیبنی موبارەك و، ئیسحاق راگوێزراوە. بەیهەقیش لە (الأعتقاد)دا لەشافعی تایبەت لەبارەی مندالی بێبڕوایانی راگواستوە، ئیبنی عەبدولبەڕ دەڵی: ئەمەش مانای کردەوەی مالیکە و، چ دەقێکیشی لەم بارەیەوە لەلا نیە، بەلام هاوەلانی بەراشکاوی رایانگەیاندوە کە مندالی موسڵمانان لەبەهەشتدان و مندالی بێبڕوایانیش لەبەر ویستی خوادان، بەڵگەشی ئەم فەرمودەیە:

((الله اعلم بما كانوا عاملين: خودا چاکتر دەزانێ چ کردەوەیەکیان ئەنجام دەدا)) [1].

هەر ئەم گۆتەیەش ئەبولحەسەنی ئەشعەری لەئەهلی سونەت و جەماعەتی دەگێڕتەوە [2] و، هەڵبژاردەی شێخی ئیسلامیشە ، چونکە وای هەڵبژاردوە کە مندالی موشریکان لەبەر ویستی خودان، لە رۆژی دوایی تاقی‌دەکرێنەوە، ئەم گۆتەیەش بۆ ئەبولحەسەنی ئەشعەری و ئەحمەدی پێشەوا دەگێڕتەوە، شێخی ئیسلام دەڵێ: (راست وایە لەبارەیان بگوترێ: خودا زاناترە چیان دەکرد و، حوکمیش بۆ یەکێکی دیاریکراویان نادرێ کە دەچنە بەهەشت یان دۆزەخ، لەچەند فەرمودەیەکیش واهاتوە

---

[1] فتح الباري: (٣/٢٤٦).

[2] مجموعة فتاوي شيخ الإسلام: (٤/٢٨١-٤٠٤)، (٢٤/٣٧٢).

که لەڕۆژی قیامەتدا لەمەیدانی قیامەت تاقیدەکرێنەوە، و فەرمانیان پێ دەکرێ و نەهیان لێدەکرێ، جا ئەوەی گوێڕایەڵ بێ دەچێتە بەهەشت و ئەوەی یاخیش بێ دەچێتە دۆزەخ، هەر ئەمەشە کە ئەبولحەسەنی ئەشعەری لەبارەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت باسی کردوە[1].

لەجێگەیەکی تریشدا دەڵێ: (ئەو منداڵانەی موشریکان کە لەدنیادا ئەرکبار نەبون، لەقیامەت ئەرکبار دەکرێن)، هەروەك چەندین فەرمودەی پێ هاتوە، ئەم گۆتەیەشە کە ئەبولحەسەنی ئەشعەری دەربارەی منداڵانی موشریکان دەیگێڕێتەوە. هەروەك لەهەردو صەحیحاندا چەسپاوە لە پێغەمبەرﷺەوە کە پرسیاری دەربارەیان لێکراوەو، فەرمویەتی: ((الله اعلم بما كانوا عاملين))[2].

ئیبنی حەجەریش باسی ئەوەی کردوە کە ئەوانە لەدواییدا تاقی دەکرێنەوە، بەوەی کە ئاگرێکیان بۆ بەرز دەکرێتەوە، هەر کەس بچێتە نێوی، بۆ وی فێنك و سەلامەت دەبێ، ئەوی یاخیش بێ ئەشکەنجە دەدرێ[3]. مەسەلەی تاقیکردنەوەش دەرهەق شێتان و ئەوانی لەماوەی نەبونی پێغەمبەران ژیاون لەچەند رێگەیەکی صەحیحەوە هاتوە، بەیهەقیش لە (کتاب الاعتقاد) دەگێڕێتەوە کە ئەمە راڕەوێك(مذهب)ی راست و دروستە[4].

لەقورئانیشدا لەچیرۆکی بەندە چاکەکەی کە موسا گەشتی کرد تا لە مەجمەعولبەحرەین بیگاتێ، کە نهێنی کوشتنی منداڵەکە رون دەکاتەوە، بەڵگەی راستی ئەم رایەیە، کاتێك دەفەرمێ:

﴿وَأَمَّا الْغُلَامُ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤْمِنَيْنِ فَخَشِينَا أَنْ يُرْهِقَهُمَا طُغْيَانًا وَكُفْرًا﴾: بەڵام کوڕیژگەکە باوك و دایکێکی بڕواداری هەبو، ترساین ناچاریان بکات لە فەرمانی خوا دەرچن و کافر ببن.﴾الكهف: ٨٠.

[1] مجموعة فتاوي شيخ الإسلام: (٣٧٣/٢٤)، (٣٠٣/٤).
[2] مجموعة فتاوي شيخ الإسلام: (٢٨١/٤).
[3] اخرجه البزار من حديث انس وابي سعيد، واخرجه الطبراني من حديث معاذ بن جبل
[4] فتح الباري : (٢٤٦/٣)

جا لەصەحیحی موسلیمیش لەئیبنی عەبباسەوە هاتوە، دەڵی: پێغەمبەر ﷺ لەبارەی ئەو کوڕیژگەی خدر کوشتی، فەرموی:

((طبع یوم طبع کافرا، ولو ترك لأرهق ابویه طغیانا وکفرا: ئەو ڕۆژی مۆری لێدرا، مۆری بێبڕوایی بو، ئەگەر وازی لێهێنرابا، بەیاخیبون و بێبڕوایی دایك و بابی خۆی هیلاك دەکرد)).

ئیبنی تەیمیە لەپاشبەندی ئەم فەرمودەیە دەڵێ: (واتا خودا لەئوممولکیتاب مۆری کردبو، واتە، جێگیری کردبو و، بەکافری نوسیبو، واتە ئەگەر بژیبا بەکردار کافر دەبو).

بەڵام قورطوبی ئەم ڕاڕەوە(مذهب)ی بەلاواز داناوە بەبیانگەی ئەوەی کە ڕۆژی دوایی خانەی پاداش و سزایە نەك ئەزمون و تاقی کردنەوە وەدەڵێ: (گۆتەی تاقیکردنەوەیان لەمەیدانی قیامەتێ لە ڕوی ماناوە بەلاواز دادەنرێ چونکە ڕۆژی دوایی خانەی ئەرکبارکردن(تکلیف) نیە، بەڵکو خانەی پاداش و سزادانە، حەلیمی دەڵی: ئەم قسەیەش نەچەسپاوەو پێچەوانەی بنچینەکانی موسڵمانانە، چونکە قیامەت خانەی تاقیکردنەوە نیە، چونکە ناسینی خودای بەرز لەوێدا زەرورەتە نەك تاقیکردنەوە و زەرورەت)[1] .

بەڵام ئەم بیانوەی بەهانەی پێگرتوە کە ئەرکباربون بە مردنێ دەبڕێ، ڕاست نیە، ئیبنی تەیمیەی شیخی ئیسلامیش وەڵامی داوەتەوەو، دەڵی: ئەرکباربون بە چونە خانەی پاداش وسزایان کە بەهەشت و دۆزەخن دەپچڕێ، بەڵام لەمەیدانی قیامەتێ تاقی دەکرێنەوە هەروەك لەبەرزەخیشدا تاقیدەکرێنەوە و، بەهەریەکەیان دەگوترێ پەروەردگارت کێیە؟ دینت چیە؟ وپێغەمبەرت کێیە؟ خودای بەرزیش دەفەرمێ:

﴿یَوْمَ یُكْشَفُ عَنْ سَاقٍ وَیُدْعَوْنَ إِلَى السُّجُودِ فَلاَ یَسْتَطِیعُونَ: لەو ڕۆژەی کە پۆز لە ترسان هەڵدەکرێ‌و (کاری هەمو کەس دەردەکەوێ)، بەتەوسەوە بۆ سوژدە بردن بانگ دەکرێن و ناتوانن بیبەن﴾القلم:٤٢

لەروی زیاتریش بەصەحیحی لە پێغەمبەر ﷺ سەلماوە کە فەرمویەتی:

((يتجلى الله لعباده في الموقف، إذا قيل ليتبع كل قوم ما كانوا يعبـــدون، فيتبـــع المشـــركون آلهتهم. ويبقى المؤمنون، فيتجلى لهم الرب الحق في غير الصورة التي كانوا يعرفون، فينكرونـــه، ثم يتجلى لهم في الصورة التي يعرفون، فيسجد له المؤمنون، وتبقى ظهور المنافقين كقـــرون البقـــر، فيريدون أن يسجدوا، فلا يستطيعون، وذلك قوله: ﴿يَـــوْمَ يُكْشَـــفُ عَـــنْ سَـــاقٍ﴾: خودا لەوێستگای قیامەتێ بۆ بەندەکانی دەردەکەوێ، کاتێك دەگوترێ هەر هۆزێك چیان دەپەرست با وەدوی کەون، جا موشریکەکان بەشوێن خواوەندەکانیان دەکەون و، بڕواداران دەمێننەوە، پەروەردگاری هەق بەوێنەیەکی جیا لەوەی دەیناسن بۆیان تەجەللا دەکا، ئەوانیش نایناسن، پاشان بەو وێنەیەی دەیناسن بۆیان دەردەکەوێ، جا بڕواداران سوژدەی بۆ دەبەن و، پشتی مونافیقان وەکو شاخی چێڵێ لێدێ، دەیانەوێ سوژدە ببەن و ناتوانن ، ئەمەش ئەوەیە کە خودا دەفەرمێ: ﴿يَوْمَ يُكْشَـــفُ عَنْ سَاقٍ﴾القلم: ٤٢)).

جا تاقیکردنەوە تەنها بەچونە بەهەشت و دۆزەخ بەکۆتا دێ، ئەوەی قورطوبیش باسی کردوە کە خواناسین لەو رۆژیدا زەروریە راستە، بەڵام تاقیکردنەوەکە بەفەرمان و نەهی کردن دەبێ، هەروەکو لەهەندێك دەقاندا هاتوە، کە خودا لەوێ رۆژێ فەرمانیان پێدەدا بچنە نێو ئاگر، جا ئەوەی تاعەتی هەبێ لە خۆشبەختە و بەختەوەرانە و هەرچی یاخیش بێ ناشادو بەدبەخت دەبێ.

---

التذكرة: ٥١٤

# جێباسی هەفتەم

## ئەو بڕەی لەم ئوممەتە دەچنە بەهەشت

کۆمەڵانێکی گەلەك زۆر لەم ئوممەتە دەچنە بەهەشت کەهەر خوا دەزانێ چەندن، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموی[1]:

((عرضت عليَّ الأمم فأخذ النبيّ يمرّ معه الأمة والنبيّ يمرّ معه النفر والنبيّ يمرّ معه العشرة والنبيّ يمرّ معه الخمسة والنبيّ يمرّ وحده، فنظرت فإذا سواد كثير، قلت: يا جبريل هؤلاء أمتي؟ قال: لا، ولكن انظر إلى الأفق، فنظرت فإذا سواد كثير، قال: هؤلاء أمتك وهؤلاء سبعون ألفا قدامهم لا حساب عليهم ولا عذاب: ئوممەتەکانم بۆ رانوێنران ، پێغەمبەر هەبو ئوممەتێکی لەگەڵ تێدەپەڕی، پێغەمبەر هەبو چەند کەسێکی لەگەڵدا ڕەت دەبو، پێغەمبەر هەبو دە کەسی لەگەڵدا بو، هەبو پێنج کەس، پێغەمبەریش هەبو بەتەنێ تێدەپەڕی، کە سەیرم کرد ڕەشایەتیەکی زۆرم دیت، گوتم: جبریل، ئەوانە ئوممەتی منن؟ گوتی: نەخێر ، بەڵام تۆ سەیری ئاسۆکە، کە تێڕامام ڕەشاتیەکی زۆرم دیت، گوتی : ئەوانە ئوممەتی تۆن، ئەوانەش هەفتا هەزارن پێشیان کەوتون، نە حسێبیان لەسەرە نە ئەشکەنجە))[1].

یەکەم ڕەشاتیش کە پێغەمبەر ﷺ بەئوممەتی خۆی تێگەیشت بەنی ئیسرائیل بون، هەروەکو لەهەندێ گێڕانەوەی صەحیحدا وا هاتوە:

((فرجوت ان تکون امتي فقيل هذا موسى وقومه: تکام وابو ئەوانە ئوممەتی من بن، گوتیان ئەمە موساو قەومەکەیەتی))[2].

گومانیش لەوەدا نیە کە ئوممەتی موحەممەد ﷺ لەبەنی ئیسرائیل زیاترن کە

---

[1] رواه البخاري عن سعيد بن جبير قال: حدثني ابن عباس قال:..، كتاب الرقاق، باب يدخل الجنة سبعون الفا، فتح الباري: (١١/٤٠٦).

[2] فتح الباري: (١١/٤٠٧).

لەفەرمودەکە دەڵێ: ڕەشاتیەکی زۆر ، ئیبنی حەجەر دەڵێ: لەگێڕانەوەی سەعیدی کوڕی مەنصور بەرەشاتیەکی مەزن هاتوەو ئەمەشی زیادە:

((فقيل لي: انظر الى الأفق، فنظرت فإذا سواد عظيم، فقيل لي: انظر الى الأفق الآخر مثله: جا پێم گوترا: سەیری ئاسۆ بکە، تەماشام کرد ڕەشاتیەکی مەزنم دیت، جا پێم گوترا هەروەکو ئەو تەماشای ئاسۆیەکی دیکەش بکە)).

لەگێڕانەوەی ئیبنی فوضەیل وا هاتوە ((فإذا سواد قد ملأ الأفق، فقيل لي: انظر هاهنا، وهاهنا في آفاق السماء: ڕەشاتیەکم دیت ئاسۆی پڕکردبو، پێمیان گوت: سەیری ئا ئێرە بکە. ئێرەش لەئاسۆگەی ئاسمانێ)).

لەفەرمودەی ئیبنی مەسعودیش: ((فاذا الافق قد سدّ بوجوه الرجال: بەری ئاسۆ بەسەروچاوی پیاوان گیرابو)).

لەبێژەی ئەحمەدیش: ((فرأيت امتي قد ملؤوا السهل والجبل، فأعجبني كثرتهم وهيأتهم، فقيل: أرضيت يا محمد؟ قلت: نعم يا رب: ئوممەتی خۆم دیت دەشت و کێویان پڕکردبو، سەرسام بوم لەزۆری و شێوەیان، گوتیان: ئایا ڕازی بوی ئەی موحەممەد؟ گوتم: بەڵێ ئەی پەروەردگارم)) [1].

لەهەندێك فەرمودانیش هاتوە کە هەر هەزار لەهەفتا هەزارەکەی هەفتا هەزار و سێ گوڵمیان بەگۆڵمی خوا لەگەڵدایە. ئەبو ئومامە دەڵێ: گوێم لێبو پێغەمبەرﷺ فەرموی:

((وعدني ربي أن يدخل الجنة من أمتي سبعين ألفا لا حساب عليهم ولا عذاب، مع كل ألف سبعون ألفا، وثلاث حثيات من حثيات ربي: پەروەردگارم بەڵێنی پێدام هەفتا هەزار لەئوممەتی من بەبێ لێپرسینەوەو ئەشکەنجە بباتە بەهەشت، لەگەڵ هەر هەزاری هەفتا هەزارو سێ گۆڵم لەگۆڵمی پەروەردگارم)) [2].

دیارە ئەو سێ گۆڵمەش خەڵکێکی زۆر دەبەنە بەهەشت.

---

[1] فتح الباري: (١١/٤٠٨).

[2] في مسند احمد، وسنن الترمذي وابن ماجه؛ مشكاة المصابيح: (٦٤/٣) ورقمه ٥٥٥٦، وقد حسنه الترمذي وصحح الشيخ ناصر إسناده.

پێغەمبەری پایەدارمان ﷺ تکای دەخواست ئەم ئوممەتە نیوەی خەڵکی بەهەشتیێ بن، لەفەرمودەی بوخاری و موسلیم لەئەبو سەعیدی خودری لە پێغەمبەر ﷺ هاتوە کە باسی نێردەی ئاگری فەرموە لەکۆتاییدا هاتوە:

((والذي نفسي بيده إني ارجو أن تكونوا ربع اهـــل الجنـــة: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە وا دەخوازم ئێوە چاریەکی بەهەشتییان بن)).

ئێمەش تەکبیرمان کرد، فەرمووی:

((ارجو ان تكونوا ثلث اهل الجنة: تکام وایە سێیەکی خەڵکی بەهەشت بن)).

تەکبیرمان کرد، فەرمووی: ((ارجو ان تكونوا نصـــف اهـــل الجنـــة: وا تکادەکەم ئێوە نیوەی خەڵکی بەهەشت بن)).

تەکبیرمان کرد، فەرمووی: ((ماأنتم في الناس الاّ كالشعرة السوداء في جلد ثور أبيـــض، أو كشعرة بيضاء في جلد ثور أسود: ئێوە لەنێو خەڵکی وەك تاڵە مویەکی رەشن لەپێستی گایەکی سپی، یاوەکو داوە مویەکی سپین لەپێستەی گایەکی رەش))[1].

تەنانەت لەهەندێ فەرمودان هاتوە کە ئەم ئوممەتە دەگاتە دوسێیەکی خەڵکی بەهەشت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

((أهل الجنة عشرون ومائة صف، ثمانون منها من هذه الأمة، وأربعون مـــن ســـائر الأمـــم: خەڵکی بەهەشت صەدو بیست ریزن، هەشتایان لەم ئوممەتەن و، چلیشیان لەئوممەتەکانی تر))[1].

هەروەها لەصەحیحی موسلیمدا لەئەنەس (رەزای خوای لێبێ) هاتوە دەڵێ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

((أنا أول شفيع في الجنة لم يصدّق نبي من الأنبياء ما صدقت وإن من الأنبياء نبيّاً ما صدقه من أمته إلا رجـــل واحـــد: من یەکەم تکاکارم لەبەهەشت. هیچ پێغەمبەرێك هێندەی من

[1] مشكاة المصابيح: (٣/٥٨) ورقم الحديث ٥٥٤١.

باوەڕی پێنەکراوە، لەنێو پێغەمبەرانیش یەکێك هەیە تەنیا یەك پیاو لەئوممەتەکەی باوەڕی پێ هێناوە))[2].

نهێنی زۆری ئەوانەی لەم ئوممەتە بڕوایان هێناوە لەوەیدایە کە پەرجو(معجزة)ی هەرە گەورەی پێغەمبەر ﷺ سروشێکە دەخوێنرێتەوەو عەقڵو دڵان دەدوێنێ، موعجیزەیەکە تا ڕۆژی قیامەتێ بەپارێزراوی دەمێنێ، لەهەردو صەحیحان لەئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێ) هاتوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((ما من الأنبياء نبي إلا قد أعطي من الآيات ما مثله آمن عليه البشر، وإنما كان الذي أوتيت وحيا أوحى الله إلي. وأرجو أن أكون أكثرهم تابعا يوم القيامة: هەر یەکێك لە پێغەمبەرانی خوا نیشانەی بێوێنەی دراوەتێ خەڵك بڕوایان پێهێناوە، ئەوەی بۆ منیش هاتوە نیگایەکە خودا بۆی نیگاکردوم، تکام وایە لەڕۆژی قیامەتێدا شوێنکەوتەم لەهەمویان زۆرتربێ))[3].

[1] في سنن الترمذي باسناد حسن وسنن الدارمي، و (البعث والنشور) للبيهقي، عن بريدة؛ مشكاة المصابيح: (٩٢/٣)، ورقم الحديث ٥٦٤٤.

[2] مشكاة المصابيح: (١٢٤/٣) ورقمه ٥٧٤٤.

[3] مشكاة المصابيح: (١٢٤/٣) ورقمه ٥٧٤٦.

## جێباسی هەشتەم

## سەروەرانی خەڵکی بەهەشت

### خوازگەی یەکەم

### هەردو سەروەری بەتەمەنانی خەڵکی بەهەشت

**پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ :** ((أبوبكر وعمر سيدا كهول أهل الجنة من الأولين والآخرين: **ئەبو بەکرو عومەر سەروەری بەتەمەنانی خەڵکی بەهەشتن لەنێو پێشین و پاشینان))**[1].

### خوازگەی دوەم

### هەردو سەروەری لاوانی خەڵکی بەهەشت

**پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێداوین کە حەسەن و حوسێن سەروەری لاوانی خەڵکی بەهەشتن، ئەمەش بەرێگەیەکی زۆر سەلماوە کە دەگاتە پلەی تەواتور، شیخ ناصیروددینی ئەلبانی لەکتێبی بەهاداری (سلسلة الاحاديث الصحيحة) رێگەکانی فەرمودەکەی کۆکردۆتەوە، لەئەبو سەعیدی خودری هاتوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:**

---

[1] سلسلة الاحاديث الصحيحة (٤٨٧/١٢) ورقمه:٨٢٤. ورواه جمع من الصحابة منهم علي بن ابي طالب، وانس بن مالك، وابو جحيفة، وجابر بن عبدالله، وابو سعيد الخدري، وقد ذكر الشيخ ناصرالدين الالباني طرقه في كتب السنة، وقال في خاتمة تخريجه للحديث: (وجملة القول ان الحديث بمجموع طرقه صحيح بلا ريب، لان بعض طرقه حسن لذاته، وبعضه يستشهد به...).

((الحسن والحسين سيدا شباب اهـــل الجنـــة: حەسەن و حوسێن سەروەری جحێڵانی خەڵکی بەهەشتن)) [1].

هەروەها لەحوذەیفەوە هاتوە دەڵێ: چومە لای پێغەمبەر ﷺ ونوێژی مەغریبم لەگەڵیدا کرد، ئەوجا هەستا تا عیشایێ نوێژی کرد، پاشان چوە دەری، منیش شوێنی کەوتم، فەرموی:

((عرض لي ملك استأذن ربه أن يسلم عليّ ويبشرني في أن الحسن والحسين سيدا شباب اهـــل الجنـــة: فریشتەیەك هاتە لام کە موڵەتی لەپەروەردگاری خواستبو تا سلاوم لێبکاو موژدەم بداتێ کە حەسەن و حوسێن سەروەرانی گەنجانی بەهەشتیانن)) [2].

لەعەبدوڵڵای عومەریش کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((ابناي هذان سيدا شباب اهل الجنة: ئەم دو کوڕەم سەروەری لاوانی بەهەشتیانن)) [3].

## خوازگەی سێیەم

## سەروەرانی ئافرەتانی خەڵکی بەهەشت

سەروەری راستەقینە ئەوەیە کە خودای پەروەردگاری ستایشی بکاو گەواهی بۆبدا، خانم و خاتونی گەورەش ئەوەیە کە پەروەردگاری لێی رازی بێ، چاکترینی ئافرەتانیش ئەوانەن نازوفرەیی بەهەشت وەدەست دێنن، پلەو پایەی ئافرەتانی خەڵکی بەهەشتیش لێکدی جودایە. سەرەوەری ژنانی خەڵکی بەهەشتیش خەدیجە، فاطیمە، مەریەم و ئاسیەن، لەئیبنی عەبباس هاتوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ چوار هێلی

[1] رواه الترمذي والحاكم والطبراني واحمد وغيرهم.

[2] رواه الترمذي وابن حبان والطبراني واحمد وغيرهم.

[3] اخرجه الحاكم وابن عساكر؛ وإن أحببت أن تقف على رواته، ومخرجيه من كتب السنة، فأرجع الى سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٤٣٨/٢) ورقم الحديث: ٧٩٧.

**لەسەر زەویدا کێشا، پاشان گوتی:**

((تدرون ما هذا؟: **دەزانن ئەمە چیە؟)) گوتیان: خوداو پێغەمبەرکەی چاتر دەزانن، فەرموی:**

((أفضل نساء أهل الجنة خديجة بنت خويلد، وفاطمة بنت محمد، ومريم ابنة عمران، وآسـية بنت مزاحـم امـرأة فرعـون: **چاکترین ئافرەتانی خەڵکی بەهەشت خەدیجەی کچی خوەیلیدو فاطمەی کچی موحەممەدو مەریەمی کیژی عیمران و ئاسیای کچی موزاحیمی ژنی فیرعەونە))**[1].

**مەریەم و خەدیجەش باشترینی چوار ئافرەتەکەن، لەعەلی ئەبو طالیب هاتوە کەپێغەمبەرﷺ فەرموی:**

((خير نسائها مريم وخـير نسـائها خديجـة: **چاکترین ئافرەتانی بەهەشت مەریەمە و چاکترین ئافرەتانی بەهەشت خەدیجەیە))**[2].

**مەریەمیش سەروەری ئافرەتانی پێشینەو بەرەهایی چاکترینی هەمو ئافرەتانە، لەجابیرەوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:**

((سيدات نساء اهل الجنة بعد مريم ابنة عمران؛ فاطمة، وخديجة، وآسـية إمـرأة فرعـون: **سەروەرانی ئافرەتانی بەهەشتنشین پاش مەریەمی کیژی عیمران؛ فاطمە و خەدیجەو ئاسیەی ژنی فیرعەونە)).**[3]

**مەریەم بەشێوەیەکی ڕەها لەهەمو ئافرەتان چاکترە و قورئان بەراشکاوی رایگەیاندوە:**

﴿وَإِذْ قَالَتِ الْمَلاَئِكَةُ يَامَرْيَمُ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَاكِ وَطَهَّرَكِ وَاصْطَفَاكِ عَلَى نِسَاءِ

---

[1] في مسند احمد ومشكل الاثار للطحاوي ومستدرك الحاكم باسناد صحيح؛ سلسلة الأحاديث الصحيحة: (١٣/٤) ورقمه ١٥٠٨.

[2] رواه البخاري في صحيحه، كتاب المناقب الأنصار، باب تزويج النبيﷺ خديجة وفضلها، فتح الباري: (١٣٣/٧).

[3] رواه الطبراني باسناد صحيح على شرط مسلم؛ سلسلة الأحاديث الصحيحة، (٤١٠/٣) ورقمه ١٤٢٤.

## خوازگەی دوەم

## ژن بۆ مێردی دواینیەتی

لەمەیمونی کوڕی مەهران هاتوە دەڵێ: موعاویەی ئەبو سوفیان (رەزای خوای لێبێ) خوازبێنی ئوم دەرداءی کرد، بەلاّم ئەم مێردی پێنەکرد و گوتی: لەئەبو دەرداءم بیست دەیگوت: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((المرأة في آخر أزواجها، أو قال: لآخر أزواجها: ژن بۆ مێردی دواینیەتی))[1].

دو فەرمودەی مەوقوفیش گەواهی ئەم فەرمودەیەن:

یەکەم: (ئەسمائی کچی ئەبوبەکر ژنی زوبێری کوڕی عەوام بو، ئەمیش لەگەڵیدا توند بو، ئەسماء هاتە لای باوکیو گازاندەی حاڵی خۆی لاکرد، ئەویش گوتی: کیژەکەم ئارامت بێ، چونکە ئەگەر ئافرەت مێردێکی صاڵحی هەبو، مێردەکەی مرد، ژنەکەش شوی نەکردەوە، لەبەهەشتێ خودا کۆیان دەکاتەوە)[2].

دوەمیش ئەوەیە کە حوذەیفە بەژنەکەی گوت: (ئەگەر حەز دەکەی لە بەهەشتیش ژنی من بی، لەپاشە من مێرد مەکەوە، چونکە ژن لەبەهەشتێدا بۆ دوایین مێردی دنیایەتی)[3].[4]

هەر بۆیەشە خودا لەخێزانەکانی پێغەمبەرﷺی حەرام کردوە لەپاش ئەو مێردبکەنەوە، چونکە لەقیامەتیشدا هەر خێزانی پێغەمبەرن.

---

[1] رواه ابو علي الحراني في(تأريخ الرقة) عن ميمون بن مهران، ورجال هذا الاسناد موثوقون غير العباس بن صالح فليس له ترجمة، ورواه ابو الشيخ في التاريخ باسناد صحيح مقتصراً منه على المرفوع، ورواه الطبراني في معجمه الاوسط باسناد ضعيف، ولكنه بمجموع الطريقين قوي، والمرفوع منه صحيح.

[2] يرويه ابن عساكر عن عكرمة ورجاله له ثقات الا ان فيه ارسالاً لان عكرمه لم يدرك ابا بكر الا ان يكون تلقاه عن اسماء .

[3] اخرجه البيهقي في السنن

[4] ئەم توێژینەوەیە بە کورتکراوەیی وەرگیراوە لە (سلسلة الأحاديث الصحيحة)ی الشيخ ناصر: (٣/٢٧٥) ورقم الحديث: ١٢٨١.

## خوازگەی سێیەم

## پەریە چاو بەڵەکان

خوادای مەزن، بێ لەژنەکانی دنیایان ژنانی زۆر جوانی دیکە بەبەهەشتییان دەبەخشێ، وەك دەفەرمێ:

﴿كَذَلِكَ وَزَوَّجْنَاهُمْ بِحُورٍ عِينٍ: بەم شێوەیە پەری چاوبەڵەکمان کردنە هاوسەریان.﴾ الدخان:٥٤.

(حور) کۆی وشەی (حوراء)ە لە عارەبی بەو ژنەی دەگوترێ کە سپێنەی چاوی زۆر سپی و رەشێنەکەشی یەکجار رەش بێ، (عین)یش کۆی وشەی (عیناء)ـە کە بریتیە لەو ژنەی چاوانی فراوان و گەورەن.[1]

قورئانی پیرۆزیش ئەو پەریە چاوبەڵەکانەی بەکیژۆڵەی مەمك خڕی هاوتەمەن وەسف کردوە، خودای کاربەجێ دەفەرمێ:

﴿إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ مَفَازًا، حَدَائِقَ وَأَعْنَابًا، وَكَوَاعِبَ أَتْرَابًا: پارێزکاران سەرکەوتنی راستەقینە وەدەست دێنن، باخانی رازاوەو ترێی جۆراجۆر، دەگەل کیژۆڵانی جوانی مەمك خڕی هاوتەمەن و تازە پێگەیشتو﴾ النبأ:٣١-٣٣.

ئەو پەریە چاوبەڵەکانە، بەدیهێنراوی خوان لەبەهەشت خوای گەورە دروستی کردون و کردونی بەکچ، هەمویان لەیەك تەمەندان، بۆ خۆشەویست بون لای مێردیان بەلەنجەولار نازو عیشوە دەنوێنن.

﴿إِنَّا أَنشَأْنَاهُنَّ إِنشَاءً، فَجَعَلْنَاهُنَّ أَبْكَارًا، عُرُبًا أَتْرَابًا: ئێمە بەدروستکردن دروستمان کردون، کردومانن بەکچ بەنازو عیشوە خۆخۆشەویست دەکەن بۆ مێردیان و هاوتەمەنن﴾ الواقعة:٣٥-٣٧.

---

[1] لەکوردیشدا بەحۆری دەگوترێ پەری، بۆ ئەم وەسفەش چاوبەڵەکمان بەکارهێناوە. وەرگێڕ.

**مادام کیژن نابێ کەسی دی پێشتر هاوسەریان بوبێ، هەروەك خودا دەفەرمێ:**

﴿لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلاَ جَانٌّ: **نە ئادەمی نە جنۆکە پێشتر توخنیان نەکەوتون**﴾الرحمن:٥٦.

**ئەم ئایەتەش ئەو بۆچونە رەت دەکاتەوە کە دەڵێ: مەبەست لەژنانی هاوسەر کە خودا لەبەهەشتی دروستیان دەکاو دایاندەمەزرێنێ، ژنەکانیانە لەدنیا کە پاشی ئەوەی پیر دەبن، خودا گەنجیان دەکاتەوە، جا ئەم واتایە زۆر راستە، جا خوا ئافرەتە بڕوادارەکان لە تەمەنی گەنجێتی دەباتە بەهەشت، بەڵام ئەوان ئەو پەریە چاوبەڵەکانە نین کە خودا دروستیان دەکا.**

**هەروەها قورئانی پیرۆز باسی جوانی ئافرەتانی بەهەشتی بۆ کردوین، وەك دەفەرمێ:**

﴿وَحُورٌ عِينٌ، كَأَمْثَالِ اللُّؤْلُؤِ الْمَكْنُونِ: **پەریانێکی چاوبەڵەك، بەوێنەی مرواری شاراوەو هەڵگیراو لەنێو پۆرگی خۆی**﴾ الواقعة:٢٢.

**کە نەتیشکی خۆر و نە دەستێوەردان، بێپەڵەیی رەنگی نەگۆڕیون، لەشوێنێکی تریشدا بە یاقوت ومەرجانیان دەشوبهێنێ:**

﴿فِيهِنَّ قَاصِرَاتُ الطَّرْفِ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنْسٌ قَبْلَهُمْ وَلاَ جَانٌّ، فَبِأَيِّ آلاَءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ، كَأَنَّهُنَّ الْيَاقُوتُ: **لەو باخچانە پەریگەلێك هەن چاولەدەر نین، نە مرۆڤ و نە جنۆکە پێشتر تخونیان نەکەوتون، بەکام نیعمەت و نازی پەروەردگارتان بێبڕوان، ئەو پەریانە دەڵێی یاقوت و مەرجانن.**﴾الرحمن:٥٦-٥٨.

**دیارە یاقوت و مەرجانیش دو بەردی ناوازەو جوانن، دیمەنیان گەلێك دڵگیرە، هەروا پەریانی وا باس کردوە کە چاو لەدەرنین، واتە چاودان و رامانیان بەتەنیا بۆ مێردەکانیانەو بێجگە لەوان چاو بۆ کەسی دی ناگێڕن، خودای مەزن گەواهی بۆ جوانی و شۆخ و شەنگی پەریانی بەهەشتێ داوە، ئەگەر خواش شایەدیان بێ دیارە لەوپەڕی نازداری شۆخ و شەنگیو چەلەنگی و جوانی دان:**

﴿فِيهِنَّ خَيْرَاتٌ حِسَانٌ، فَبِأَيِّ آلاَءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ، حُورٌ مَقْصُورَاتٌ فِي الْخِيَامِ:

لەوێدا ژنانی خوچاك و جوان چاك هەن. جا كام نیعمەتی پەروەردگارتان بەدرۆ دەخەنەوە، پەریگەلێكی چاوبەڵەك لەنێو چادران داپۆشراون﴾ الرحمن: ٧٠-٧١.

ئافرەتانی بەهەشت وەك ئافرەتانی دنیایێ نین، پاكن لەبێنوێژی و زەیستانی و تف و چڵم و میزو پیسایی، ئەم ئایەتەش وا دەگەیەنێ:

﴿وَلَهُمْ فِيهَا أَزْوَاجٌ مُطَهَّرَةٌ وَهُمْ فِيهَا خَالِدُونَ: لەبەهەشتدا هاوسەری پاك و خاوێنیان هەیەو هەمیشە لەوێدا دەمێننەوە﴾ البقرة: ٢٥.

پێغەمبەر ﷺ باسی جوانی ئافرەتانی بەهەشتی بۆ كردوین، ئەبو هورەیرە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((أول زمرة تلج الجنة صورهم على صورة القمر ليلة البدر، لا يبصقون ولا يتمخطون ولا يتغوطون، آنيتهم فيها الذهب أمشاطهم من الذهب والفضة ومجامرهم الألوه، ورشحهم المسك، ولكل واحد منهم زوجتان يرى مخ سوقهما من وراء اللحم من الحسن: یەكەم پێڕ كە دەچنە بەهەشت لەوێنە وەك مانگی چاردەن، نە تف دەكەن و، نەچڵم دەسڕن و، نە دەچنە سەرپێشاوێ، دەفرەكانیان زێڕە، شانەكانیان لەزێڕو زیوە، بۆن و بەرامدانیان عودی هیندی تیادەسوتێ، ئارەقەیان موشكە، هەریەكەیان دو ژنی هەیە، مۆخی قاچیان لەجوانیان لەو دیو گۆشتەوە دەبینرێ))[1].

دە چاوبدە ئەو جوانیەی پێغەمبەر ﷺ باسی فەرموە و بزانە كەس لەم شێوەیە دەناسی؟

((ولو أن امرأة من أهل الجنة اطلعت إلى أهل الأرض لأضاءت ما بينهما ولملأته ريحاً، ولنصيفها على رأسها خير من الدنيا وما فيها: ئەگەر ژنێك لەبەهەشتنشینان سەرێك بە زەوی دابگرێ، نیوانی زەوی و ئاسمانێ روناك دەكاو پڕ بۆنی خۆشی دەكا، هەر تەنیا لچكەكەی سەری لەدنیاو ئەوەی كە تێیدایە چاكترە))[2].

---

[1] رواه البخاري في صحيحه، كتاب الخلق، باب ما جاء في صفة الجنة، فتح الباري: (٦/٣١٨) ورواه مسلم في كتاب الجنة وصفة نعيم اهلها، باب اول زمرة تدخل الجنة: (٤/٢١٧٨). ورقمه ٢٨٣٤.

[2] رواه البخاري في صحيحه، كتاب الجهاد، باب وزوجناهم بحور عين، فتح الباري: (٦/١٥).

دیاریکردنی دو ژنانیش بۆ هەر کەسێك لەبەهەشتدا، دیارە کەمترین ژمارەیە، دەنا باسی ئەوە هاتوە کە شەهید هەفتاو دو ژنی لەپەریانی چاوبەڵەك دەبێ، هەروەکو پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ:

((للشهيد عند الله ست خصال يغفر له في أول دفعة من دمه ويرى مقعده من الجنة ويجار من عذاب القبر ويأمن من الفزع الأكبر ويوضع على رأسه تاج الوقار الياقوتة منها خير من الدنيا وما فيها ويزوج اثنتين وسبعين زوجة من الحور العين ويشفع في سبعين من أقربائه: شەهید لەلای خودای مەزن شەش خەسڵەتی هەیە: لەگەڵ یەکەم بلقە خوێنی لێی دەبورێو، نشینگەی خۆی لەبەهەشتێدا دەبینێو، لەئەشکەنجەی گۆڕ پەنا دەدرێو، لەپەرژەنگی هەرە گەورەی ڕۆژی قیامەتێ ئارام دەبێ، تانجی شکۆی دەخرێتە سەر، هەریاقوتێك لەو تانجەیدا چاکترە لەدنیاو ئەوەی تێیداو، هەفتاودو پەری چاوبەڵەکی دەکرێتە هاوسەرو، بۆ هەفتا لەنێزیکانی شەفاعەتی گیرادەبێ))[1].

## گۆرانی پەریانی چاو بەڵەك

پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێداوین: کە پەریە چاوبەڵەکەکان لەباخانی بەهەشتێدا بەدەنگی خۆش وزایەڵەی پڕجۆش و، بەئاهەنگ و ئاوازی ساز ستران و گۆرانی دەچڕن، لەئیبنی عومەر هاتوە، لە پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرمێ:

((إن أزواج الجنة ليغنين أزواجهنَّ بأحسن أصوات ما سمعها احد قط. إن مما يغنين: نحن الخيِّرات الحسان، أزواج قوم كرام، ينظرن بقرة اعيان، وإن مما يغنين به: نحن الخالدات فلا يَمتْنه، نحن الآمنات فلا يخفنه، نحن المقيمات فلا يظعنه: ژنانی خەڵکی بەهەشت بەخۆشترین دەنگ و بەجوشترین زایەڵەی وا هیچ کەس پێشتر نەیبیستبێ. گۆرانی بۆ مێردیان دەڵێن، لەو گۆرانانەی دەیڵێن: ئێمە جوانگەلێکی چاکین، هاوسەری خەڵکێکی پاکین،

---

[1] في سنن الترمذي وسنن ابن ماجه باسناد صحيح عن المقدام بن معدي كرب؛ مشكاة المصابيح: (٣٥٨/٣)، ورقمه ٣٨٣٤.

بەروناكی چاوان دەڕوانین، هەروەها بەم گۆرنیانەش دەڵێن: ئێمە بۆ هەمیشەین و قەت نامرین، ئێمە ئاسایشمان لایەو ترسمان لێناكرێ، ئێمە هەر نیشتەجێین و گەشتان ناكەین))[1].

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ: ((إن الحور العين لتغنين في الجنة، يقلن: نحن الحور الحسان، خبئنا لأزواج كرام: پەریە چاوبەڵەكەكان لەبەهەشتدا گۆرانیان دەڵێن و دەڵێن: ئێمە پەریە جوانەكانین، بۆ مێردە بەڕێزەكان حەشاردراوین))[2].

## غیرەی پەریە چاوبەڵەكەكان لەئاست مێردەكانیان لەدنیادا

پێغەمبەر ﷺ پێی راگەیاندوین كە پەریە چاوبەڵەكەكان غیرەیان هەیە بەرامبەر مێردەكانیان لەدنیادا، ئەگەر یەكێكیان لەلایەن ژنی دنیایەوە ئازار درا، لە موعاذ هاتوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((لا تؤذي امرأة زوجها في الدنيا إلا قالت زوجته من الحور العين لا تؤذيه قاتلك الله فإنما هو عندك دخيل عندك، يوشك أن يفارقك إلينا: هەر ژنێك لەدنیا مێردەكەی ئازاردا، ژنەكەی لەپەریانی چاوبەڵەك دەڵێ: ئازاری مەدە، هەی خوا دەگەڵت بجەنگێ، ئەو بەئەمانەت لەلای تۆیە، هێندەی نەماوە جێت بێڵێ و بۆ لای مە بێ))[3].

---

[1] صحيح الجامع الصغير: (٤٨/٢) ورقم الحديث: ١٥٥٧ واسناده صحيح، وعزاه الشيخ ناصر ايضا الى الطبراني في الأوسط، والى ابي نعيم، والضياء في صفة الجنة.

[2] رواه سمويه في (فوائده) عن انس؛ صحيح الجامع: (٥٨/٢) ورقمه ١٥٩٨.

[3] في مسند احمد وسنن الترمذي باسناد صحيح؛ صحيح الجامع الصغير: (١٢٥/٦) ورقم الحديث: ٧٠٦٩.

## خوازگەی چوارەم

## بڕوادار لەبەهەشتێ هێزی سەد پیاوی دەدرێتێ

لەئەنەسەوە هاتوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((یعطی المؤمن في الجنة قوة کذا وکذا من الجماع: بڕوادار لەبەهەشتێ توانای هێندەو هێندە جوتبونی دەدرێتێ)).

گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، جا بەرگەی ئەو هەموەی دەگرێ؟

فەرموی: ((یعطی قوة مائة رجل: هێزی سەدپیاوی دەدرێتێ)) [1].

---

[1] رواه الترمذي؛ مشکاة المصابیح: (٣/٩٠) ورقمه ٥٦٣٦، وقال محقق المشکاة: (قال الترمذي: حديث صحيح غريب)، قلت(المحقق): واسناده حسن، بل هو صحيح، لأن له شواهد منها عن زيد ابن ارقم عند الدارمي بسند صحيح.

## جێباسی دەیەم

## پێکەنینی بەهەشتیەکان بەدۆزەخییان

پاش ئەوەی بەهەشتی دەچنە بەهەشتێ دژمنە بێبڕواکانی نێو دۆزەخیان بانگ دەکەن و سویان دەکەنەوەو سەرکۆنەیان دەکەن:

﴿وَنَادَى أَصْحَابُ الْجَنَّةِ أَصْحَابَ النَّارِ أَنْ قَدْ وَجَدْنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقًّا فَهَلْ وَجَدْتُمْ مَا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقًّا قَالُوا نَعَمْ فَأَذَّنَ مُؤَذِّنٌ بَيْنَهُمْ أَنْ لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ:

بەهەشتیان بانگی دۆزەخیانیان کرد کە ئێمە گەیشتینە ئەوەی خودا بەهەق بەڵێنی پێدابوین، جا ئایا ئێوەش بەبەڵێنی خۆتان گەیشتن. دەڵێن: بەڵێ. جا بانگوێژێك لەنێو ئەوان هاوار دەکا نەفرەتی خوا لەستەمکاران بێ﴾الاعراف:٤٤.

بێبڕواکان لەدنیادا رقەبەری و دژایەتی بڕوادارانیان دەکردو گاڵتەو فشەو قەشمەرییان پێ دەکردن، لەوێ رۆژی بڕواداران سەردەکەون، جا کە ئەوان لەنازونیعمەتی بەردەوامی بەهەشتێ دان، تەماشای تاوانباران دەکەن و تەوزەو تیزو گەپ و گاڵتەیان پێدەکەن:

﴿إِنَّ الأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ، عَلَى الأَرَائِكِ يَنظُرُونَ، تَعْرِفُ فِي وُجُوهِهِمْ نَضْرَةَ النَّعِيمِ، يُسْقَوْنَ مِنْ رَحِيقٍ مَخْتُومٍ، خِتَامُهُ مِسْكٌ وَفِي ذَلِكَ فَلْيَتَنَافَسْ الْمُتَنَافِسُونَ، وَمِزَاجُهُ مِنْ تَسْنِيمٍ، عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا الْمُقَرَّبُونَ، إِنَّ الَّذِينَ أَجْرَمُوا كَانُوا مِنْ الَّذِينَ آمَنُوا يَضْحَكُونَ، وَإِذَا مَرُّوا بِهِمْ يَتَغَامَزُونَ، وَإِذَا انقَلَبُوا إِلَى أَهْلِهِمْ انقَلَبُوا فَكِهِينَ، وَإِذَا رَأَوْهُمْ قَالُوا إِنَّ هَؤُلاَءِ لَضَالُّونَ، وَمَا أُرْسِلُوا عَلَيْهِمْ حَافِظِينَ، فَالْيَوْمَ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْ الْكُفَّارِ يَضْحَكُونَ، عَلَى الأَرَائِكِ يَنظُرُونَ، هَلْ ثُوِّبَ الْكُفَّارُ مَا كَانُوا يَفْعَلُونَ:

چاکان لەنازی بەهەشتدان، لەسەر تەختگەلێك پاڵیان داوەتەوەو دەڕواننە جوانی بەهەشت، شادی نازو نیعمەت لەدەم و چاویان بەدی دەکەی. ئەوانە لەشەرابی زوڵاڵی سەرمۆر تێرئاو دەکرێن، مۆری سەریان لەموشکە، جا ئەوانەی پێشبرکێ دەکەن با لەمەدا خۆپێش خەن. وە ئەم شەڕابە لەگەڵ تەسنیم لێکدراوە؛ کانیاوێکە نێزیکان لێی دەخۆنەوە، بێگومان کەسانێك کە تاوانیان کردوە لەدنیادا بەبڕواداران پێدەکەنن،

هەر کاتێکی بەلایاندا ڕەت دەبن، تیزو گاڵتەیان پێ دەکەن، وە هەر کاتێك گەڕانەوە لای خزم و کەسیان بەشادی و خۆشی دەگەڕانەوە، وەهەر کاتێکیش چاویان بەبڕواداران دەکەوت، دەیانگوت ئەمانە لاڕێن، کە هەرگیز نەنێردرابون تا پارێزگاریان لێبکەن، جا ئەمڕۆ بڕواداران بەکافران پێدەکەنن، لەسەرتەختان پاڵیان داوەتەوەو دەڕوانن، ئایا کافران لەپای کردەوەی خۆیان پاداشیان دەستکەوتوە﴾المطففين:٢٢-٣٦.

ئەرێ، بەخوا بێبڕوایان سزای کردەوەیان وەرگرت و، سزاش لەجۆری کردەوەیە، بڕوادارانیش لەنێو خۆشی بەهەشتێرا ئەو هاودەم و برادەرەی دێتەوە بیر کە لەدنیا بێبڕوایی بۆ دەڕازاندەوەو، بۆ ڕێبیرە گومڕاکان بانگی دەکرد، کە دەیخستە ریزی کافرو بێبڕوای دوژمنانی خوا، ئەوجا باسی ئەو هاودەمەی بۆ براکانی بەهەشتی دەگێڕتەوەو بانگیان دەکا تەماشای بکەن لەو بارەگانی ئەشکەنجەی تێدا چێژدەکا، جا کە دەبینێ کەوتۆتە چ ئازارو ئەشکەنجەیەك، ئەزانی خوا چ بەهرەو نازو خۆشیەکی پێ بەخشیوە، لەنێو ئەو بارە ناخۆشەی دەرهانیوە، ئەوجا ڕوی سەرکۆنەو لۆمەکردنی تێدەکا:

﴿فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ، قَالَ قَائِلٌ مِنْهُمْ إِنِّي كَانَ لِي قَرِينٌ، يَقُولُ أَئِنَّكَ لَمِنَ الْمُصَدِّقِينَ، أَئِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَامًا أَئِنَّا لَمَدِينُونَ، قَالَ هَلْ أَنْتُمْ مُطَّلِعُونَ، فَاطَّلَعَ فَرَآهُ فِي سَوَاءِ الْجَحِيمِ، قَالَ تَاللَّهِ إِنْ كِدْتَ لَتُرْدِينِي، وَلَوْلاَ نِعْمَةُ رَبِّي لَكُنتُ مِنَ الْمُحْضَرِينَ، أَفَمَا نَحْنُ بِمَيِّتِينَ، إِلاَّ مَوْتَتَنَا الأُولَى وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ، إِنَّ هَذَا لَهُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ: جا ڕودەکەنە یەکترو لێك پرسیار دەکەن، یەکێکیان دەڵێ: من هاونشین و دۆستێکم هەبو، دەیگوت: ئایا بەراستی تۆ لەبڕوادارانی؟ ئایا کە مردین و بوینە خاك و ئێسك، جارێکی دی زندی دەبینەوەو سزا دەدرێین؟، خوا دەفەرمێ: ئایا ئێوە سەربەسەر دۆزەخ دا دەگرن، کە تێی ڕاما دیتی وا لەناوەندی دۆزەخە، پێی گوت: سوێند بەخوا نێزیك بو منیش تێخەی، گەر میهری پەروەردگارم نەبوایە ئێستا منیش لەدۆزەخدا بوم، جا ئایا ئێمە نامرین، لەیەکەم مردنمان بترازێو ئێمە ئەشکەنجە نادرێین، بەراستی هەر ئەمە دەسکەوت و بردنەوەی هەرە مەزنە﴾الصافات:٥٠-٦٠.

## جێباسی یازدەم

### پاکیو گەورەکردنی خوا لەخۆشی خەڵکی بەهەشتن

بەهەشتی خوا خانەی نازو پاداشت و سزا و ڕێزانەیە، نەك خانەی ئەرك و تاقیکردنەوە، ڕەنگە ئەمەش لەگەڵ ئەو فەرمودەی گرفتێك دروست کا کە ئەبو هورەیرە لە پێغەمبەرﷺ دەیگێرتەوە، لەباسی یەکەم پێڕ کە دەچنە بەهەشت و لەدواییەکەیدا دەفەرمێ: ((یسبحون الله بکرة وعشـــیاً: سبەینان و هیواران پاکی خوا دەکەن))[1] . بەڵام بەویستی خوای مەزن چ گیروگرفتێك لەمەدا نیە، چونکە ئەمە لەباری ئەرکباری نیە، ئیبنی حەجەر لەراڤەی فەرمودەکەدا دەڵێ: (قورطوبی دەڵێ: ئەم پاکی کردنە ئەرك و پێویست کردن نیە!جابیر فەرمودەکەی خۆی لەلای موسلیمدا وا راڤە کردوە، کە دەڵی: ((یلهمون التسبیح والتکبیر کما تلهمون النفس: چۆن ئێوە هەناسەدانتان ئیلهام دەکرێ ئەوانیش وا پاکی و گەورەکردنی خوایان ئیلهام دەکرێ، ڕوی وێکچونیش ئەوەیە کە پشیدانی مرۆڤ چ ئەرکێکی ناخاتە سەر، بەڵکو هەر بۆ خۆی پێویستەو دەبێ ببێ، جا هەناسەدانیان دەبێتە پاکی کردن، چونکە دڵانیان بەناسینی پەروەردگاری پاك روناك بۆتەوەو لەخۆشویستنی پڕ بوە، هەر کەسێکیش شتێکی خۆشویست، زۆر یادی دەکا)[2] .

شێخی ئیسلامیش وای بڕیارداوە کە ئەو تەسبیح و تەکبیرە، جۆرێکی خۆشیو نیعمەتە کە خەڵکی بەهەشتی تێدان، دەڵێ:(ئەمە کردەی ئەرکان نیە، کە داوای پاداشتێکی جودای بۆ بکرێ، بەڵکو ئەم کارە هەر بەخۆی نیعمەتێکە نەفس چێژو خۆشی لێ وەردەگرێ)[3] .

---

[1] صحیح البخاري، کتاب بدء الخلق، باب ما جاء في صفة الجنة، فتح الباري: (٣١٨/٦).

[2] فتح الباري: (٣٢٦/٦).

[3] مجموعة الفتاوي شيخ الإسلام: (٣٣٠/٤).

## جیباسی دوازدەم

## باشترین شت کە بە بەهەشتییان دەبەخشرێ ڕەزامەندی خودای گەورەو ڕوانینە بۆ ڕوی پڕشکۆی

**لەئەبو سەعید هاتوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:**

((إن الله تعالى يقول لأهل الجنة: يا أهل الجنة! فيقولون: لبيك ربنا وسعديك والخير كله في يديـــك، فيقول: هل رضيتم؟ فيقولون: وما لنا لا نرضى يا رب وقد أعطيتنا ما لم تعط أحدا من خلقك! فيقـــول: ألا أعطيكم أفضل من ذلك؟ فيقولون: يا رب وأي شيء أفضل من ذلك؟ فيقول: أحل عليكم رضـــواني فلا أســـخط عليكـــم بعـــده أبـــدا: **خودای بەرز بەخەڵکی بەهەشت دەفەرمێ: هۆ خەڵکی بەهەشت، دەڵێن: بەرفەرمان و شادمانین، خێر هەموی لەدەست تۆ دایە، دەفەرمێ: ئایا ڕازی بون؟ دەڵێن: چیمانە کە ڕازی نەبین ئەی پەروەردگار، لەکاتێکدا هێندەت پێ بەخشیوین تا ئێستە بەهیچ بەدیهێنراوێکی خۆت نەبەخشیوە، دەفەرمێ: ئەدی لەوەش چاکترتان نەدەمێ؟ دەڵێن: پەروەردگارا، چ شتێك هەیە لەوەی چاتر؟ دەفەرموێ: ڕەزامەندی خۆمتان بەسەردا بارێنم و هەرگیز لێتان توڕەنەبم))**[1].

**لەهەمو خوشیانیش خۆشتر لەبەهەشتدا ڕوانینە بۆ ڕوی پڕشکۆی پەروەردگار، ئیبنولئەثیر دەڵێ: (دیتنی پەروەردگار ئەوپەڕی مەبەستە لەخۆشیەکانی قیامەت و بالاترین پایەی بەخشینە پڕبەهاکانی خودایە، خوا پێمان ببەخشێ)**[2].

**خودای مەزن زۆر بەڕاشکاوی ڕایگەیاندوە کە بەندان لەبەهەشتێدا پەروەردگاریان دەبینن:**

﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاضِرَةٌ، إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ: **لەم ڕۆژەدا ڕوانێکی شادو گەش هەیە کە دەڕواننە پەروەردگاری خۆیان**﴾القيامة: ٢٢-٢٣.

**بێبڕواو هاوبەشدانەران لەم خۆشیە هەرە مەزنەو لەو ڕێزە بالایە بێبەشن:**

---

[1] متفق عليه؛ مشكاة المصابيح: (٣/٨٨)

[2] جامع الأصول: (١٠/٥٥٧)

﴿كلا إِنهُمْ عَنْ ربِّهِمْ يَوْمَئِـــذٍ لمَحْجُوبُـــون: نەخێر ئەوانە لەوێ ڕۆژی لەدیتنی پەروەردگاریان بێبەشن.﴾المطففين:١٥.

موسلیم و تیرمیذی لەصوهەیبی ڕۆمی(ڕەزای خوای لێبێ) دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((إذا دخل أهل الجنة الجنة، قال: يقول تبارك وتعالى: تريدون شيئا أزيدكم؟ فيقولون: ألم تبيض وجوهنا ألم تدخلنا الجنة وتنجنا من النار؟ قال: فيكشف الحجاب فما أعطوا شيئا أحب إليهم من النظر إلى ربهم تبارك وتعالى، ثم تلا هذه الآية ﴿لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَى وَزِيَادَةٌ﴾: کە بەهەشتی دەچنە بەهەشت، خوای بەرز پێیان دەفەرمێ: شتێکی دیتان دەوێ بۆتانی زێدەبکەم؟ دەڵێن: ئەدی ڕوت سپی نەکردین؟ ئەدی نەتبردینە بەهەشت و، لەدۆزەخ ڕزگارت نەکردین؟ فەرموی: ئەوجا پەردە وەلا دەچێ، هیچ شتێکیان پێ نەبەخشراوە لەلایان هێندی تەماشاکردنی پەروەردگاری بەرز خۆشەویستتر بێ، پاشان ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوێندەوە ﴿لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَى وَزِيَادَةٌ: کەسانێ کە چاکەیان کردوە، پاداشی چاك و زیادەیان بۆ هەیە﴾یونس:٢٦))[1].

لەصەحیحی بوخاری و موسلیمیش لەئەبو موسای ئەشعەری هاتوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((إن للمؤمن في الجنة لخيمة من لؤلؤة مجوفة عرضها –وفي رواية طولها– ستون ميلا، في كل زاوية منها أهل، ما يرون الآخرين، يطوف عليهم المؤمن، وجنتان من فضة آنيتهما وما فيهما وجنتان من ذهب آنيتهما وما فيهما، وما بين القوم وبين أن ينظروا إلى ربهم إلا رداء الكبرياء على وجهه في جنة عدن: بڕوادار لەبەهەشتێ خیوەتێکی هەیە لە مرواریەکی کلۆر، بەرینی – لەگێڕانەوەیەك: درێژی– شێست میلە، لەهەر گۆشەیەك خانەوادەیەکی هەن، کە ئەوانی دی نابینن. بڕوادار بەسەریاندا دەگەڕێ، دوباخیشی هەن لەزیون، دەفرەکانیان و هەر شتی تێیاندایە، دو باخیش لەزێڕ دەفرەکان و هەر شتێکی تێیاندایە. لەنێوان ئەو خەڵکە لەبەهەشتی نەمراندا و تەماشاکردنی پەروەردگاریان

[1] جامع الاصول:(١٠/٥٦٠)

تەنیا پۆشاکی مەزنێتی هەیە لەسەر ڕوی)) [1].

ڕوانین بۆ ڕوی خودای مەزن لەو زێدەیەیە کە خودا بەڵێنی بەچاکەکاران داوە:

﴿لَهُمْ مَا يَشَاءُونَ فِيهَا وَلَدَيْنَا مَزِيدٌ: هەرچی حەزیان لێبێ لەبەهەشت هەیەو زێتریشمان لا هەیە﴾ ق:٣٥.

﴿لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَى وَزِيَادَةٌ: کەسانێك کە چاکەیان کردوە، پاداشی چاك و زیادەیان بۆ هەیە﴾ یونس:٢٦.

(الحسنى) بە بەهەشت ڕاڤەکراوە، (الزيادة)ش بە تەماشاکردنی ڕوی خوای گەورە.

ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەو فەرمودەی موسلیم دەیگێڕتەوەو لەسەرەتای ئەم بەندە هێناومانەوە.

دیتنی خوداش بینینێکی ڕاستەقینەیە، نەك وەکو هەندێك کۆمەڵ بەپێوەری عەقڵی پوچ و لەڕێ دەرچونی واژەیی زۆردارانە، دیتنی خوا ڕەت دەکەنەوە، مالیکی ئەنەسی پێشەوای دارولهیجرە، لەبارەی ئایەتی ﴿إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾القيامة:٢٣. پرسیاری لێکرا و گوتیان: کۆمەڵێك هەن دەڵێن ئەو ڕوانینە بۆ پاداشتەکانی خوایە، مالیك گوتی: درۆ دەکەن، ئەدی ئەوان ئەو ئایەتە چ لێدەکەن کە دەفەرمێ:

﴿كَلَّا إِنَّهُمْ عَنْ رَبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَمَحْجُوبُونَ: نەخێر، ئەوانە لەوێ ڕۆژی لەدیتنی پەروەردگاریان پەردەپۆش کراون﴾المطففين:١٥.

مالیك گوتی: خەڵکی لەڕۆژی قیامەت بەچاوەکانیان تەماشای خودا دەکەن. هەروەها گوتی: ئەگەر بڕواداران لەڕۆژی دوایی پەروەردگاریان نەدیتبا خودا لەئاست کافران واژەی حیجابی بەکار نەدەهێنا، کە دەفەرمێ: ﴿كَلَّا إِنَّهُمْ عَنْ رَبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَمَحْجُوبُونَ﴾ [2]

طەحاویش لەعەقیدە ناودارەکەی (العقيدة الطحاوية)دا باسی پەروەردگار دیتن لەلایەن بڕوادارانەوە دەهێنێتەوە، دەڵێ: (دیتنی خوا لەلایەن بەهەشتیان هەقە، بێ

---

[1] مشكاة المصابيح: (٨٦/١٠) ورقمه:٥٦١٦

[2] رواه في (شرح السنة)؛ مشكاة المصابيح: (١٠٠/٣) ورقمه٥٦٦٣.

لەدەورەدان و چۆنیەتی، هەر بەو شێوەی قورئانی پیرۆز دەفەرمێ:

﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاضِرَةٌ، إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾ القيامة:٢٢-٢٣.

راڤەکەشی بەو شێوەیە کە خودای بەرز دەیەوێ و دەیزانێ، لەگەڵ هەمو ئەو شتانەی لەفەرمودەی صەحیحدا لەپێغەمبەر ﷺ هاتون، چۆنی فەرموە ئاوان، چۆنیشی ویستوە واتایان وایە، لەمە ڕۆ ناچین بەڕای خۆمان لێکی دەینەوەو بەئارەزو شت هەڵبەستین، چونکە هیچ کەسێك لەدینەکەی ساغ نابێ تا بۆ خوداو پێغەمبەرەکەی ﷺ ساغ دەبێ، هەر شتێکی زانستەکەی بزر بو بۆ خوای زانا دەیگێڕینەوە)[1].

راڤەکاری طەحاویش بۆچونی ئەو کۆمەڵە گومڕایانە و ڕاڕەوی ڕەواخوازانی رونکردۆتەوەو دەڵێ: (جوهمیەکان و موعتەزیلەو شوێنکەوتەکانیان لەخەوراریج و ئیمامیەکان ڕایان لەبارەی دیتنی خودا جودایە. قسەکانیشیان بەتاڵەو بە قورئان و فەرمودە ڕەت دەکرێتەوە، هاوەڵان و شوێنکەوتوان و ئەو پێشەوایانەی ئیسلام کە بەپێشەنگێتی لەدین ناسراون و، ئەهلی فەرمودەو، تایەفەکانی دیکەی ئەهلی کەلام، کەدەدرێنە پاڵ فەرمودەو کۆمەڵ، هەمو دیتن دەسەلمێنن.

پاشان گرنگی ئەو مەسەلەیەی رونکردۆتەوەو دەڵێ: (ئەم مەسەلەیەش لەپایەدارترین و شکۆدارترین بابەتەکانی بنچینەی ئاینەو، ئەو مەبەستەیە کە دینداران قۆڵ و باسکی بۆ هەڵدەکەن و لەپێناوی پێشبڕکێ ساز دەکەن، لەوان کەسانیش حەرامە کە لەپەروەردگاریان پەردەپۆش کراون و، لەدەروازەی دەرکراون).

پاشان ئەوەی رونکردۆتەوە کە ئایەتی: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاضِرَةٌ، إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾ دیارترین بەڵگەیە بۆ ئەم مەسەلەیە، هەرچی ئەوان کەسانیشن کە دەیانەوێ ماناکەی بگۆڕن بەناوی تەئویل و لێکدانەوە، ئەوا لێکدانەوەی دەقەکانی ڕۆژی دوایی و، بەهەشت و دۆزەخ و لێپرسینەوە، لەتەئویل کردنێ ساناترن بۆ تەئویلکاران، هەر کەسێکیش لەوانە بیەوێ دەقەکان تەئویل کاو لەجێی خۆی وەلایان نێ، هەر ڕێیەکی

---

[1] شرح الطحاوية: ٢٠٣

بۆ دەدۆزتەوە تا تەئویلی بکا.

ئەوجا مەترسی تەئویلکردنی ئاشکرا کردوە: (ئەمەیە کە دنیاو دینی گەند کردوە، جولەکەو دیانیش لەتەورات و ئینجیل هەروایان کرد، خوداش لەوە ئاگاداری کردوینەوە کە وەکو ئەوان بکەین، بەلاّم ئەو نەزانانە هەر ڕێگەی وانیان گرتەبەر. تەئویلی گەندەڵیش چەند کارەساتی بەسەر ئاین و دینداراندا هێناوە.

عوسمان (رەزای خوای لێبێ) هەر بەتەئویلی گەند نەبو کوژرا؟ کارەساتەکانی ڕۆژانی (جەمەل) و (صوفەین) و کوشتنی حوسەین و (حەرە) هەر لەبەر هەمان هۆ نەبون؟ لەتەئویلی گەندیش بترازێ هۆی دەرکەوتنی خەواریج و، دابڕانی موعتەزیلەو، ڕەتکردنەوەی رافیضەکان و، دابەشبونی ئەم ئوممەتە بۆ هەفتاوسێ کۆمەڵ مەگەر هەر بە تەئویلی گەند نەبو)؟

پاشان ئەوەی رونکردۆتەوە کە ئایەتەکە لەدو ڕوانەوە بەڵگەی دیتنە: یەکەم فیقهی دەقەکە، دوەم: فیقهی زانایانی پێشین بۆ ئەم دەقە. جا دەربارەی یەکەم دەڵێ:

(کە دیتن دراوەتە پاڵ ڕو، وەك لەم ئایەتە هاتوە، بەئامرازی (الی)ش، بەراشکاوی بۆ دیتنی چاو تێپەڕیوە، هەمو ئایەتە پیرۆزەکەش بەڵگەیەکی تێدا نیە پێچەوانە بسەلمێنێ، کەواتە حەقیقەتێکی راشکاوە کە خودا مەبەستی لەو ئایەتە تەماشاکردنی ئەو چاوەیە کە لەڕودایە بۆ پەروەردگاری بەرز.

وشەی (نظر) لەعارەبیدا چەند بەکارهێنانێکی هەیە، بەپێی پەیوەندیو تێپەڕی و تێنەپەڕی دەگۆڕێ، جا ئەگەر بەخۆی تێپەڕبو، مانای چاوەڕوانی دەگەیەنێ:

﴿انْظُرُونَا نَقْتَبِسْ مِـنْ نُورِكُـمْ: بۆ ئێمە بڕوانن تا لەنوری ئێوە روناکیمان پێ بگات﴾ الحديد:١٣.

ئەگەر بە (في) تێپەڕبو، مانای تێفکرین وپەندوەرگرتن دەگەیەنێ وەك دەفەرمێ:

﴿أَوَلَمْ يَنظُرُوا فِي مَلَكُوتِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ: ئایا لەدەسەلاّتی ئاسمان وزەوی هەرشتێکی خوا بەدیهێناوە ناڕوانن﴾ الاعراف:١٨٥.

ئەگەر بە (الی) تێپەڕی مانای چاودان و هەڵسەنگاندن دەگەیەنێ وەك دەفەرمێ:

﴿انظُرُوا إِلَى ثَمَرِهِ إِذَا أَثْمَرَ: كاتێ كە میوەو بەروبومەكان دەگەن تێیان بڕوانن﴾الانعام:٩٩.

ئەدی ئەگەر درایە پاڵ ڕو كە شوێنی بینینە؟

بۆ دوەمیش گەلێك دەقی لەپێشینان هاوردوە كە تێگەشتنیان لە ئایەتەكە رون دەكاتەوە، لەحەسەنەوە هاتوە دەڵێ: تەماشای پەروەردگاری كردو بەنورەكەی گەشاوە.

ئەبو صالح لەئیبنی عەبباسەوە دەڵێ: ﴿إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾القیامة:٢٣. واتە: تەماشای روی پەروەردگاری بەرزی دەكا.

عیكریمە دەڵێ: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاضِرَةٌ﴾القیامة:٢٢. واتە: لەنێو نازو نعمەت گەشاوەن، ﴿إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾القیامة:٢٣. واتە: بەچاو دەڕواننە پەروەردگاریان، پاشان وەك ئەوەی لەئیبنی عەبباس گێڕاوەتەوە، ئەمە بێژەی ڕاڤەكارانی فەرمودەناسە، خودای بەرزیش دەفەرمێ: ﴿لَهُمْ مَا يَشَاءُونَ فِيهَا وَلَدَيْنَا مَزِيدٌ: چیان دەوێ لەبەهەشت هەیەو زێتریشمان لەلایە﴾ ق:٣٥.

طەبەری دەڵێ: عەلی كوڕی ئەبو طالیب و ئەنەسی كوڕی مالیك دەڵێن: ئەو زێترە تەماشاكردنی روی خودای پەروەدگارە.

پاشان باسی مانای (زیادة)ی كردوە لەئایەتی: ﴿لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَى وَزِيَادَةٌ: ئەو كەسانەی كاری چاكیان ئەنجام داوە، پاداشی چاك و زیادەیان بۆ هەیە﴾یونس:٢٦.

وەبەوەی لێكداوەتەوە كە بریتیە لەروانین بۆ ڕوی پڕشكۆی خوا، ئەو فەرمودەشی هێناوەتەوە كەموسلیم لەصەحیحەكەیدا لەصوهەیب دەیگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەرﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَى وَزِيَادَةٌ﴾یونس:٢٦، ئەوجا فەرموی:

((إذا دخل أهل الجنة الجنة وأهل النار النار نادى مناد: يا أهل الجنة! إن لكم عند الله موعداً يريد أن ينجزكموه، فيقولون: وما هو؟ ألم يُثقل موازيننا ويُبيِّض وجوهنا ويُدخلنا الجنة ويُجرنا من النار؟ فيكشف الحجاب فينظرون إليه، فما أعطاهم شيئاً أحب إليهم من النظر إليه، وهي الزيادة: كە بەهەشتی چونە بەهەشت و، دۆزەخی چونە دۆزەخ، بانگوێژێك بانگ دەكا: هۆ

خەڵکی بەهەشت بەڵێن و ژوانێکتان لای خودا هەیە بۆتانی جێبەجێ دەکا، دەڵێن: ئەمە چییە؟ ئەدی پێوانەی گران نەکردین و روی سپی نەکردین و بەهەشتی پێ نەبەخشین و لەدۆزەخ رزگاری نەکردین!!؟ ئەوجا حیجاب لادەدرێ‌و، تەماشای خودا دەکەن، جا هیچ شتێکی پێ نەبەخشیون هێندی تەماشاکردنی لەلایان خۆشەویست بێ، ئەمەش زیادەکەیە)).

بێجگە لەوەش بە سەندو بێژەی جیاجیا ئەم فەرموده دەگێڕنەوە. واتای وایە کە زیادە بریتیە لە روانین بۆ ڕوی خودای بەرز. هاوەڵانیش هەربەم شێوە راڤەی دەکەن، ئیبنی جەریر لەکۆمەڵانێك ئەمە دەگێڕتەوە، لەوانە: ئەبوبەکری صیدیق(رەزای خوای لێبێ) و، حوذەیفەو، ئەبو موسای ئەشعەری‌و، ئیبنی عەبباس، (رەزای خوایان لێبێ).

ئەو ئایەتەش بەڵگەیەکی دیکەی ئەو مەسەلەیە کە دەفەرمێ:

﴿كَلاَّ إِنَّهُمْ عَنْ رَبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَمَحْجُوبُونَ: نەخێر، ئەوانە لەڕۆژی قیامەت لەدیتنی خوا بێ بەشن﴾ المطففين:١٥.

دانەر دەڵێ: کە شافعی(بەر میهری خوا بێ) وپێشەوای دی، ئەم ئایەتەیان کردۆتە بەڵگەی خودا دیتنی بەهەشتییان، طەبەری وهی دیکەش ئەمە لە موزنی و لەشافیعی دەگێڕنەوە، حاکیم دەڵی: ئەصەم بۆمان دەگێڕتەوە، رەبیعی کوڕی سلێمان دەگێڕتەوە دەڵێ: لەلای موحەممەدی کوڕی ئیدریسی شافیعی بوم، نامەیەکی لەصەعیدەوە بۆ هات تیای هاتبو، لەبارەی ئایەتی: ﴿كَلاَّ إِنَّهُمْ عَنْ رَبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَمَحْجُوبُونَ﴾المطففين:١٥. چی دەڵێی؟ شافیعی گوتی: لەبەر ئەوەی ئەوانە لەتوڕەیی خوا حیجابیان لێ داخراوە، ئەمە دەبێتە بەڵگەی ئەوەی دۆستانی خوا لە رەزامەندی دەیبینن.

پاشان باسی بەڵگە هێنانەوەی موعتەزیلانی کردوە بەئایەتی ﴿لَنْ تَرَانِي: نامبینی﴾الاعراف:١٤٣. و بەئایەتی ﴿لاَ تُدْرِكُهُ الأَبْصَارُ: بینایییەکان پەی پێ نابەن﴾ الانعام:١٠٣، ئەوەشی رونکردۆتەوە کە ئەم دو ئایەتە بەڵگەن لەدژی رای ئەوان، چونکە ئایەتی یەکەم لەچەند روێکەوە دیتن دەسەلمێنێ:

یەکەم: هەرگیز گومان نابردرێ کە پێغەمبەری رێزدارو دواو لەگەڵ خواو زاناترین

خەلکی سەردەمی خۆی بەپەروەردگاری لەشتێکی نادروست بپرسێ، بەڵکو لەلای وان تەنیا نادروست نیەو، گەورەترین مەحاڵە.

دوەم: خودا پرسیارەکەی بەخراپ دانەنا، کەچی کاتێك نوح داوای رزگاربونی کوڕەکەی لەپەروەردگاری کرد، سەرکۆنەی کردو فەرموی:

﴿إِنِّي أَعِظُكَ أَنْ تَكُونَ مِنْ الْجَاهِلِينَ: من ئامۆژگاریت دەکەم کە لەنەزانان نەبی﴾هود:٤٦.

سێیەم: خوای بەرز فەرموی ﴿لَنْ تَرَانِي: تۆ نامبینی﴾ و نەیفەرموی: من نادیتریم یا بینینم دروست نیە، یا بینراو نیم، جیاوازی نێوان ئەو دو وەرامەش ئاشکرایە، ئەگەر یەکێك بەردێکی لەگیرفانیدا بو، پیاوێك هاتو وایزانی خواردنە، ئایا دروستە پێی بڵێ: ئەتۆ نایخۆی. ئەمەش بەڵگەیە کە خودای پاك بینراوە، بەڵام توانستەکانی موسا لەم دنیایە بەرگەی دیتنی ناگرن، چونکە مرۆڤ لەدنیا لەوە بێهێزترە خوا ببینێ.

چوارەم: ئەم ئایەتە روی سێیەمیش رون دەکاتەوە کە دەفەرمێ:

﴿وَلَكِنْ انظُرْ إِلَى الْجَبَلِ فَإِنْ اسْتَقَرَّ مَكَانَهُ فَسَوْفَ تَرَانِـي: بەڵام بڕوانە ئەو کێوە، ئەگەر لەجێی خۆی ما من دەبینی﴾الاعراف:١٤٣.

ئەوەی بەموسا راگەیاند کە ئەو کێوە لەگەڵ هێزو پتەویەکەی لەم دنیایە بەرگەی تەجەللی ناگرێ، چ جای ئەو مرۆیەی بەلاوازی بەدیهێنراوە؟

پێنجەم: خودای پاك و بەرز توانای هەیە کێوەکە راگیرکا، ئەمەش شتێکی مومکینە، دیتنیشی بەمە هەڵواسیوەو پەیوەستی کردوە، خۆ ئەگەر مەحاڵ بوایە، وەك ئەوەی لێدەهات بیفەرمویا: ئەگەر ئەو کێوە لەجێی خۆی راگیر بو دەخۆم و دەخۆمەوەو دەنوم، بەڵام هەمو لەلای وان هەر یەکە.

شەشەم: خودای بەرز دەفەرمێ:

﴿فَلَمَّا تَجَلَّى رَبُّهُ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُ دَكًّا جا کاتێ پەروەردگاری بۆ کێوەکە دەرکەوت، لەگەڵ زەوی تەختی کرد﴾الاعراف:١٤٣.

جا ئەگەر دروست بێ خۆی پیشانی کێوەکە بدات، کە بێگیانێکە و نەپاداشتی هەیە نە سزا، چۆن لەخانەی ریزو شکۆیدا خۆی بە پێغەمبەران و دۆستانی نیشان

نادا؟ بەلاّم خودا بەموسای راگەیاند، ئەگەر لەدنیا کێوێك خۆ ڕانەگرێ، ئەوا مرۆڤ لاوازترە کە خۆی بگرێ.

هەفتەم: خودا دەگەل موسا ئاخاوت و، بانگی کردو موناجاتی لەگەڵ کرد، ئەوی بۆی دروست بێ قسان لەگەڵ خوا بکا و خواش لەگەڵی بدوێو بەبێ نێوەند فەرمایشتەکانی ببیستێ، دیتنی بۆ دروست و شیاوترە، بۆیە تەنیا بەنکوڵی کردن لەئاخاوتنی، نکوڵی دیتنی دەکرێ.

ئەو دوانەشیان پێکڕا کۆکردۆتەوە، پاشان وەرامی بانگەوازەکەی داونەتەوە. کە ئامرازی (لن) سودی داهاتو دەگەیەنێ و بەڵگەی خودی دیتنە لە ڕۆژی دوایی، هەروەها شیخ ئەوەی ڕونکردۆتەوە، ئەگەر وابەستەی تاهەتاییش بوایە بەڵگە نەبو بۆ بەردەوامی نەدیتن لەقیامەتیشدا، چ جای ئەوەی گەر رەهابێ؟ ئەمەش هاوشێوەی هەیە لەقورئانی پیرۆزدا، وەك دەفەرمێ:

﴿وَلَنْ يَتَمَنَّوْهُ أَبَدًا: هەرگیز ئارەزوی مردن ناکەن.﴾البقرة:٩٥.

لەگەڵ ئەو ئایەتەی دەفەرمێ: ﴿وَنَادَوْا يَامَالِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّـــكَ: هاواردەکەن؛ ئەی مالیك با پەروەردگارت بمانکوژێ﴾الزخرف:٧٧.

چونکە گەر بەشێوەیەکی رەها بۆ تاهەتایی وەکار هاتبا نەدەبو کارەکەی دوایی سنوردار بکرێ، بەلاّم ئەوان خۆزگەی مردن دەخوازن، خودا دەفەرمێ:

﴿فَلَنْ أَبْرَحَ الأَرْض حَتَّى يَأْذَنَ لِي أَبِـــي: جا من لەم سەر زەویە ناڕۆم تا باوکم ئیجازەم دەدا﴾یوسف:٨٠.

جا بەم شێوەیە لێرەدا دەسەلمێ کە (لن) نەرێی تاهەتایی ناگەیەنێ.

شێخ جەمالودینی کوڕی مالیك (بەرمیهری خوا بێت) دەڵێ:

ومن رأى النفي بلن مؤبدا فقوله اردد وسواه فاعضدا

واتە: هەر کەسێکی رای وابو نەرێ کردن بەئامرازی (لن) تاهەتایە، تۆ قسەکەی وی رەت کەوەو پشتی بێجگە لەوی بگرە.

هەرچی ئایەتی دوەمیشە: لەروێکی زۆر ناسك وجوانەوە بەڵگەی دیتن بەدەست

دەدا کە بریتیە لەوەی خودای بەرز لەمیانەی پێداهەڵگۆتنی هاوردویە، ئاشکرایە پێدا هەڵگۆتنیش بەسیفەتە چەسپاوەکان دەبێ. بەڵام نەبونی ڕەها تەواوێتیەك نیە تا مەتحی پێ بکرێ، بەڵکو پەروەردگاری بەرز بەنەرێ پێی هەڵدەگوترێ ئەگەر مەسەلەیەکی هەبونی لەخۆ گرت؛ وەکو پێهەڵگۆتنی خودا بەنەرێکردنی بوژان و نوستن، کە تەواوێتی قەییومیەت لەخۆدەگرێ، لەمردنیش کە ژیان لەخۆدەگرێو. نەرێی شەکەتی و ماندیبون کە بونی توانایەکی تەواو لەخۆ دەگرێو، نەرێکردنی هاوبەش و ژن و منداڵ و پاڵپشت، کەمانای تەواویتی صەمەدیەت و دەوڵەمەندی دەگەیەنێ، نەرێی ستەم، کە تەواوێتی دادگەری و زانست و دەوڵەمەندی لەخۆدەگرێو، نەرێی لەبیرچون و بزربونی شتێك لەزانستی وی، کە تەواویتی زانست و دەورەدان دەگەیەنێ، وەنەرێی هاوشێوە کە واتای تەواوێتی خود و سیفەتەکانی لەخۆدەگرێ، بۆیە بەنەبوێکی ڕەها پێی هەڵناگوترێ ئەگەر بارێکی چەسپاوی نەگرتە خۆ. چونکە نەبو هاوبەشی وەسفکراوە لەو نەبونەی، تەواویش بەشتێك وەسف ناکرێ کە بەخۆی و نەبوەکەی تێدا بەشداربن، کەواتە؛ خودا دەبینرێ و پەی پێ نابردرێو دەورە نادرێ، کە دەفەرمێ:

﴿لاَ تُدْرِكُهُ الأَبْصَارُ: بینایییەکان پەی پێ نابەن﴾الانعام:١٠٣.

بەڵگەی تەواوێتی نەرێتی خوا دەگەیەنێ، کە لەهەمو شتێك گەورەترەو لەمەڕ تەواوی مەزنێتیەکەی پەی پێ نابردرێ بەشێوەیەك دەوری بدا، چونکە پەی پێبردن بریتیە لە دەورەدانی شت و بڕێکی هەوراز دیتنە، هەروەك خوای بەرز دەفەرمێ:

﴿فَلَمَّا تَرَاءَى الْجَمْعَانِ قَالَ أَصْحَابُ مُوسَى إِنَّا لَمُدْرَكُونَ، قَالَ كَلاَّ: جا کە ئەو دو تاقمە یەکتریان دیت، یارانی موسا گوتیان: گیرمان خوارد، موسا گوتی: نەخێر وا نیە﴾الشعراء:٦١-٦٢.

لێرەدا موسا نەرێی لەدیتن نەکردوە، بەڵکو پەی پێبردنی نەری کردوە، دیتن و پەی پێ بردنیش هەروەك پێکرا دەبن و بەتەنێش هەر دەبن، جا خودای پەروەردگاری دەدیترێ، بەڵام پەی پێ نابردرێ، هەروەك دەزانرێ بەڵام بەزانست دەورنادرێ، ئەمەش فام و تێگەیشتنی هاوەڵان و پێشەوایانە بۆ ئایەتەکە، هەروەك لەراڤەکردنی

ئایەتەکەدا لێی دواون، تەنانەت هەر کەس لەم خۆرە بەدیهێنراوە بڕوانێ وەك چۆنە ئاوا پەی بەهەموی نابا.

پاشان شێخ دەڵێ: (ئەو فەرمودانەش موتەواتیر ن کە لە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی هاتون، بەڵگەن بۆ دیتن، خاوەنانی کتێبی صەحیحەکان و موسنەدو سونەنەکان دەیانگێڕنەوە، لەوانەش: فەرمودەکەی ئەبو هورەیرە (خەڵکانێك گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا لەڕۆژی قیامەت پەروەردگارمان دەبینین؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((هل تضارون في رؤية القمر ليلة البدر؟: ئایا لەدیتنی مانگ لەشەوی چاردەدا چ شتێك بەریتان لێدەگری؟)) گوتیان: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا.

فەرموی: ((هل تضارُون في الشمس ليس دونها سحاب: ئایا لەدیتنی خۆر کە چ هەوری لەبەر نەبن چ شتێك پێشتان دەگرێ؟)) گوتیان: نەخێر.

فەرموی: ((فانكم ترونه كذلك: بەو شێوەش پەروەردگارتان دەبینن)).

فەرمودەکەی ئەبو سەعیدی خودریش لەهەردو صەحیحاندا، هاوکوفی ئەمەیە، جەریری کوڕی عەبدوڵلای بەجلی دەڵێ: (لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دانیشتبوین سەیری مانگی چاردەی کردو و فەرموی:

((إنكن سترون ربكم عيانا، كما ترون هذا، لا تضامون في رؤيته: پەروەردگارتان بەچاوانتان دەبینن، هەروەکو ئەو مانگە دەبینن، چ شتێك ڕێتان لێناگرێ)).

فەرمودە پێشوەکەی (صوهەیب)یش موسلیم و هی دیکە دەیگێڕنەوە.

فەرمودەکەی ئەبو موساش لەپێغەمبەرﷺ:

((وجنتان من فضة آنيتهما وما فيهما وجنتان من ذهب آنيتهما وما فيهما، وما بين القوم وبين أن يروا ربهم تبارك وتعالى إلا رداء الكبرياء على وجهه في جنة عدن: کە دوباخیش لەزیو، دەفرەکانیان و ئەو شتانەی تیایاندایە، دو باخیش لەزێڕ، دەفرەکانیان و ئەو شتانەی تێیاندایە، لەنێوان دیتنی خەڵکەکەو پەروەردگاریان تەنیا پۆشاکی مەزنێتی لەسەر ڕوی هەیە، لەبەهەشتی نەمراندا)).

لەفەرمودەکەی عەدی کوڕی حاتەمیش:

((ولَيَلقِيَنَّ الله احدكُم يوم يلقاه، وليس بينه وبينه حجاب ولا ترجمان يترجم لــــه، فيقـــول: الم أبعث اليك رسولا فيبلغك؟ فيقول: بلى يارب، فيقول: الم اعطك مالا وأفضل عليك؟ فيقول: بلـى يارب: **هەریەك لەئێوە ڕۆژێكی دەگاتە خواو، چ پەردەو پاچڤانیان لەنێواندا نیە، جا دەفەرمێ: ئەدی پێغەمبەرێكم بۆ نەناردی پێت ڕاگەیەنێ؟ دەڵێ: بەڵێ پەروەردگارم. دەفەرمێ: ئەدی ماڵم پێ نەبەخشیو چاكەم بۆ نەكردی؟ دەڵێ: بەڵێ ئەی پەروەردگارم))**[1].

[1] أخرجه البخاري في صحيحه: بگەڕێوە بۆ (شرح الطحاوية): ص٢٠٤-٢١٠

## جێباسی سێزدەم

### بردنەوەی نازونیعمەتی بەهەشت، وازهێنان لەخۆشی دنیا ناخوازێ

ڕەبەنان و گەلەك عابیدانی ئەم ئوممەتە، وا گومانیان بردوە كە نازونیعمەتی قیامەت وەدەست نایێ هەتا بەندە هەمو خۆشی و چێژی دنیا ڕەت نەكاتەوە.

بۆیە دەبینی ئەوانە جەستەی خۆیان ئازار دەدەن و، باری نەفسیان گران دەكەن و خۆ دوچاری زۆر ناخۆشی و ئەستەم دەكەن، جا بەردەوام بەرۆژون و هەمو شەوێ هەڵدەستن و نوێژی دەكەن، ڕەنگە وابێ هەندێكیشیان خواردن و خواردنەوەو پۆشاكی خۆش و باش لەخۆ حەرام كەن. یاخود واز لەئیش كردن و ژنهێنان بێنن، ئەم بیرۆكەیەش هەڵەیە، چونكە خودا شتی باشی بۆ بڕواداران بەدیهێناوە، تانەی لەو كەسانەش داوە كە ئەو خۆشی و ڕازاوەییە حەرام دەكەن، كە خودا بۆ بەندەكانی خۆی دەرهێناوە:

﴿قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللَّهِ الَّتِي أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالطَّيِّبَاتِ مِنْ الرِّزْقِ قُلْ هِيَ لِلَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ: بڵێ: چ كەسێك زینەتی خوا كە بۆ بەندانی دەرخستوە، هەروا ڕسق و ڕۆزی پاكی حەرام كردوە، بڵێ: ئەمانە لەژیانی دنیادا بۆ ئەوان كەسانە كە بڕوایان پێ هێناوە، بەڵام لەقیامەت تایبەتی بڕوادارانە﴾ الاعراف:٣٢.

كاتێك دنیا خراپ دادەنرێ، كە مرۆڤ لەڕۆژی دوایی بخافڵێنێ. بەڵام ئەگەر بەندە بۆ خۆی كردیە پردۆلكەو دەروازەی وەدەستخستنی دوایین، مەسەلەكە بەو جۆرە نابێ كە هەندێك خەڵك تێی گەیشتون.

## جیباسی چواردەم

## دوا پاڕانەوەیان

بڕواداران بەهەڵوێستێکی مەزن و زۆر ناڕەحەتی و پەرژەنگگەلێکی زۆر گەورە تێدەپەڕن، پاشان بەسەر صیراطدا رەت دەبن، گەلێك ترس و پەرژەنگی دیکە دەبینن، ئینجا خودا دەیانباتە نێو ناوی بەهەشتی بەرفرە، پاش ئەوەی لەناخۆشی و دڵتەنگی دایاندەماڵێ، ئەوجا لەوێ ئەو خێرو خۆشیە مەزنانە بەدی دەکەن کە خودا بۆی ئامادە کردون، جا زمانیان بەپاکیو پیرۆزگرتنی پەروەردگاریان دەگەڕێ کە لەناخۆشی دەریهێنان و، بەڵێنە راستەکەی لەگەڵیان وەجێ گەیاندو، بەهەشتی پێ بەخشین:

﴿وَقَالُوا الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَذْهَبَ عَنَّا الْحَزَنَ إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٌ شَكُورٌ، الَّذِي أَحَلَّنَا دَارَ الْمُقَامَةِ مِنْ فَضْلِهِ لاَ يَمَسُّنَا فِيهَا نَصَبٌ وَلاَ يَمَسُّنَا فِيهَا لُغُوبٌ: دەڵێن؛ ستایش بۆ ئەو خودایەی کە خەفەت و پەژارەی لەسەر لابردین، بەراستی پەروەردگارمان لێبوردەو وەرگری سوپاسانە، خوایەك کە بەگەورەیی خۆی ئێمەی لەم خانەباشەدا جێکردەوە، کەلەوێ نە ڕەنج ونەماندی بونمان توش نابێ﴾فاطر:٣٤-٣٥.

﴿وَقَالُوا الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي صَدَقَنَا وَعْدَهُ وَأَوْرَثَنَا الأَرْضَ نَتَبَوَّأُ مِنْ الْجَنَّةِ حَيْثُ نَشَاءُ فَنِعْمَ أَجْرُ الْعَامِلِينَ: دەڵێن؛ سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە هەر بەڵێنێکی بەئێمەی دا راست بو، ئەو زەویەی بەمیرات بەئێمە بەخشیو ئێستا لەهەر شوێنێکی بەهەشت بمانەوێ جێ دەگرین، جا پاداشتی کارگەران چەند باشە﴾ الزمر:٧٤.

دوا داواو پاڕانەوەشیان لەبەهەشتدا؛ ستایشە بۆ خودای پەروەردگاری جیهانیان:

﴿دَعْوَاهُمْ فِيهَا سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَتَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلاَمٌ وَآخِرُ دَعْوَاهُمْ أَنْ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ: پاڕانەوەیان لەبەهەشتدا ئەمەیە کە ئەی خودایە تۆ پاك و بێخەوشی، وەدرودی ئەوان سڵاوە، دوا قسەشیان ئەمەیە: ستایش تایبەت بە پەروەردگاری جیهانیانە﴾یونس:١٠.

## بەندی هەفتەم

## بەربەرەکانێی بەهەشت و دۆزەخ

پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێداوین کە بەهەشت و دۆزەخ بەربەرەکانێیان بردە لای پەروەردگاریان، لەئەبو هورەیرە(رەزای خوای لێبێ) هاتوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموی:

((تحاجت الجنة والنار، فقالت النار: أوثرت بالمتكبرين والمتجبرين، وقالت الجنة: فما لي لا يدخلني إلا ضعفاء الناس وسقطهم؟ فقال الله ﷻ للجنة: أنت رحمتي أرحم بك من أشاء من عبادي، وقال للنار: إنما أنت عذابي أعذب بك من أشاء من عبادي، ولكل واحدة منهما ملؤها، فأما النار فلا تمتلئ حتى يضع الله تبارك وتعالى رجله تقول: قط قط قط، فهنالك تمتلئ ويزوي بعضها إلى بعض ولا يظلم الله من خلقه أحدا، وأما الجنة فإن الله ينشئ لها خلقا: بەهەشت و دۆزەخ بیانویان لێکدی گرت، دۆزەخ گوتی: من بەزلفیزو ستەمکاران تایبەت کراوم، بەهەشتیش گوتی: ئەدی بۆ هەر خەڵکی لاوازو بێدەسەڵاتم دێنە ناو؟ خودای بەرز بەبەهەشتی فەرمو: تۆ بەزەیی منی و بە هۆی تۆ بەزەییم بەو بەندانەم دەبەخشم کە ویستم لێیە. بەدۆزەخیشی فەرمو: تۆش ئەشکەنجەی منی، هەر یەکێکم لەبەندانی خۆم بوێ بە تۆی ئازار دەدەم، بۆ هەریەکێکیان پڕاوپڕ بەشیان هەیە، هەرچی دۆزەخە، پڕنابێ هەتا خوای پەروەردگاری پاك و بەرز پێی خۆی لەناو دادەنێ، ئەوجا دۆزەخ دەڵێ: بەسمە، بەسمە، بەسمە. ئەوجا پڕ دەبێو دەچێتەوە بارینەك، خوداش ستەم لەهیچ یەکێك لەبەندەکانی ناکا، هەرچی بەهەشتیشە، خودا بەدیهێنراوانێکی بۆ بەدیدەهێنێ))[1].

لای بوخاریش وا هاتوە: ((اختصمت الجنة والنار (إلى ربهما) فقالت الجنة: يا رب ما لها لا يدخلها إلا ضعفاء الناس وسقطهم؟ وقالت النار،[2] فقال (الله) للجنة: أنت رحمتي. وقال للنار: أنت

---

[1] اخرجه البخاري ومسلم.

[2] قال محقق جامع الأصول: كذا في الأصول المخطوطة. وفي النسخ المطبوعة: يعني: أوثرت بالمتكبرين، قال الحافظ في (الفتح): كذا وقع هنا مختصرا، قال ابن بطال: سقط قول النار هنا من جميع النسخ، وهو محفوظ في الحديث وانظر (الفتح) (١٣/ ٤٣٤).

عذابي أصيب بك من أشاء، ولكل واحدة منهما ملؤها، فأما الجنة فإن الله لا يظلم من خلقه أحداً، وإنه ينشئ للنار من يشاء فيلقون فيها فتقول: هل من مزيد؟ ويلقون فيها فتقول: هل من مزيد؟ حتى يضع قدمه فيها فتمتلئ ويزوى بعضها إلى بعض فتقول قط قط قط: **بەهەشت و دۆزەخ بەربەرەکانیان بردە حوزوری خوای بەرز، بەهەشت گوتی: پەروەردگارم بۆچی من هەر مرۆڤی لاواز و بێدەسەلات و هەژارم دەچێتە ناو؟ دۆزەخیش قسەی خۆی کرد، جا خودا بەبەهەشتی فەرمو: تۆ میهرو بەزەیی منی، بەدۆزەخیشی فەرمو: تۆ ئەشکەنجەی منی کێم بوێ پێی ئازار دەدەم پڕاوپڕی هەریەکەشتان هەیە، هەرچی بەهەشتە، ئەوا خودا هەرگیز ستەم لەیەکێك لە بەدیهێنراوانی خۆی ناکا، ئەوەی ویستیشی لێبێ بۆ دۆزەخ بەدیدەهێنێ[1] وتێی دەهاوێژرێن، هەر دەڵێ: چی دیکەش هەیە؟ هەر تێی داوێژرێن و هەر دەڵێ: ئەرێ هێشتا هەیە؟ هەتا خودا پێی خۆی دەنێتە ناوی ئەوجا پڕدەبێ و دەچێتەوە باریەك و دەڵێ: بەسمە، بەسمە، بەسمە)).**

**هەر لە لای بوخاریش هاتوە[2]:** ((يقال لجهنم: هل أمتلأت؟ وتقول: هل من مزيد؟ فيضع الرب قدمه عليها، فتقول: قط قط: **بەدۆزەخ دەگوترێ: ئەرێ پڕ بوی؟ دەڵێ: هێشتا چیدی هەیە؟ جا پەروەردگار پێی خۆی تێدا دادەنێ، ئەوجا دەڵێ: بەسمە بەسمە)).**

**لای موسلیمیش وەکو ئەوەی یەکەم هەیە، بەڵام لەوێ دەوەستێ کە دەفەرمێ** ((ولكل واحدة منهما ملؤها: **بۆ هەر یەکەیان پڕاوپڕ هەیە)).**

**لەگێڕانەوەیەکی دیکەشدا دەفەرمێ:** ((فما لي لا يدخلني إلا ضعفاء الناس وسقطهم وغرثهم؟: **ئەی بۆچی هەر خەڵکانی لاوازو بەکەم گیراو ساویلکەم دێنە نێو؟)) کوتاییەکەشی بەم شێوەیە:** ((فأما النار، فلا تمتليء حتى يضع قدمه عليها، فهنالك تمتليء، ويزوي بعضها الى بعض: **هەرچی دۆزەخە، پڕنابێ هەتا پەروەردگار پێی خۆی لەسەر دادەنێ، ئەوجا پڕدەبێو، دەچێتەوە سەریەك))[3].**

---

[1] زیاتر لەیەکێك لەزانایان دەڵێن ئەمە هەڵەیەکی هەندێك بگێڕەوانە، ڕاستەکەشی وایە کە بۆ بەهەشتیان بەدیدەهێنێ.
[2] كان كثيرا ما يقفه ابوسفيان الحميري، احد رواته.
[3] رواه البخاري (٨/٤٥٨) في تفسير سورة (ق)، باب قوله تعالى: (وتقول هل من مزيد)، وفي التوحيد، باب ما جاء في قول الله تعالى: (ان رحمة الله قريب من المحسنين)، ومسلم رقم ٢٨٤٦ في الجنة، باب النار ويدخلها الجبارون والجنة يدخلها الضعفاء، والترمذي رقم ٢٥٦٤ في صفة الجنة، باب ما جاء في احتجاج الجنة والنار.

## سەرچاوەكان

### بەپێی پیتان ریزكراون

١- التخويف من النار والتعريف بدار أهل البوار، للحافظ ابي الفرج ابن الجوزي. المكتبة العلمية. بيروت.

٢- التذكرة في احوال الموتى وأمور الآخرة للقرطبي. طبعة المكتبة السلفية. المدينة المنورة.

٣- الترغيب والترهيب للمنذري. طبعة المكتبة التجارية. القاهرة. الأولى.

٤- تفسير ابن كثير. طبعة دار الأندلس بيروت- الطبعة الأولى. ١٣٨٥-١٩٦٦.

٥- تفسير ابن جرير الطبري. الطبعة الثانية ١٩٧٣-١٩٥٤. طبعة مصطفى البابي الحلبي.

٦- تقريب التهذيب، لأبن حجر العسقلاني. طبعة المكتبة العلمية. المدينة المنورة.

٧- جامع الأصول في أحاديث الرسول، لأبن الأثير. تحقيق عبدالقادر الأرناؤوط. نشر مكتبة الحلواني ومكتبة الملاح. الطبعة الأولى ١٩٣٢-١٩٧٢.

٨- رفع الأستار لإبطال أدلة القائلين بفناء النار. للصنعاني. تحقيق الشيخ ناصرالدين الألباني. طبع المكتب الإسلامي. بيروت.

٩- سنن ابن ماجة. طبعة دار احياء الكتب العربية. القاهرة ١٣٧٢-١٩٥٢.

١٠- سلسلة الأحاديث الصحيحة للشيخ ناصرالدين الألباني، نشر المكتب الإسلامي. بيروت. الطبعة الأولى.

١١- شرح العقيدة الطحاوية، لمحمد بن محمد بن ابي العز الحنفي. نشر المكتب الإسلامي. بيروت. الطبعة الرابعة. ١٣٩١هـ.

١٢- شرح النووي على مسلم للنووي. طبعة المكتبة العصرية. القاهرة.

١٣- صحيح البخاري. اعتمدنا على متن فتح الباري. طبعة السلفية. القاهرة. الطبعة الأولى.

١٤-صحيح الجامع الصغير. للسيوطي. تحقيق محمد ناصرالدين الألباني. نشر المكتب الإسلامي. بيروت. الطبعة الأولى. ١٣٨٨-١٩٦٩.

١٥-صحيح مسلم. تحقيق محمد فؤاد عبدالباقي. طبعة دار إحياء الكتب العربية. بيروت. الطبعة الثانية. ١٩٧٢.

١٦- فتح الباري. لابن حجر العسقلاني. طبعة المكتبة السلفية. القاهرة. الطبعة الأولى.

١٧- لوامع الأنوار البهية للسفاريتي. طبعة دولة قطر. الطبعة الأولى.

١٨- مجموع فتاوي شيخ الإسلام ابن تيمية. جمع ابن قاسم. طبعة دولة المملكة العربية السعودية. الطبعة الأولى.

١٩-مراتب الأجماع لأبن حزم. طبعة المكتبة العلمية بيروت.

٢٠- مشكاة المصابيح للخطيب التبريزي. طبعة المكتب الإسلامي. دمشق. الطبعة الأولى١٣٨١-١٩٦١.

٢١-نهاية البداية والنهاية لابن كثير. نشر مكتبة النهضة الحديثة. الرياض. الطبعة الأولى ١٩٦٨.

٢٢-يقظة أولي الأعتبار مما ورد في ذكر الجنة والنار. لصديق حسن خان. طبعة دار الأنصار. القاهرة. الطبعة الأولى. ١٣٩٨هـ-١٩٧١م.

٢٣- اليوم الآخر في ظلال القرآن. جمع وإعداد احمد فائز. طبعة مؤسسة الرسالة. دمشق. الطبعة السابعة. ١٤٠٥-١٩٨٤.

# رشتەی بابەتان

## دەروازەی دوەم

